# ڕشتە مرواری





کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەدین سەجادی

٢

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە ئەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلائەددین سەججادی. |
| مشخصات نشر | : | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری | | ۸ ج.؛ ۲۱/۵x۱۴/۵ سم. |
| شابک | | دوره : ۸-۴۱۱-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸ / ج۱ : ۵-۴۱۲-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸<br>ج۲ : ۲-۴۱۳-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸ / ج۳ : ۹-۴۱۴-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸<br>ج۴ : ٦-۴۱۵-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸ / ج۵ : ۳-۴۱٦-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸<br>ج٦ : ۰-۴۱۷-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸ / ج۷ : ۷-۴۱۸-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸<br>ج۸ : ۴-۴۱۹-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م. |
| موضوع | : | ۲۰th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq |
| موضوع | : | داستان‌های طنزآمیز کردی |
| موضوع | : | Humorous stories, Kurdish* |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۹/۲۸۲۶۲ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۴۲۸۵۳۱ |
| وضعیت رکورد | : | فیپا |

# ڕشتەی مرواری

-٢-

کۆمەڵە ئەدەبیێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی

دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**



انتشارات کردستان

سنه

# ڕشتەی مرواری

## -٢-


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق پۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠ - ٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٢١٦ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دورە: ٨ - ٤١١ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ - شابک جلد (٢): ٢ - ٤١٣ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ |





سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزق، انتشارات کُردستان، تلفن: ٠٨٧ ٣٣١٦٥٣٨٢

سنە، پاساژی عیززەتی، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٠٠٩٨ ٨٧ ٣٣١٦٥٣٨٢

# ناواخن

کورد بە کوردی خوێندی
ئیتر خۆی بۆ خۆی ئەبێ

# بەرگی دووهەم



انتشارات کردستان
سنه

# سەرەتا

هەر لە سەرەتای ئەم ساڵەدا بەرگی یەکەمی «ڕشتەی مرواری» لە ژێر چاپ دەرچوو و بڵاو بووەوە. بڵاو بووەوە و کەوتە دەست ئەو خوێندەوار و ماڵانە کە ڕەنگبێ تا ئێستە کەم کتێبی کوردی بەو جۆرە لە بەردەستی خوێندەوار و خێزانی ماڵا پەڕە پەڕە کرابێتەوە بۆ خوێندنەوە. هەر ئەم باوەش‌گرتنەوەی ئەوان بوو کە بوو بەهۆی هانەهاندانی من بۆ ئەوە بە زووتر[ین] وەخت بەرگی دووهەمیش لە ژێر چاپ بێتە دەرەوە.

من ئەو هەستەی ئەوانم لە بیر ناچێ؛ ئەوەم لە بیر ناچێ کە قەومی خۆشەویستی کورد هەستی بەوە کرد کە خوێندنەوەی زمانەکەی و نووسین بە زمانەکەی خۆی دەروازەیەکی هەرە گەورەی بەختیاری بۆ ئەخاتە سەر گازی پشت.

لەگەڵ ئەمەشا نامەوێ سەرەتای بەرگەکەی‌تر لێرەدا بخەمە بەرچاو؛ چونکە لەوێدا هەیە، بەڵام ئەمەوێ یەك دوو شتی‌تر هەیە ئەوە بخەمە بیر:

یەکەم، وەکوو ئەیزانین ئەدەبی بەرزی کورد تا ئەم دەورەی دواییە بە زمانی کوردی کەم جار خۆی بەسەر قاقەزەوە دیوە، وە ئەوەش ئەزانین کە هیچ قەومێك بێ‌ئەدەب نەبووە و نییە. کە ئەو قەومە هەبوو ئەدەبیشی هەبووە. ئەدەب ساقەتەی دارێکە و لق و پۆپەکەی بەسەر قەومەکانی

عالەمدا بڵاو بووەتەوە. لە هەر لقێکەوە هەر گوڵێکی لێ ببێتەوە، ئەو گوڵە ئەچێتەوە سەر قەفی دارەکە. لە هەر لقێکەوە هەر گوڵێك بۆنێك بدا ئەو بۆنە نزیکی هەیە لەگەڵ بۆنی گوڵی لەقەکەیترا. ئینجا هەندێ لەم لقانە وا ڕێئەکەوێ کە زیاتر خزمەت ئەکرێن، گوڵەکانیان گەشتر ئەبن. هەندێکیشیان دەستی خزمەتیان ناگاتێ، هەر لەگەڵ تەبیعەتا ئەڕۆن و گەشە و بووژاندنەوەیەکی وایان لێ دەرناکەوێ. ئەمە جارێ ئەوەی بە ئێمە پیشان دا کە بنەچەی ئەدەب شتێکی عالەمییە و ڕەگەکەی تایبەتی نییە بە هەندێ قەومەوە و هەندێکی لێ بێبەش بێ.

تا ئەم دەورانە، ـ وە بگرە ئێستە زیاتریش ـ قەومی کورد دراوسێتی و تێکەڵاوی لەگەڵ قەومی عەرب و فارسدا بووە. لەگەڵ عەرەبدا بەهۆی دینەوە، لەگەڵ فارسدا بەهۆی حوکم و بەهۆی خۆشی زمانی فارسییەوە. کە ئەم زمانەش لە ڕاستیدا لە زمانی کوردی بووەتەوە؛ بۆ تێگەیشتن لەمە دیارە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی» عەلائەددین سەججادی ئەخوێنرێتەوە.

زمانی ئەم دوو قەومە لە هەندێ شتدا جێگای خۆیانیان لە زمانی کوردیدا کردەوە، لە حەقیقەتا بۆ تێگەیشتن و ڕاستکردنەوەی ئەدەبی ڕاستەقینەی کورد و دەرهێنانی کرۆکەکەی لە زانینی ئەو دووە هیچیتر پێویست نییە. مەبەستیش لە شتەکەیتر زمانی ئاوروپاییە. بۆ زانینی ئەدەبی کوردی زانینی زمانی ئاوروپایی شەرت نییە.

مەبەستم ڕیشەی زمانەکە نییە؛ ڕیشەکە یەکێکە ئەوە هیچ؛ چونکە هەردوو لایان ئارین. مەبەستم تەرزی ئەدەبەکەیە. ئەم زمانە هاتوچۆیەکی لەگەڵ زمانی کوردیدا نەبووە تا ئەدەبەکەی خۆی لە زمانی کوردیدا جێگە بکاتەوە، مەگەر لەم چەند ساڵانەی دواییەدا نەبێ. ئا لەم بەرەیەدا کە

ئێستە هەموومان ماوین، ئەوەش ئینکار ناکرێ کە هێشتا نە ئەدەبی ئێمە لە دڵی ئەوانا جێگای بووەتەوە، نە هی ئەوان لە دڵی ئێمەدا. بە پێچەوانەی عەرەبی و فارسییەکە، ئەوان بەهۆی دین و حوکمەوە لە دڵی ئێمەدا جێگای خۆیان کردەوە؛ بەڵام داخەکەم! هی ئێمە لە غەیری مەعنا و ـ دان نەنان بەو مەعنایەشدا ـ لە دڵی ئەوانا هیچ شوێنێکی بۆ خۆی داگیر نەکرد.

جا قسە لەوەوە بکەین کە ئەم درێژەمانە لەبەر ئەوە هێنایە ناوەوە:

ئەدەبی فارسی گەلێ کاری کردە جەرگی ئەدەبی عەرەبی. وای لێ هات سەرچاوەی ئەدەبی عەرەبی بوو بە ئەدەبی فارسی. ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە عولەما و ئەدیبەکانی فارس بە هی دینەوە خەرمانی خەزنەی ئەدەبی خۆیان هەڵڕشتە ناو زمانی عەرەبی و زمانی عەرەبی بەهۆی دینەوە وردە وردە پەرەی سەند، لە زارەوە کەوتە سەر قاقەز، مەعنا و حیکمەتی لە زمانەکانیترەوە وەرگرت و خستیە ناو خۆیەوە. عالمە عەرەبی نووسەکان ـ کە لە ٩٠٪ [لە سەدا نەوەد] عەرەبیش نەبوون و دین زمانی نووسینیانی کردبوو بە زمانی عەرەبی ـ کە ئەهاتنە سەر نووسینی ئەدەب و گێڕانەوەی شتێکی ئەدەبی، ئەیاننووسی «**قال أعرابيّ**»، یا «**رأى أعرابيّ**»، یا «**سَمِعَ أعرابيّ**» با ئەو وتن و بینین و بیستنەش لەسەر شاخەکانی «زاگرۆس»ەوە یا لە دەشتەکانی «ئیندنۆسیا» و «ئەندولوس»دا بوایە، ئەو هەر ئەیوت «**قال أعرابيّ، رأى أعرابيّ، سَمِع أعرابيّ**».

زمانی دین لەم هەموو شوێنانەدا بڵاو بووبووەوە و بووبوو بە زمانی نووسین. عالمی عەرەبی‌نووس ئەگەر سەیری بکردایە لە بناری کێوەکانی کوردەواری کابرایەکی کورد شتێکی کردووە یا وتوویەتی، ئەو لە کتێبە ئەدەبییەکەی خۆیا هەر ئەینووسی «**قال أعرابيّ**»؛ وەیا کابرایەکی

«سەلت»ی لە ئەسپانیادا شتێکی ببینیایە ئەو ئەینووسی «**رأی أعرابيّ**». هەروەها کابرای هندی لە ئیندونۆسیادا شتێکی ببیستایە ئەو خێرا ئەیخستە سەر قاقەز و ئەینووسی «**سمع أعرابيّ**». بەم «**قاله و رأى و سَمِعَ**»یە ئەدەبی عەرەبی گەیشتە چڵەپۆپەی بەرزی.

ئەمەش من ناڵێم عالم وەیا ئەدیبە عەرەب و عەرەبی نووسەکە بە نیازی خراپ ئەمەیان کردووە؛ نیاز خراپ نەبوو، بەڵام چۆنیەتی زەمان وابوو. عالمێکی کورد عالمێکی هندی، عالمێکی ئیندونۆسی کارەسات، وە یا قسەیەکی لە گوند وەیا شارەکەی خۆیا ئەبینی، لەبەر ئەوە نووسین بەهۆی دینەوە بە زمانی عەرەبی بوو، بە زمانی عەرەبی کارەساتەکەی ئەنووسییەوە و کارەسات بە مەعنای غەیری عەرەبی و بە زمانی عەرەبی ئەکەوتە ناو ئەدەب و کتێبی عەرەبییەوە و ئەبوو بە ئەدەبی عەرەبی. ئەدیبە تازەکانی عەرەب دوور نییە ئەمە دەرببڕن.

ئەمە دەورەی ئەدەبی عەرەبی وا، ئینجا عەینی دەورەش بۆ ئەدەبی فارسی زەماوەندی خۆی هەر گێڕایەوە. ئەم لە عەرەبییەکە گەلێ زیاتر؛ چونکە ئیمپراتۆریەتی سیاسی فارسی و نازکی زمانەکە ئەمانە سەریان کردبوو بە گەلێ وڵاتا. بە کورتی زمانێك بوو نووسینی پێ ئەنووسرا و دەفتەرداری کیشوەر وە یا کشتوکاڵی پێ ڕێك ئەخرا.

کابرای ئەدەبی فارسی لە هەر وڵاتێك شتێکی چاو پێ بکەوتایە وەیا بیبیستایە ئەیوت: «دیدم» وەیا «مردی گفت». ئەم کارەسات گێڕانەوەی ئەوان لەسەر قاقەز بە زمانی فارسی ئەکەوتە ناو کتێبی ئەدەبی فارسییەوە و ئەدەبی زمانەکەی پێ دەوڵەمەند ئەبوو؛ ئەو ئەدەبە کە ماناکەی هی زمانێکتر بوو، نووسینەکەی زمانێکتر.

بەم جۆرە ئەدەبی ئەم دوو زمانە پەرەیان سەند و دەوڵەمەند بوون و لەم ڕۆژهەڵاتەدا بە تەواوی بڵاو بوونەوە.

یەکێ لەو قەومانە کە زمانی خوێندنیان عەرەبی و فارسی بوو- وەکوو وتمان ـ قەومی کورد بوو. کورد هەم پێی ئەخوێند، هەم پێی ئەنووسی، تا لە ئاخرا وای لێ هات هەرشتێك ببوایە ئەوترا «ئەمە لە فلانە کتێبی عەرەبی، وەیا فلانە کتێبی فارسی»دا نووسراوە و ئەبوو بەماڵی ئەوان. وەکوو ئێستە ئەگەر شتێك بە کوردی بنووسرێ ئەڵێن: خۆ ئەمە لە عەرەبی وەیا لە فارسیدا هەیە، وەیا لەوانەوە وەرگیراوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر بچینە بنج و بناوانیەوە وا نییە.

وەکوو لە سەرەتاوە باسمان کرد، جارێ ئەدەب شتێکی عالەمییە و تایبەتی نییە بە قەومێکەوە. دیسان ئەو شتە کە لە عەرەبییەکە، وەیا فارسییەکەدا نووسراوە بۆچی ئەبێ بە لای ئەوەدا نەچن کە بڵێن ئەمە هی ئێمەیە و غەڵبەی ئەو زمانانە دایپچڕیوە بۆ خۆی؟ بۆچ ئەبێ ئەوە بڵێن کە ئەمە هی ئەوانە و لێیانەوە وەرگیراوە؟ لەگەڵ ئەوەشا کە ئێمە لە بەرەبەیانی مێژوومانەوە ئەدەبمان هەبووە، ئەوەندە هەبووە دەستی زۆر، نووسینی لێ داگیر کردووین و بەم زمانەی خۆمان نەنووسراوە.

بەپێی ئەم درێژە پێدانە لام وایە ئەوانەی کە تۆزێ لە حەقیقەتی عیلم و لە تەعابیری قەومی بکۆڵنەوە، ئیتر ئەکەونە سەر ئەو باوەڕە کە جارێکی کە شتێکی‌تر وا نەڵێن و نەچن بەلای ئەو قسەیەدا کە هەر شتێکیان بەرچاو کەوت خێرا بڵێن «ئەمە لە فارسی وەیا لە عەرەبییەوە وەرگیراوە». بەڵکوو ئەبێ بکەونە سەر ئەو باوەڕە کە گەلێ شتی ئێمە هەبووە و کەوتۆتە زمانی‌ترەوە.

دووهەم، لەو شتانە کە ئەمەوێ لەم سەرەتایەدا بیڵێم قسەیەکی جوانی «محەمەد حسەین هەیکەل»ـە. ئەم زانایە کتێبێکی هەیە لە ژێر ناوی «الفاروق عمر»دا. باسی چۆنیەتی ژیانی عومەر و پێگەیشتن و شەخسییەت و هەموو لاپەڕەیەکی ژیانی ئەکا. لە بێشکەی دارەوە تا بێشکەی خاك لە ئاخرا ئەڵێ:

«عومەرێك کە خوای ڕازی کرد، ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی ڕازی کرد، بە داڕێشتنی ڕێچکەی قەزاوەت و دادپەرستییەکەی غەیری ئیسلامەکانی دەوری خۆی و پاش خۆشی هەر ڕازی کرد؛ کەچی هێشتا هەر مایەوە کە نەتوانێ ڕازی بکا، وەیا لێی ڕازی نەبێ، با ئەو کەسەش هەر تاقە کەسێ بێ کە وەکوو "أبولُؤلُؤ" بێ».

عەلائەددین سەججادی ـ بەغدا

٢٦٥٧/٥/٢ کوردی

١٩٥٧/٧/٢٣ میلادی



# لە باخێ گوڵێک

١. دوو کابرا چوونە لای قازی، یەکێکیان وتی: قوربان ئەم کابرایە کەمانچەیەکم هەبوو دزیویەتی. قازی ڕووی کردە کابرایتر وتی: ڕۆڵە تۆ چی ئەڵێی؟ وتی: لێی بپرسە قوربان بزانێ بە چیا ئەڵێ هی منە؟ ئایا شاهیدی هەیە؟ قازی لە داواکەری پرسی. ئەویش وتی: بەڵێ قوربان دوو شاهیدم هەیە. شاهیدی هێنان و داوا لێ کراو وتی: قوربان لێیان بپرسە ئیشیان چییە، جا ئەو وەختە بزانی بۆ شاهیدی دەست ئەدەن یان نە؟ قازی لێیانی پرسی: یەکێکیان وتی: قوربان من زوڕنا ژەنم، ئەویتریشیان وتی: قوربان منیش دەهۆڵ کوتم.

قازی ڕووی کردە کەمانچەدز وتی: «کەمانچەکەی پێ بدەرەوە. گۆیا بۆ کەمانچە شاهێدی لەمانە عادڵترت ئەوێ؟»

٢. چەند کەسێك پێکەوە دانیشتبوون قسەیان لە شەو هەستانەوەوە ئەکرد. (مەبەستیان بە شەو هەستان، شەونوێژ کردن بوو). کابرایەکیان لەگەڵ بوو زۆر بە دڵ گوێی لێ بۆ ڕائەگرتن، لێیان پرسی: کاکە تۆیش بە خێر بە شەو هەڵئەستیتەوە؟ وتی: بەڵێ. وتیان چی ئەکەی؟ وتی: «میز ئەکەم و ئەچم ئەنوومەوە».

٣. کابرایەکی بانەیی لە سەر ئاوی «کەڵوێ» لە چلەی هاوینا مەلەی ئەکرد. مەلایەك چاوی لێ بوو سەیری کرد ئەم کابرایە دەزوویێکی گرێگرێیاوی پێیە، هەر جارێك کە خۆی هەڵئەقوڵتێنێ لە

ئاوەکە یەکێ لە گرێیەکان ئەکاتەوە. مەلا لێی پرسی: برا ئەوە بۆچ وا ئەکەی؟ وتی: «مامۆستا بە زستان هەر جارە کە چوومەتە لای ژنەکەم هەر لەباتی یەکێك گرێیەکم داوە لەم دەزووە. ئاوەکەمان زۆر سارد بوو، نەمتوانی مەلە بکەم، نوێژەکانیشم هیچ نەچواندووە. ئێستە هەر لەباتی گرێیەك جارێك خۆم ئەکەم بە ئاوەکەدا و وسڵی خۆم دەرئەکەم تا گرێیەکان تەواو ئەبن».

٤. «مەلا مارفی کۆکەیی»، ناوبانگی «حاجی ئێلخانی» بیستبوو، تا ئەو وەختە نەیدیبوو. هەڵئەستێ ئەچێ بۆلای، داوای شتێکی لێ بکا بۆ ئەو زستانەی ماڵ و مناڵەکەی. کە ئەڕوا، بە ڕێکەوت حاجی ئێلخانی چووبووە دەرەوە بۆ ڕاو، جلی ڕاوی لە بەرا ئەبێ و بە تاقە سوارە تووشی مەلامارف ئەبێ. مەلاش بارگیرەکەرێکی هەبوو سوار بووبوو، لێی ئەپرسێ: ها مەلا، ئۆغر بێ؟ ئەڵێ: بەخوا ئەوی ڕاستی بێ ئیمساڵ مناڵەکانم هیچیان نییە، ئەچم بۆلای حاجی ئێلخانی، بزانم شتێکم ناداتێ بۆ ئەو زستانەمان.

حاجی ئیلخانی ئەزانێ کە مەلا نایناسێ ئەڵێ: تەمای چەنت پێیە کە بتداتێ؟ ئەڵێ: سەد تمەنێك، ئینجا بەشم ئەکا. ئەڵێ: ئەگەر وتی زۆرە؟ ئەڵێ: پەنجا تمەن. ئەڵێ: ئەگەر ئەوەشی بەلاوە زۆر بوو؟ ئەڵێ: بیست وپێنج تمەن. ئەڵێ: ئەگەر هەر وتی زۆرە؟ ئەڵێ: دە تمەن. ئەڵێ ئەگەر دیسان ئەوەشی بەلاوە زۆر بوو؟ ئەڵێ: «چوار پەلی بارەگیرەکەم ئەکەم بە کوزی دایکیا و ئەگەڕێمەوە، چی لێ ئەکەم». حاجی ئێلخانی پێی ئەکەنێ و ئەڵێ: بڕۆ خوات لەگەڵ.

تا مەلا بە بارگیرەشەلەوە ئەگاتە ئاوایی و ئەچێتە دیواخان، حاجی

ئێلخانی خۆی و سوارەکان ئەگەڕێنەوە لە دیواخان دائەنیشن. مەلا ئەکا بە ژوورا. مەلا چاویشی کز بوو، حاجیش جلی ڕاوی داکەندبوو، مەلا نەیناسییەوە. لە پاش چاکی و چۆنی لێی ئەپرسێ: ها مەلا! خێرە وا تەشریفت هێناوە؟ ئەڵێ: وەڵڵا حاجی‌بەگ ئیمساڵ زۆر پەرێشانین، خێزانێکی زۆرم بۆ نەگبەتی بە ڕیشەوە بووە، نە نان هەیە و نە بەرگ. هاتوومەتە خزمەتت چارێکمان بکەی بۆ ئەم زستانە». حاجی ئێلخانی ئەڵێ: مەلا چەندە بەشت ئەکا؟ ئەڵێ: قوربان سەد تمەن ئینجا بەشمان ئەکا. ئەڵێ: مەلا زۆرە. ئەڵێ: با پەنجا تمەن بێ. ئەڵێ: ئەوەش هەر زۆرە. ئەڵێ: بیست‌وپێنج تمەن. ئەڵێ: فلانی هەر زۆرە. ئەڵێ: بەخوا قوربان لە دە تمەن کەمترم ناوێ. حاجی ئێلخانی پێ‌ئەکەنێ. مەلا ئینجا تێ‌ئەگا چە باسە، ئەمە حاجی ئێلخانی خۆی بووە تووشی بووە. ئەڵێ: «قوربان! ئەگەر دە تمەنەکەم نەدەیتێ بارگیرەکەم لە دەرەوە بەستراوەتەوە». حاجی ئێلخانی بە تەواوی لەبەر پێکەنین شپرزە ئەبێ. ئینجا بانگی پیاوەکەی ئەکا ئەڵێ: «کوڕە بچۆ سەد تمەن و پەنجا تمەن و بیست‌وپێنج تمەن و دە تمەن بدە بە مەلا با بارگیرەکەی لە شوێنی خۆی بێ!».

٥. حاجی‌برایم ئاغای‌عەنبار جارێك لە مەلایەك ئەپرسێ ئەڵێ: مامۆستا «ن» لە چە سوورەتێکدایە؟ ئەڵێ: «قوربان لە سوورەی "حم"دایە»!.

٦. لە سولەیمانی «مەلا سەعید ئەفەندی» ئەچێتە ژوورەوە ئیمتیحانی قوتابییەکان بکا لە قورئانا. کە ئەچێتە ژوورەوە «ڕەئووفی شێخ ساڵح» لای سەرەوە بوو، قورئانێکی ئەداتە دەست و ئەڵێ: بیکەوە و بخوێنە. شێخ ڕەئووفیش کوتوپڕ کە قورئان ئەکاتەوە

سوورەی «حم» دێتە پێشەوە ئەڵێ: «حەم». مەلا سەعید ئەفەندی ئەڵێ: ئەی زمانت بشکێ! ئەڵێ: «حوم». ئەڵێ: هەی لاڵ بیت! ئەڵێ: «حیم». ئەڵێ: قوزەڵقورت و دەست ئەکا بە لێدانی. ڕەئووفیش ئەڵێ: «چووزانم ئەمە چییە؟ سەر و بۆر و ژێر نەما نەیخەمە سەری هیچیان نەبوو، کەواتە ئەمە بەلایەك بوو بۆ من!».

٧. کابرایەك چووە لای مەلایەك وتی: قوربان ڕۆژێکی ڕەمەزانم خواردووە چۆن ئەبێ؟ وتی: ڕۆژێك لە باتی بگرەوە. وتی: گرتبوومەوە، بەڵام کە هاتمەماڵەوە مناڵەکان کەشکەکیان لێنابوو دڵم چوو دەستم بۆ برد پارووێکم خوارد. وتی: چی بوو، جا ڕۆژێکی‌تر بگرەوە لە باتی. وتی: قوربان ئەویشم گرتبووەوە دیسان بە ڕێکەوت هاتمەوە ماڵەوە مناڵەکان قاورمە بە نۆکیان لێنابوو دڵم چوو دەستم بۆ برد پارووێکم خوارد. مەلا وتی: «من وای بە چاك ئەزانم بەڕۆژوو مەبە، تا هەردوو دەستی خۆت وەکوو کەر ئەبەستیتەوە و ئەیخەیتە ملت، ئەو وەختە ئەتوانی بەڕۆژوو بیت».

٨. سۆفییەکی بڵباسی هەبوو هەموو دەم حازری جومعە و جەماعەت بوو. ئەوەندە لەگەڵ مەلا و فەقێدا دانیشتبوو، زۆر شت لەلایەن دینەوە فێر بووبوو. ڕۆژێك زستان بوو چووە لای مەلا وتی: «قوربان لەبەر سارد و سەرما هاتووم تەقلیدی مەزهەبی ئیمام حەنبەلم کردووە، مەزەبەکەی ئەو تۆزێ سووکترە. ئیمڕۆ دەستنوێژم شۆرد و نوێژم ئەکرد، سەیرم کرد شتێکی تەڕی پیس وا بە دەرپێیەکەمەوە کە بۆنم کرد بۆنەکەی ناخۆش بوو». مەلا وتی: «برا پێی ناوێ، بە هەموو مەزهەبێ ئەوە گووت کردووە بە خۆتا!».

٩. ژنێـك چووە لای قازی شكاتی لە مێردەكـەی كرد وتی: لەبەر ئـەوە میز ئەكاتـە ژێـری خـۆی، ئەبێ تەڵاقـم بدا. كابـرا وتی: «قـوربان جەنابـی قـازی با منیـش عـەرزت كـەم. لـە خـەوما مـن لـە جزیـرەیەكـدام لـەناو دەریا. لـەو جزیـرەدا كۆشـكێكی زۆر بـەرزی لێیـە لەسـەر كۆشـكەكەوە مەنارەیەكی لێیە، لەسـەر مەنارەكەوە حوشـترێكی لێیـە، منیـش وام بەسـەر حوشـترەكەوە. حوشـترەكە لـەو سـەرەوە دەمی ئەبرد بۆ دەریا ئاو بخواتەوە كە ئەمەم دی لە ترسانا میزم كرد بە خۆما». قازی كە ئەمەی بیست ئەویش لە شوێنەكەی خۆی میزی كرد بە خۆیا. ئینجا ڕووی كردە ئافرەتەكە وتی: «خوشكم! من تەنها بە بیستنەكەی لە ترسـانا میزم كرد بە خۆما، ئێسـتا ئەو كە بە چاوی خۆی دیویـەتی، چۆن میز ناكا بە خۆیا، بڕۆ هیچ هەقێكت بە سەریـەوە نییە!».

١٠. مامۆستایەك دەرسی بە منالآن ئەوت، كابرایەكی دۆستی چوو بۆلای، سەیری كرد مامۆستا دارێكی درێژ و كورت و قەڵماسكێك و تەپڵێـك و مێكوتێـك و دووزەلەیەكی لای خۆیـەوە داناوە. لێی پرسـی: مامۆستا ئەمانـە چییـە؟ جەناباغا وتـی: «فلآنـی! ئـەم منالآنـە هەتیـوی بێشـەرمیان تیایـە؛ پێی ئەڵێم: بخوێنـە، جرتم بۆ ڕایێڵێ! منیش بە دارە كورتەكە لێی ئەدەم و دوور ئەكەوێتەوە، ئینجا بە دارە درێژەكە لێی ئەدەم؛ هەڕا ئەكا و ئەڕوا؛ قەڵماسكەكەی تێئەگرم سەری ئەشكێ؛ ئەو وەختە هەموو منالەكانم تێ ئەورووكێن، چاریان ناكەم، دێنم تەپڵەكە ئەكەمە ملم و دووزەلەكە ئەگرم بە دەممەوە و مێكوتەكە ئەگرم بە دەستەوە، دەست ئەكەم بە تەپڵ كوتان و دووزەلە لێدان. خەڵكی گەڕەك گوێیان لەم تەپڵ و دووزەلەیە ئەبێ، لێمان كۆ ئەبنەوە و لە بەردەستی منالەكانا ڕزگارم ئەكەن».

١١. پیاوێك گێڕایەوە وتی: چوومە حوجرەی مەلایەك كە بە منداڵانی ئەخوێند، سەیرم كرد هەر خۆیەتی. وتم: ئەفەندی ئەوە كوا منداڵەكان؟ وتی: وان لە كۆڵانا یاری ئەكەن. وتم: حەز ئەكەم چاوم پێیان بكەوێ. وتی: «فڵانی ئاوێرم لەگەڵت بێم پێشانت بدەم، خۆت بچۆ ئەوا لەو كۆڵانەن چاوت پێیان بكەوێ، بەڵام سەرت ڕووت كە نەوەك لە دوورەوە بە منت بزانن، دێن بە پەنجە و فیكە چاوت كوێر ئەكەن».

١٢. كابرایەك گێڕایەوە وتی: بەلای كەلاوەیەكدا تێپەڕیم، گوێم لە دەنگی پشیلەیەك بوو لەم كەلاوەیدا. كە سەیرم كرد هیچ دیار نییە، ئەوە نەبێ كە ئەمە مەلاییێكە ئەمیاوێنێ. لەو وەختەدا منداڵێك لە ماڵێك هاتە دەرەوە ڕووی كردە كەلاوەكە، مەلاكە گرتی، تێروپڕی لێ دا و گەلێ جنێوی دایە. لێم پرسی وتم: مامۆستا ئەمە چییە؟ وتی: «كوڕە من بە منداڵان ئەخوێنم، ئەم هەتیوە زۆڵەش بەلای خۆیەوە لای من ئەخوێنێ، هەموو جار خۆی ئەدزێتەوە و ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە. پشیلەیەكیان هەیە لەگەڵ پشیلەكە یاری ئەكا. ئێستە من هاتم لێرە دەستم كرد بە میاوە كردن وا تێگەیشت ئەمە پشیلەكەی خۆیانە هات بە دەنگمەوە، ئەوەتە منیش گرتم سەرم نایە قوزی دایكی!».

١٣. كابرایەكی بانگوێژ پارچە كاغەزێكی گرتبوو بە دەستەوە سەیری ئەكرد و بانگەكەی ئەدا. لێیان پرسی: بانگ چۆن وا ئەدرێ؟ وتی: بچن لە مەلا بپرسن. چوونە لای مەلا وتیان: «سەلام عەلەیكم!» مەلا پارچە كاغەزێكی لە ژێر دۆشەكەكەی دەرهێنا و هەندێ سەیری كرد و پاشان وتی: «و علیكم السلام». وتیان: دەك وە چەمەر نەوێ.

١٤. فایەق بێکەس گێڕایەوە وتی: مەکتەب لە «تەوێڵە» هەبوو، بە منالآنمان ئەخوێند. ڕۆژێک دوو منال بوو بە شەڕیان. یەکێکیان هاتە لای مودیرەکە شکاتی کرد وتی: ئەفەنی ئەو کوڕە گازی گرتووە لە گوێچکەم. ئەفەنی منالەکەی تری بانگ کرد و وتی: هەتیو بۆچ گازت لە گوێچکەی ئەم منالە گرتووە، منالەکەش وتی: «ئەفەنی بەخوا من گازم لێ نەگرتووە خۆی گازی لێ گرتووە». ئەفەنیش وتی: «هەتیوە زۆڵە، وس بە. قسەیەک بکە بچێتە ئەقڵەوە، بۆچ مانگایە خۆی گاز لە گوێچکەی خۆی بگرێ؟!».

١٥. مەلایەک بۆ حەج ئەچوو. لەو وڵاتی «شام»ـەدا لەگەڵ گاورێک بوون بە هاوڕێ کە ئەم ئەچوو بۆ حەلەب. شەوێ پێکەوە دانیشتبوون، گاورەکە دەستی برد قاپێکی دەرهێنا و دەستی کرد بە عەرەق خواردنەوە، پیاڵەیەکیشی تێکرد و دایە دەست مەلاکە. مەلا بەبێ قسە وەری‌گرت. ئینجا گاورەکە وتی: «قوربان ئەمە عەرەقێکی چاکە». مەلا وتی: «بە چییا ئەزانی؟» وتی: «قوربان، پیاوەکەی خۆمم نارده بازاڕ وتی: لە جوولەکەیەکم کڕیوە، جووەش سوێندی خواردووە کە عەرەقێکی کۆنە و هیچ شتێکی تێکەڵاو نەکراوە». مامۆستا کە ئەمەی بیست، خێرا پیاڵەکەی نا بە سەرەوە و چۆڕەبڕی لێ کرد وتی: «تۆ کەری! ئێمە کە باسی حەدیس ئەکەین ئەڵێین لە تابیعینەوە، تابیعین لە ئەسحابەوە و ئەسحاب لە پێغەمبەرەوە. ئێستە من چۆن بڕوا ئەکەم کە گاورێک لە پیاوەکەیەوە و پیاوەکەی لە جوولەکەیەکەوە قسە بگێڕێتەوە؟ بڕوا بکە هەر لەبەر ئەوە خواردمەوە کە ڕێگەی قسەگێڕانەوەکەم بەلاوە بەهێز و باش نەبوو».

١٦. کابرایەك هەبوو «ئەحەخڕنووك»ـی ناو بوو. ئەم ئەحە خڕنووکە ئیشی ئەوە بوو «شایەر» بوو، شایی ئەگێڕا. ژنێکی هەبوو «باجی‌سەمەن»ـی ناو بوو. باجی سەمەنیش ئیشی ئەوە بوو مردووی ئەلاواندەوە، «سەردوولکە» بوو؛ هەر مردووێك بمردایە ئەهاتن ئەیانبرد ئەیلاواندەوە، لەگەڵ ئەمەشا دیسان ژیانیان هەر کووڕ بوو.

شەوێك باجی سەمەن هەروا تۆزێ دەستی کرد بە لووتوپووت‌کردن لەگەڵ مێردەکەیا. ئەحە پێی وت: «مردووت مرێ! لووتوپووتی چی ئەکەی؟ کێ وەکوو ئێمەی بۆ هاتووە؟ دنیا دوو چمکی هەیە یا خۆشییە، یا ناخۆشی؛ ئێمە هەردوو چمکەکەمان گرتووە. ئەگەر ویستمان خۆشی بکەین من بە باڵای تۆدا ئەڵێم، ئەگەر خۆ ویستمان ناخۆشیش بکەین تۆ من بلاوێنەرەوە، ئیتر ئەمەی بۆ چییە؟».

١٧. ئەمەش هەر لەقسەی کوردییە ئەڵێ: جارێك کەروێشکێك بۆڵە ترێیەکی دیەوە. ڕێوییەك هات لێی فڕاند و خواردی. لێیان بوو بە هەرا و وتیان: با بچین شەرع بکەین. هەستان چوون بۆ لای «مارمیلکە». لەبەر کونەکەیا ڕاوەستان و کەروێشك وتی: «هەی مارمیلکەی باڵا بەرزی نەوجوان، ئەی قیت و قنجەی چۆڵ و بیابان!» مارمیلکە وتی: «ئەڵێی چی؟ هەی دەنگخۆشی دەربەندان، هەی زمانشیرینی زمانزان؟» وتی: «هاتووین شەرعمان بکەی». وتی: «هاتوونەتە لای دانایەکی شەرعزان». وتی: «وەرە دەرەوە لامان». وتی: «مامۆتکان ئەچنە لایان». وتی: «من بۆڵەترێیەکی شیرینم دیبووەوە، ڕێوی هات لێمی فڕاند و خواردی». وتی: «دیارە چاکەی بۆ خۆی ئەوێ». وتی: «مستەکۆڵەیەکم لێ دا». وتی: «لەباتی، هەقی خۆت کردۆتەوە». وتی: «ئێستە شەرعمان بکە». وتی: «کردم».

١٨. لەسەر قسنەکەی «ئایید» لە بەرزان، هەندێ کەس هەڵئەپەڕین. مەلایەکیش چوو سەرچۆپییەکەی لە دەست وەرگرتن. خەڵکەکە وتیان: «ئەزبەنی! ئەم فەڵهەین، تۆ بۆچی داوەتێ لگەل مە تکێ؟» مەلاش وتی: «هوون فەڵەهن ئەژك قەشێوە». وان گوتن: «ئەزبەنی! چە دبێژی؟ تۆ پێغەمبەری مەیی، تۆ نە قەشەیی». گوت: «ئەز نشێم شەفاعەتا وا حەما بکم ئەز قەشەمە». وتیان: «ئەزبەنی! حو دبێژت ئەز پێغەمبەرم تۆ چەڤان پێغەمبەر نێ؟» ئەوا ئەویش سەرچۆپی گرتووە و بە دەم هەڵپەڕینەوە وتی: «بلا حسو پێغەمبەر بت ئەز ژکژامتاوی ئەز ژکژامتاوی».

١٩. حاجی قادری مەحوی برایمی شاتری، مەڕ و ماڵاتێکی ئێجگار زۆری بوو. لە بەهارانا کە مەڕ ئەزا بە جارێ دوو هەزار مەڕ و بەرخ ئەرژانە یەك ئەبوو بە قاڕە و باڕەیەك ئەوسەری نەبێتەوە. گەلێ جاری وا ئەبوو لەناو ئەم هەموو ماڵاتەدا بەرخێك بەر دایکی خۆی نەئەکەوتەوە و لەو ناوەدا دەستی ئەکرد بە باڕەباڕ. حاجی لەناو دەوارەکەدا دائەنیشت، هەر ئەوەندە بوو گوێی لە دەنگەکە بوو، ئەیزانی ئەمە چە بەرخێکە و هی چە دایکێکە بانگی ئەکرد ئەیوت: «ئەوە فلانە بەرخە و هی فلانە مێیە بچن بیگرن و بیخەنەوە بەری».

٢٠. پادشایەك کچێکی نازداری هەبوو نەخۆش کەوت، پادشا وتی: هەر پزیشکێك هات بۆ چاککردنەوەی نابێ کچەکەی چاو پێ بکەوێ، ئەگەر چاکیشی نەکردەوە و نەیزانی چیەتی لە سەری ئەدەم.

لەبەر ئەم مەرجە هیچ پزیشکێك نەیوێرا بێتە سەر کچە، تا ڕۆژێك پزیشکێك هات وتی: «کچەکە لە ژوورێکی‌تر و منیش لە ژوورێکی‌تر بم. تاڵە دەزوویەك ببەستن بە دەستیەوە و منیش لەملاوە سەری دەزووەکە

بگرم، ئەو وەختە بۆم دەرئەکەوێ نەخۆشییەکەی و پێتان ئەڵێم. ئەگەر بەم جۆرە پادشا ئەیەوێ دێم.

پادشا وتی: باشە، من بەم جۆرە ئەمەوێ، بەڵام هات بۆ ئەوەی پزیشکەکە تاقی بکاتەوە وتی: بە جۆرێ کە پزیشکەکە ئاگای لێ نەبێ سەری دەزووەکە لەباتی ئەوەی بیبەستن بە دەستی کچەکەوە، بیبەستن بە دەستی پشیلەیەکی نەخۆشەوە، بزانن ئەم پزیشکە ئەڵێ چی؟. هاتن، وەکوو پادشا وتی وایان کرد و سەری دەزووەکەیان هێنا لە ژوورەکەیتر دایان بە دەستی پزیشکەکەوە. پزیشکەکە سەری دەزووی گرت، تۆزێ سەرسامی گرتی. پادشا وتی: بۆچ وا سەرسام بوویت؟ وتی: «پادشاهم زۆر سەرم سوڕ ئەمێنێ، سەیر ئەکەم ئەم نەخۆشە گۆشتی مشکی بۆ باشە و بەوە چاك ئەبێتەوە».

پادشا هەستا و ناوچاوانی ماچ کرد، وتی: ڕاستە پزیشکیت و کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە. وتی: ئەمەش بۆ ئەوە وام کرد چونکە لە پێشا گەلێ پزیشکم هێنابووە سەر ئەم کچە، هەرکە ئەهاتە سەری، لێی ئەپرسی تۆ چیتە؟ ئەویش لەبەر ئەوە بە تەواوی دەردەکەی خۆی نەئەزانی ئەچوو شتێکی ئەوت کە لای وابوو ئەوەیە، ئەوەش نەبوو. پزیشکەکە دەرمانی ئەو دەردەی ئەدایە ئەویش لە ڕاستیدا ئەو دەردەی نەبوو، دەرمانەکە زیانی بۆی ئەبوو تا وای لێ هات بە تەواوی کەنفت بوو. ئیتر منیش وتم ئەبێ پزیشك خۆی بزانێ دەردی نەخۆش چییە، کە دەردی زانی دەرمان ئاسانە. نەخۆش کە خۆی بزانێ چە دەردێکیەتی، ئەتوانێ خۆیشی دەرمان بکا.

٢١. حاجی ئەمینی حاجی فەتاحی قادر لە سولەیمانی مناڵ ئەبێ. شەوێك دێتە دەرەوە لە بەر قاپی حەوشەکەی خۆیان میز ئەکا، شەو درەنگ ئەبێ لەو کاتەدا چەرخچییەکی دەوری «عوسمانی»

بە سەریا ئەچێ و تێی ئەخوڕێ: «ولەن کیمدر؟» ئەویش ئەڵێ: «من در، میز در، بەر دەرگای خۆمان در».

٢٢. کابرایەکی کورد لە کەرکووك پارەی لای «حاجی محەمەد» ناوێك بوو. حاجی پارەکەی نەئەدایەوە و گەڕی پێ ئەکرد. کابراش ئەیوت: «کورە باوکم تۆ کەشیدەکەت لابە و حاجییەتییەکەشت لابە و بۆوەوە حەمەیەکی ڕووت، ئەو وەختە پارەی خەڵك بخۆ».

٢٣. جافرسان لە «نەوسوو» بیستوچوار کوڕی سواری هەبوو کە هەریەکە دیواخانگێڕی وڵاتێك بوون. ڕۆژگار پشتی تێ ئەکا و دیواخانی خانەدان نامێنێ. مستەفابەگ وەیا مچەسوورێك هەبوو گۆیا ئەمەش یەکێك بوو لە خزمە هەرە نزیکەکانی جافرسان. ئەم مچەسوورە بەر ئەو دەربەدەرییە نەکەوتبوو هەر لەو وڵاتەدا مابووەوە. مچەسوور ژنانی بوو؛ ڕۆژێك پێی هەڵئەنگوێ، کە ئەکەوێ ئەڵێ: «وی!» کابرایەك هەبوو «ئەلەزلە»ی ناو بوو، لە تەنیشتیەوە ئەبێ، گوێی لێ ئەبێ ئەڵێ: «مچە! بڵێم چی لە ئیشی خوا؟ خوا بیستوپێنج خانەدان کوێر ئەکاتەوە تۆ لە شوێن ئاگردان بەجێ دێڵێ!»».

٢٤. شێخ جافری عەبابەیلێ هەبوو، پیاوێکی قسەخۆش و عەنتیکە بوو، بەڵام هەتا بڵێی ناشیرین و بەد فەساڵ بوو. سەعیدبەگی بادەڵانیش هەبوو ئەویش پیاوێکی ئێجگار قسەخۆش و دیواخانارا بوو. ڕۆژێك سەعیدبەگ ئەچێتە دیواخانی ئەحمەدبەگی وەسمانپاشا سەیر ئەکا شێخ جافر لەوێ دانیشتووە، بەڵام ورتەی لە دەم نایەتە دەرەوە و بە تەواوی پەژارە دایگرتووە. هەرچەندە ئەیدوێنێ بە هیچ جۆر شێخ جافر نایەتە قسە و هەر ئەڵێ: سەعیدبەگ وازم لێ بێنە زۆر عاجزم.

سەعیدبەگ ئەڵێ: شێخ جافر ئەگەر ئێستە من تۆم هێنایە پێکەنین چیم ئەدەیتێ؟ شێخ جافر هەر دەنگ ناکا بە کورتی گرەو ئەکەن لەسەر هەندێ پارە کە ئەگەر ئەم ئەوی هێنایە پێکەنین ئەوەندە پارەی بداتێ، ئەگەر خۆ واش نەبوو ئەم دوو ئەوەندە پارە بدا بەو. بەم جۆرە گفت ئەبڕنەوە و سەعیدبەگ ون ئەبێ، لە پاش تۆزێك دێتەوە ئاوێنەیەك ئەدا بە دەست شێخ جافر و ئەڵێ: «ها سەیری خۆت بکە گورگت ئەوێ هەیە، چەقەڵت ئەوێ هەیە، مەیموونت ئەوێ هەیە، ورچت ئەوێ هەیە، هەر ڕمووزنێکت ئەوێ لە دنیادا هەیە». لە ڕاستیدا شێخ جافر سەیری ئاوێنەکەی بەردەمی ئەکا و گوێی لەم قسانە ئەبێ دەست ئەکا بە پێکەنین و گرەوەکە ئەدۆڕێنێ.

٢٥. ئەڵێن: جارێك پادشایەك خزمەتکار و پیاوێکی زۆری لە پشت سەرەوە ئەبێ و بە ناو کۆڵانێکا تێ‌ئەپەڕێ. بە هەر لایەکدا ئەڕۆیشت هەموو لە بەری هەڵئەستان و سەلامیان بۆ ئەگرت. دەروێشێکی ڕووتەڵە لە ڕێبازی پادشادا لەسەر کۆڵانەکە دانیشتبوو پاڵی دابوو بە دیوارەکەوە و قاچیشی ڕاکێشا بوو کە پادشا بە بەردەمیا تێ‌پەڕی هیچ خۆی تێك نەدا و قاچیشی هەڵنەکێشایەوە، وەکوو هەر کەس نەڕۆیشتبێ هەروا بوو بەلایەوە. پادشا لەمە تووڕە بوو، پیاوێکی نارده سەری کە پێی بڵێ بۆچی لەبەر پایەی پادشا بە لانی کەمەوە قاچی هەڵنەکێشاوەتەوە؟ کابرا چوو پێی وت. دەروێشیش وتی: بچۆ بە پادشا بڵێ: «ئەوی دەست ڕانەکێشێ قاچیش هەڵناکێشێ!».

٢٦. مەلایەك هەبوو گوزەرانی زۆر کز بوو. ئەو سەردەمەش شیعر باوی هەبوو، هەرکە شیعری بوتایە ئەیبرد بۆ پادشا، پادشایش

بەخششێکی باشی ئەدایە. مەلاژن پێی لێ کرد بە کەوشا، پێی وت: هەستە تۆش شیعر بڵێ و بیبە بۆ پادشا با بەخششت بداتێ و تۆزێ گوزەرانمان چاك ببێ. هەرچەند مەلا هاواری کرد و فەریادی کرد کە کچێ من شیعر نازانم و من لە شیعرم چی؟ کەڵکی نەگرت. بە زۆر هەناردی. مەلا ئەم شیعرانەی دانا:

دارەکەی سەرکەل، پردەکەی قشڵاخ
ئافەرم شارەزوور بۆ پەمووت
مەسەلەی تەڵاق «می جویم ز قاق»
دوو سەد و پەنجا و حەوت «مَنَم»

هەستا ڕۆیشت، پادشا لە حەوشەی بارەگادا لەسەر حەوز و لەناو چیمەن دانیشتبوو، مەلا خەبەری نارد کە شیعرم بۆ پادشا وتووە. پادشا بانگی کرد و مەلا لە بەردەمیا شیعری بۆ خوێندەوە. وتی: مەلا ئەمە بوو شیعرەکەت! وتی: بەڵێ قوربان. وتی: کەواتە بەخششی ئەم شیعرە جوانەت ئەوەیە بتخەمە ئەو حەوزەوە. ئا کوڕە بیخەنە ئەو حەوزەوە. مەلایان هەڵگرت و خستیانە حەوزەکەوە. مێزەرەکەی کەوتە سەر حەوزەکە. لەو وەختەدا تانجییەك لە حەوشەکەدا بوو لەوێوە ڕەت بوو مێزەرەکەی بە مراوی زانی. بەخوا بازێکی بۆ دا و شڵپ کەوتە حەوزەکەوە. مەلا چاوی لێ نەبوو، هەر ئەوەندەی ئەزانی کە یەکێکی تریش وا قورت ئەخواتەوە بەناو ئاوەکەدا و سەر ئەکەوێتەوە. ڕووی تێ کرد وتی: «ئاغە! جەنابیشتان شیعرتان فەرمووە؟».

٢٧. قسە دێ قسە ئەبڕێ. منیش شتێکی وەکوو ئەمەم دی، بەڵام قسەی هیچ نەکەی، وەڵڵا و بیلـلا هیچیان لێ نەکردم: زۆر

دەمێکە، لە باوکم تۆرابووم و ڕووم کردبووە ماڵی خاڵۆوان. بڵێین ئەو وەختە دوو جۆرە خوێندنیان پێ ئەخوێندم: یەکێ خوێندنی مەکتەب کە لە پۆلی دووی سەرەتایی بووم؛ بە دەمیەوە خوێندنی عەرەبیشیان پێ ئەخوێندم. دەستیان پێ کردبووم بە «عوامل جرجانی» کە ئەمە بە ڕەوشتی کوردەواری لە سەرەتاوە ئەخوێنرێ.

باوکم کابرایەکی ناردبوو بە شوێنما «شامار»ی ناو بوو. پیاوێکی کورتەباڵای پیری چاوکزی خڕە بوو، ئەتوت تۆپە. ئەگەر ماوە یادی بە خێر، ئەگەر مردووە بە ڕەحمەت بێ! منیش کەوا و سەڵتەم لە بەرا بوو، جامەدانەیەکم بە سەرەوە بوو وەکوو فەقێ وا بووم. لەگەڵ خاڵە شامار لەو پێ بناری «شاهۆ»وە شەوێك ڕێمان کەوتە هۆبەیەکی گەورە و لەوێدا دەوارێکی هەژدە هەستوونی هەڵدرابوو چووینە ئەوێ. بە تەواوی لە بیرم نییە، ئەو ڕەشماڵە گەورەیە یا هی حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی بوو، یا هی خزمێکی ئەو بوو. بەڵام ئەوە ئەزانم میرزایەکی ڕیش سپی باڵا بەرزی هەبوو میرزا ڕەشیدی ناو بوو.

شەوێ دیواخانی جمەی ئەهات؛ خان خۆی و میرزا ڕەشید و گەلێ لە پیاوماقووڵی باوەجانی بە جلوبەرگێکی بە پەرداخی کوردی و هەموو بە ستارخانی فیشەکەوە لە ژێر دەوارا دانیشتبوون. ئێمەشیان لەو سەرەوە دانابوو، خوێندەواریش هەر میرزا ڕەشید لەوێدا هەبوو.

خاڵە شامار یا لەبەر ئەوە سەروگوێلاکی سوفییانەی هەڵکەوتبوو، وەیا لەبەر ئەوە کە مەبەستێکی هەبوو، کاتێ کە هاتین بۆ نوێژی شێوان لە ڕێگەدا پێی وتم: کە چووینەوە لە دیواخانەکەدا «حزب»ێ قورئان بخوێنە. وتم: خاڵە شامار قورئان نازانم. خاڵە شامار بوو بە فیشەکە شێتە و چوو بە عاسمانا. وتی: «جەنابت لە لایەکەوە مەکتەبیت و لە لایەکەوە

فەقێیت، چۆن قورئان نازانی؟!».

وتم خاڵە شامار پیاوی چاك بە قورئان خوێندن ئەبێ پیاوی حافز بیخوێنێ کە هەموو قورئانی لەبەرە، من لەناو قورئانەکەشا بە ڕەشخوێنیش هەر نازانم بیخوێنم؛ ئێستە ئەم شەڕە چییە تۆ لە منت ئاڵاندووە. من زۆرم وت و خاڵە شامار کەمی بیست. لە بیرمە زیللەیەکیشی لێ دام. چار نا چار وتم باشە، لە سوورەتە وردەڵەکان دوان سیانێکم لەبەر بوو، وتم لەوانە ئەخوێنم. وتی: لەوانە نابێ! ئەبێ لە قورئانی سەرەوە بخوێنێ. قورئانیشمان پێ نییە. بەڕاستی فلانی لە دەست خاڵە شامارەوە کەوتمە ڕۆژێکی زۆر ڕەشەوە.

کە چووینەوە دیواخان ئەوا سەیر ئەکەم پەیتا پەیتا لە ژێرەوە دەستم تێوە ئەژەنێ و ئەڵێ دەی! یاڕەبی خوایە چە بکەم، دیواخانەکەش هەر زۆر پڕە، نە هیچ ئەزانم، وە نە لە ڕوویشم هەڵدێ. وا ئەویش دنیای لێ کردووم بە چەرمی چۆلەکە. ئەو هەموو کوتەکی دەستی ئەوەبوو ئەیوت: تۆ دەنگت خۆشە، ئەبێ قورئانیش بزانی!. کورە بابە ئەمە شەرت نییە هەرکەس دەنگی خۆش بوو، ئەبێ قورئانیش بزانێ. ئەیوت: نابێ ئەبێ بزانی. جا وەرە تێی بگەیەنە؟!

خوا ئەیزانێ لە ترسا و لە شەرما ئەو دوو سێ سوورەتە وردەڵەشم کە لەبەر بوو ئەویشم لە فیکر چووەوە. لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر ئەوەشم بخوێندایە خاڵە شامار ئەوەشی قبووڵ نەئەکرد و ئەیزانی، چونکە ئەویش ئەوانەی لەبەر بوو. منیش ئێجگار ترسی میرزا ڕەشیدم لێ نیشتبوو. خوێندەوار تەنها ئەو لە دیواخانەکەدا هەبوو، ئەگینە ئەمتوانی دەورێ «عوامل»ەکە بکەمەوە لەوانی بکەم بە قورئان. دیار بوو خاڵە شامارێش عەوامیلی نەئەزانی، بەڵام میرزا ڕەشید هیچ نەبێ ئەیزانی ئەمە قورئان نییە.

کوتەك لە بەهەشتەوە هاتووە؛ خاڵە شامار تەنگی پێ هەڵچنیم، بە دەنگی بەرز «**أعوذ باللّە من الشّیطان الرّجیم. بسم اللّە الرّحمن الرّحیم**»ـێکم بۆ کرد. ئەوەندەم لە بەر بوو، پاش ئەوە پیا هاتم تۆزێ ڕووم کرایەوە، ئەوەی خوا نەیوتبوو ئەوەم وت. بە دەنگی بەرز و بە مەقام دەستم پێکرد، ئێستە ئەزانم کە ئەو وەختە ئەمزانی «**نذیراً، بشیراً، بصیراً**» هەیە لە قورئانا، بەڵام من نەئەکەوتەوە فیکرم چەند شتێکم ئەوت کە خۆیشم نەمئەزانی چی ئەڵێم و ئاخرەکەیم ئەهێنایەوە بە شتێکی وەکوو «شتیڕا». دوو سێ شتیترم ئەوت و ئەمبردەوە سەر «شلێڕا».

ئێجگار کە سەیرم ئەکرد خەڵکەکە هەموو سەری بۆ ئەلەقێنن و پێیان خۆشە بە تایبەتی «میرزاڕەشید» ئاگام لێبوو ئاو بە چاویا ئەهاتە خوارەوە. ئیتر بە تەواوی منیش گەرم بووم. خاڵە شاماری لای خۆشم لەگەڵ سەر لەقاندن و فرمێسکەکەیا جارجار لە ناکاو «هوو»ێکیشی بۆ ئەکرد، ئیتر نازانم یادی شێخی ئەکرد یا قورئانەکەی من کاری تێکردبوو؟ بەڵام لە ڕاستیشا دەنگم خۆش بوو.

بەم جۆرە بە «شتیڕا، شلێڕا، دلێڕا، سپێڕا، کولێڕا و... هتد» قورئانم هەمووی بە «ڕ»ی قەڵەو دوایی هێنا و ئێستە و ئەوسا کەس نەیزانی کە ئەمە قورئان نییە، کەسەکەش هەر میرزا ڕەشید بوو؛ چونکە ئەو خوێندبووی، ئەوانیتر هیچ. میرزا ڕەشیدیش لە هەموویان زیاتر چووبووە دڵیەوە کە قورئانێکی ڕەوان و بە تەجویدم خوێندووە. ئەو شەوە خزمەتێکی زۆر زۆریان کردین. بەیانیش خان ئەسپێك و زەلامێکی پێداین کە من ئەو ڕۆژە تا کوێ بڕ ئەکەین بە سواری بڕۆم؛ پاشان پیاوەکە وڵاغەکە بەرێتەوە. لەو قورئان خوێندنەوە خان وا چووبوومە دڵیەوە کە من بەچکە ئەسحابەیەکم و ئەو شەوە ڕێم کەوتۆتە ئەوێ.

کە تۆزێ لە ڕەشماڵەکان دوور کەوتینەوە، خاڵە شاماریش هات سوار بوو، منی خستە پاشگری خۆی وتی: «بێ ئەقڵ من هەر بۆ ئەمەم بوو کە ئەموت قورئان بخوێنە. ئافەرەم! کوڕم ڕووی مامی خۆتت سپی کرد». منیش ئیتر نەموت ئەوە قورئان نەبوو، ئەگینە لەسەر ئەسپەکە ئەیخستمە خوارەوە.

٢٨. کابرایەکی «بامۆك»ی چووبووە ئەو وڵاتی ئایەنە و ئەستەمبوڵە. ڕۆژێـك سـەیری کـرد وا کابرایـەك لـە بازاڕدا سـندووقێکی لـە بەردەمایـە و پڕیـەتـی لـە قوتـووی شووشـەی سـەر داگیراو. بانـگ ئـەکا: «هـای دەرمانـی کێچ! دەرمانی هۆڕە! دەرمانی تەپە! دەرمانی مێروولە!» ئـەو سـەردەمەش خـۆت ئەیزانـی کێـچ و جڕوجانـەوەری شـارەزوور و هەڵەبجە گای ئەخستە هەلەکەسەما.

کابرا وتی: کەسابەت لەمە چاکتر نابێ، لەم سندووقە دەرمانە ئەکڕم و ئەیبەمەوە لە وڵاتی خۆمان ئەیفرۆشم، ئەوەندە دەوڵەمەند ئەبم، پێی ئەبم بە «حەماغای کۆیە». دەرمانی کڕی و بەرەو دوا بووەوە بۆ وڵات.

ڕۆژێك لە ناو شاری هەڵەبجە «های دەرمانی کێچ»ی ئەکرد. کابرایەکی شـارەزووری کـە لە دەسـت کێچ ماڵی بەجێ هێشتبوو، هەڵاتبوو. گوێی لەم بانگە بوو وتی: قەت لەمە چاتر ئەبێ؟ ئێستە شووشەیەکی لێ ئەکڕم و ئەیبەمـەوە، ئیتـر لـە دەسـت کێچ ڕزگارم ئەبێ. چوو شووشـەیەکی لێ کڕی و ئەو شەوە دار و دیواری خانووەکەی و هەموو نوێنی ماڵەکەی بە دەرمان دەرماناشی کرد و لێی ڕاکشا، زۆری پێ نەچوو سەیری کرد کێچ لە شەوان گەلێ زۆرترە.

ئـەو شـەوە خـەوی لێ نەکـەوت، بەیانی زوو چووەوە بۆ هەڵەبجە و

بەرۆکی کابرای گرت و وتی: خوا بتگرێ، تۆ دەستی ئەو عالەمە بۆچ ئەبڕی، ئەم دەرمانەی تۆ کەی دەرمانی کێچە؟ خۆ من هەموو ژوورەکەم بەم دەرمانەی تۆ هەنوو، کەچی هیچ کەڵکی نەبوو. کابرای خاوەن دەرمان وتی: «نابێ چووبێتی دەرمانەکەت پژاندبێ بە ناو نوێنەکانا و بە ژوورەکەدا؟» وتی: بەڵێ وام کردووە. وتی: باوکم وا نابێ. وتی: ئەی چۆن؟ وتی: «ئەبێ بێنی یەکە یەکە کێچەکان بگری و دەرمانەکە بکەیتە چاویانەوە بۆ ئەوەی کوێر ببن. بەو جۆرە کە تۆ کردووتە شێتیش وا ناکا. تۆ کە نازانی خۆت ئیش بکەی بۆچ دەرمانی خەڵك ئەشکێنی». کابرا وتی: «بێژم چی برا! خوا ڕووی کێچ ڕەش کا وا گوێم لە قسەی وا ئەبێ».

.۲۹ «بهاءالدّین عاملی» یەکێ بوو لە ڕیازیزانە هەرە بەرزەکانی ئیسلام. دانراوەکەی ـ «خلاصة الحساب» ـ لە کتێبە زۆر نایابەکانی حیسابە؛ تەنانەت ئەڵێن حەو مەسەلەی لە باب جەبرەوە تیایە ئێستەش هەر نەزانراوە. ڕۆژێك ئەم بەهائەددینە لە گەشتەکەیا ڕێی ئەکەوێتە شوێنێك ئاخوونێکی مێزەرە زلی ڕیش گەورە دە، پانزە، بیست فەقێ بە دەوریا دانیشتوون دەرسی «خلاصة الحساب»یان پێ ئەڵێ، بەڵام هیچی بەسەر هیچەوە نییە. بەهائەددین لە یەکێ لە فەقێیەکان ئەپرسێ کە سێ جار چوار ئەکاتە چەند؟ فەقێش بەبێ وەستان ئەڵێ ئەکاتە بیست‌ویەك. ئاخوون تووڕە ئەبێ و سوور ئەبێتەوە، ئەڵێ: «ئەم ناجسنە هەروا تێ نەگەیشتووە؛ تا ئێستە من سەد جارم پێ وتووە ڕۆڵە سێ جار چوار ئەکاتە حەڤدە، تازە ئەو ئەڵێ بیست‌ویەك».

.۳۰ حەمەپاشای جاف و مەولەوی سەر و سەودای شیعریان زۆر خۆش بووە، وەکوو ئەوە کە جارێك مەولەوی لە ئاوایی

«دیڵێ» ئەبێ و «حەمەپاشا» ئەم شیعرەی بۆ ئەنووسێ:

**ئەر گەفەی گەماڵ کوردەماڵ بێڵێ    هەی لەزەت ئەبەی خاڵۆلە دیڵێ**

مەولەویش بەم شیعرە بۆی ئەنووسێتەوە:

**لە گەفەی کەماڵ کوردە ماڵەکان    «دیڵێ»م دا وە تۆ بە گەماڵەکان**

٣١. کابرایەکی کورد ئەڵهای باران ئەکا و زۆر بە پەرۆش بووە بۆی و ڕوو ئەکاتە ئاسمان و بەم شیعرانە داوای باران ئەکا:

**هـەوران دەکا خرۆشـان، مکایـلا ئەتۆش دەی**

**نیسك و ماشان تێکەڵ کە دەبا نۆش بێتە سەردەی**

٣٢. کابرایەکی بڵباس بە کاروان ڕێی ئەکەوێتە کۆیە، ئەچێتە دیواخانی حەماغای کۆیە. کابرا لە وڵاتی خۆی ماینێکی بە دەستیاو هێنا بوو کە ئەچێتە ماڵی حەماغا ماینەکەی ئەتۆپێ. لە ڕوویشی هەڵنایە کە بە حەماغا بڵێ شتێکی وا ڕووی داوە و ئێستە منیش نیمە ماینەکە ببژێرم بۆ خاوەنی. هەر لەوێ دائەنیشێ و خۆی ئەکا بە تووڵبڕ؛ بەیانی و ئێوارە ئەچێ ئالێکی ماینە تۆپیوەکە وەرئەگرێ. ئیتر کەس لێی ناپرسێ کە کابرا تۆ ئیشت چییە لێرە ماویتەوە؛ ئەوەندە ئەمێنێتەوە تا لە ئالێکی ماینەکە پارەی ماینێکی دەست ئەکەوێ و ماینێکی‌تر ئەکڕێ.

پاش ئەوە هەڵئەستێ بڕوا، ئەچێتە لای حەماغا ماڵاوایی لێ ئەکا و کارەساتەکەشی بۆ ئەگێڕێتەوە. حەماغا سەرباری ئەوەش فەرمان ئەدا ماینێکی‌تریشی ئەدەنێ.

٣٣. «ئەلیەگوەرخانی سنجاری»: ئەلیەگوەر خانی گەورە «گەوهەر»ی هاوسەری ژیانی کۆچی دوایی ئەکا و ئەچێتە سەر گۆڕەکەی بەم شیعرانەی خوارەوە ئەیلاوێنێتەوە:

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

یە چــە زوڵمی بوو کــەردی لە بارگەم
ئەنگوشــت ناهــاڵ کەری ئەشــارەم
وار بوویــت وە بورج ئەقڵ و ســتارەم
کوورکەردی سەراوسەرچەشمەی زەینم
نابینــا کــەردی ڕەوشــەنی عەینــم
بەزەییــت نامــا وە جەســەو هاڵــم
خامووشــش کەردی شــەوچرای ماڵم
خانــم خوش‌خــوو خوش‌خەیاڵم ڕوو
هامــڕاز و هام قەوڵ ســوو ئێوارم ڕوو
هــەم هــاز پشــتم، هــەم زوور باڵــم
ســام ســکەندەر ســتوون ماڵــم
دەســەی گیســوان نــم دادەی گوڵاو
خەریکــە لــە تۆی ئــەرز بــێ ئەجاو
ســەوڵ ســایەدار ئەرئــەر قامەتــم
بــێوادە بــردی تــا قیامەتــم
خەرمــان ئومرم پەی بــەردای وە باد
لە دەس جــەورت فەڵەك هــەزار داد
نــادا هەرکەســێ مــان من گــەردەن
چون فەرهاد شیرین ئەرمەنش مەردەن
گڵکۆی تازەی لەیل گڵکۆی تازەی لەیل
بان تا بچیم وە سەر گڵکۆی تازەی لەیل

وە دڵـەی خەمین وە مەیـل پڕ کەیل
ئەسرین لە دیدەم مەڕژیا چوون سەیل
چووم وە سەرین شەیدای دڵ لە جووش
کێـل مەزارەکـەی گرتـم لـە باوەش
دیـم سـدای مەیۆت لە ژێـر خاکەوە
ئـەوەش چوو ئەڕای کـەس نەهاتەوە



گەوهەرروات: سەردارسایەی سەری من
شـێر شمشـێر شـووڕ دلاوەری مـن
دی دەس کووتاکـە لە زاری و شـینم
نـە تـوو فەرهـادی نـە من شـیرینم
خـاك بی ئەجاو سـەرد کردیـە مەیلم
نـە توو چو قەیسـی نە من چـو لەیلم
بچـوو خەریـك وە وەزیندەگانیـت
فکـر کـە وە هـاڵ دەوران فانیـت
بازاڕ گـەردوون هـەر ئیـدە کەردەن
کێ ئەزیز وە خاك خالی نەسپەردەن؟
فەڵـەك باخـەوان توولـە نەمامـە
ئـی چین مەنـەرۆ ئەو چیـن تەمامە
بـازاڕ گـەردوون ئیـدە کارشـەن
هەر سـاتێ سـەد ڕەنگ لە بازاڕشەن
یەکـە سـوارەکەی فـرە نـازارم
ڕان ڕکاوخـاس وە ڕووی هـەزارم

## کردەی یەکێکە نەدارۆ دەرەج
## ئامەنەت تۆن ئەمانوڵلا و فەرەج[1]

**٣٤.** فایەق بێکەس لە «تەوێڵە» موعەللیمی مەکتەب ئەبێ. کاربەدەستەکانی ئەوێ لەگەڵ هینەکانی سنووری ئێرانا هەموو جار هاتوچۆی یەکیان ئەکرد و ناسراوی لە بەینیانا هەبوو. جارێك قومیسەرێکی تازە هاتبووە نوختەکەی ئەوبەری تەوێڵەوە بەشی ئێران. فایەق بێکەسیش کاربەدەستە هەرە گەورەکانی تەوێڵە کۆ ئەکاتەوە؛ وەکوو مامۆستای قوتابخانە و مەعمووری ئیستیهلاکت و کاتبی بەلەدیە و باشچاوش و ئەمانە، وەڵام ئەنێرێ بۆ نوختەکەی ئێران کە ئەم کاربەدەستە گەورانە دێن بۆ بەخێرهاتنی ئەو قومیسەرە تازەیە.

ئەوانیش کاربەدەستە گەورەکانی خۆیان وەکوو پۆلیس و قایشێ لە ژوور پۆلیسەوە ئەمنیە و قومیسەر هەموو کۆ ئەبنەوە و چاوەڕێی هاتنی ئەمانە ئەکەن. دەستەی ئەملا کۆ ئەبنەوە ئەڕۆن.

فایەق ئەڵێ: ئێوە هیچتان دەنگ مەکەن من بەم قومیسەرە تازەتان ئەناسێنم. کە ئەگەنە لای ئەوان، ئەوانیش هەموو بەرزە پێ ڕاست ئەبنەوە و بە جۆری عەسکەری ڕائەوەستن. فایەق خۆی لە پێشا ئەچێ و دەست ئەخاتە ناو دەست قومیسەرەکە و پێی ئەڵێ خۆمت پێ ئەناسێنم «**مُفلِسُ الدَّوله**»ی «**أعوَری**». ئەمە ئەڵێ و لە تەنیشتیەوە ئەویش وەکوو عەسکەر ڕائەوەستێ.

پاش ئەو «ر. آ» ئەڕواتە پێشەوە؛ فایەق ئەڵێ: پێشکەشت ئەکەم ئەم زاتە «**نێرەکەروسسەڵتەنەی مەترەقی**». پاش ئەو یەکێکی تر ئەڕوا

---

١. ئەمانوڵلا و فەرەج دوو کوڕەکەی بوون.

ئەڵێ: ئەم زاتەش **«موتەعەقیل خانی کەربابی»**. پاش ئەو «ش. ج» ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: ئەمەش **«مێ بازوڵڵاخانی ئەعرەجی»**. پاش ئەو «ت. ر» ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: ئەمەش **«سەفیهوددەولەی سەرخۆشی»**. پاش ئەو «ش. ن. س» ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: ئەم زاتەش **«پێکوڵڵاخانی شاربی»**. پاش ئەو «ج. ش» ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: ئەمەش **«موتیعولمەمالکی هەڵەوەڕی»**. پاشان «م. ق» ئەچێتە پێشەوە ئەڵێ: ئەمەش **«ڕەقەڵولئەنجومەنی بێ هێزی»**. پاش ئەو «ح. ش» ئەچێت ئەڵێ: ئەم زاتەش **«ورگولمەلیکی ئاوسی»**. پاش ئەو «ع. ع» ئەچێت ئەڵێ: ئەم ئاغایەش **«شەکەنێرولهومایوونی خڕنووکی»**.

بەم جۆرە هاوڕێکانی خۆشی پێشکەش ئەکا. کابراش لەم ئەلقابانە سەری سڕ ئەمێنێ و ئەمانیش لە دڵا لە کوڵی پێکەنینان و دەنگ ناکەن؛ پاشان لێك ئاشکرا ئەبن و ئەبێ بە بەزمی پێکەنین و هەرا.

**.٣٥ تۆ ئەزانی لە وڵاتی کوردەواری لە هەر شوێنێك خواردەمەنییەکی تاقانەی هەیە ئەگەر نەتزانیوە بیزانە کە ئەمانەن:**

تووی «گەلێن»، سرنچکی «زەنان»، گوێزی «هەشەمێز»، مێوژی «ژاوەرۆ»، باسووقی «شاربازێر»، هەناری «نازەنین»، سێوی «سەردەشت»، هەنجیری «ڕێژاو» و «کەڵەکن»، ترێی «سەرنوێ» و «لیڤان»، کاڵەکی «موکریان»، شووتی «قەڵاچوالان»، ناوکەکوولەکەی «گڕگڕ»، تلیاکی «کولیایی»، برنجی «دەکە» و «ئاکرێ»، تورشیاتی «سولەیمانی»، حەفتەبیجاڕ و پەشمەکی «سنە»، حەوێنج و تووری «کەرکووك»، ژێرچەنەی «کۆیە»، یاپراخی «هەولێر»، پیازی «قوروچیا»، نۆکی «نیسکاوێ»، کزنی «لەیلاخ»، هەرزنی «مەریوان»، ئاردەتووی «هەورامان»، گەنمی «مایدەشت»،

جۆ ڕەشی «گەرمیان»، بیزا و گەنمەشامی «موکریان»، لۆکەی «شارەزوور»، تووتنی «شاور»، گەزۆی «بانە»، بەڕووی «کەلی خان»، ماستی «سنجاوی» و «نەوەڕە» و «کۆزەڕەقە»، پەنیری «هەرکی» و «باخچەمریەم»، ڕۆنی «لاجان»، سالمەی «شنۆ»، کەشك و دۆینەی «جاف»، حەلوای «گوڵەزەردەی ژێر دەواری بەگزادەی جاف»، کەبابی «سابڵاخ»، دۆی «ناراو»، هەنگوینی «شامەترینکە»، پەردەپڵاوی «سولەیمانی»، خورمای «مەندەلی»، نانی «لەیلاخ»، ترۆزی چەمیلەی «دهۆك»، بەهێی «دەرەبەیان»، هەڵووژەی «نایسەر»، خەیار، ئارووی «تەوریوەر»، گێلاسی «دۆڵاو»، قارچکی «میاوەران»، قەیسی شەمس و نوری «حەسەناوا».

**٣٦.** لە وڵاتی کوردەواری ئەم شتانە لەم شوێنانە تاقانەن:

بەزم لە «کۆیە»، ڕەزم لە «سولەیمانی»، نەزم لە «سابڵاخ»، ژیری لە «سنە»، هێری لە «سیان»، گێلی لە «مایندۆڵ»، وشکی لە «هەولێر»، ساردی لە «کەرکووك»، زیتی لە «وان»، قنجی لە «بەرزان»، گورجی لە «دهۆك»، سواری لە «سوورسوور»، چرووکی لە «دێی دەورە شار»، شڕی لە «تەکیە»، قیتی سەربانان لە «بەرزنجە»، سمێڵ لە «بۆرەکەیی»، پرچ لە «کربچنە»، ڕیش لە «شەدەڵە»، کەڵەیی لە «فەیلی»، وردی لە «سنجاوی»، قسە ڕەوانی لە «سابڵاخ»، ئەگریجەی کاڵ لە «ئامێدی»، چاوی بە خومار لە «سەقز»، شۆخی لە «فەیزوڵڵابەگی»، شەنگی لە «ماش»، دیواخان لە «بەگزادەی دێبوکری»، ناسکی لە «کەسنەزانی سەرشیوی سەقز»، سۆرانی لە «شۆڕەسواری جاف»، هەڵپەڕکێ لە «بادینان»، سەروپێ لە «شکاك»، پشتێن لە «مەنگوڕ»، کراس لە «بۆلی»، کڵاو لە «سولەیمانی»، گۆرەوی میرزایی لە «سنە».

٣٧. ئەم شتانەی ئەم شوێنانە بە ناو بانگن:
مانگای «مالوان»، ماکەری «ئابلاخ»، نێرەکەری «ژاوەرۆ»، قاتری «هەورامان»، بزنی «دێلێژە»، گامێشی «موکریان»، ڕەوە ماینی «جافان»، مەڕی «لاجان»، بزنەمەرەزی «بانە»، شەگەلی «مەرگەوڕ»، کەڵەشێری «کرماشان»، توتکی «دێبوکری»، سەگی «هەوشار»، ڕێوی «کوێستان»، گورگی «هەوەتوو»، دووپشکی «عەربەت»، عەلیشیشی «موکریان»، چەقەچەقی سەگی «کونەماسی»، چونکە ئەرکی «جرتاوا»شیان لەسەرە.

٣٨. هەر شتە لە شوێنێك:
کەوچکی «هەڵەدن»، پەستەکی «بانە»، کڵاشی «هەورامان»، گیوەی «هەمەدان»، شاڵی «زاخۆ»، شەکرشکێنی «سولەیمانی»، مسی «زەنگان»، سەبیلی «سەقز»، جاوی «هەجیج»، بەڕەی «بیجار»، خنجەری «بانە»، هەسانی «دەری».

٣٩. لەو کوردەوارییە کە باران نابارێ هەندێ شتی سەیر ئەکرێ لە هەندێ شوێنا، دێنن ناوی «چل کەچەڵ» ئەنووسن ئەیکەن بەسەر لەقە دارێکەوە یا شوێنیکیترا هەڵیئەواسن تا باران ئەبارێ و ئاوی بارانەکە ئەیشواتەوە. لە هەندێ شوێنیترا سەیر ئەکەن کێ بە پێی ئەو شوێنە پیاوچاکە و بە پیاوێکی بە دین بەناوبانگە، خۆیانی لی مەڵاس ئەدەن و کتوپڕ ئەیگرن و ئەیخەنە حەوزەوە ئیتر باران ئەبارێ. لە هەندێ شوێنیترا منداڵان دێنن پارچە پەڕۆیەکی گەورە ئەبەستن بەسەر دارێکەوە و ئەیکەنە بەیداخ و پێی ئەڵێن «بووکە بارانێ»؛ یەکێکیان هەڵیئەگرێ و ئەوانیتر شوێنی ئەکەون و ڕوو ئەکەنەماڵان؛

هەر کە چوونە حەوشەکەوە هەموو بە جارێ ئەڵێن:

هـــــەناران و مـــــەناران     یاخــــوا داکاتــە بــاران<br>
بــا دەنگــێ بێتــە گوێمان     لــە گرمەگرمــی هــەوران

ئینجا کچە عازەبی ئەو ماڵە وەیا تازە بووك دێتە دەرەوە «دەرزی سنجاق»ێك ئەکا بە بەیداخەکەدا و تۆزێ ئاویش ئەپرژێنێتەوە سەر بەیداخەکە و شتێکیش ئەدەن بە مناڵەکان. ئەمانە بەم جۆرە بە ماڵەکانا ئەسووڕێنەوە تا بە تەواوی بەیداخەکە لە ئاوی پرژەی ماڵان تەڕ ئەبێ و وەکوو لە حەوزت هەڵکێشابێ وای لێ دێ. بە زۆرتر وەخت ئەم مناڵانە هێشتا بە تەواوی لە ئیشی خۆیان نابنەوە، دائەکاتە باران. لەبەر باران شپرزە ئەبن، یا هەموویان خۆیان ئەکوتنە شوێنێ؛ وەیا بڵاوەی لێ ئەکەن. پاشان کۆ ئەبنەوە دەرزییەکان لە بووکە بارانێکە ئەکەنەوە، کچە عازەب و ژنان هەریەکە ئەم دەرزییانەیان بە پارەیەکی زیاد بە نیازی مراز لێ ئەکڕن و بەم دەرزییانە ئەڵێن: «دەرزی مراز» و نرخێکی زۆری هەیە لە بەرچاویان.



# قسەی بەتوێکڵ

٤٠. کابرایەك مانگایەکی ئەبێ هەرچەندە ئەکەن دەستێکی نانێتە زەوی و هیچیشی نییە. ئەچن بە «شاسواری قازی خدروەیس» ئەڵێن. ئەویش ئەڵێ: بچن بیکەن بە تەقە و هەرا بە سەریا. کە وا ئەکەن، مانگاکە دەست ئەنێتە زەوی و ئەڕوا. لە شاسوار ئەپرسن ئەڵێن: ئەمە چی بوو؟ ئەویش ئەڵێ: ئەوە خەونی دیبوو.

٤١. «مەحمووی پیرەوەیسی یۆسۆجانی» شەوێك لە ماڵێکا میوان بوو. ژنی خانەخوێکە بایەکی لێ بەر بووەوە چەپۆکێکی کێشا بەسەر منداڵەکەیا وتی: «شکڵت خواتەوە! پیاو شەرمەزار ئەکەن». هیچ دەنگ نەبوو، نووستن.

شەوێ ژنەکە میزی هات، چوو نەیزانی لە ژوور سەری مەحمووی پیرە وەیسەوە خۆش میزەکەی کرد. مەحمووش لای وا بوو بزنە وتی: «یخ یخ، دوات بڕێ!». ژنەش وتی: «خاڵە مەحموو بزن نییە، منم وا خوا رووی ڕەش کردم». خاڵە مەحموویش وتی: «خوشکێ! خوا تۆی ڕووڕەش نەکردگە؛ خوا منی وە چەمەر کردگە. ئەگینە ئەبوایە لە هەورە تریشقەکەی ئێوارێدا پاشپارگێنم لێ بدایە». (پاش پارگێن: خەتێکە وەکوو خەتی جووت لە دەوری دەوارا لێئەدەن بۆ ئەوە کە باران باری ئاوەکە بەوێدا بڕوا و نەیەتە ناو دەوارەکە).

٤٢. کابرایەکی کورد بوو بە میوانی کابرایەکی‌تر. دنیا زستان بوو لە گوێئاگردانەکە دانیشتبوون ژنی خانەخوێیەکە پشتی لەمان بوو، کونێ بووبووە دەرپێکەی، لا ڕانی دیار بوو. مێردەکەی ویستی ئیشێکی وا بکا کە ژنەکەی خوّی داپۆشێ، ڕووی کردە میوانەکە و پێی وت: «ئیمساڵ خانووەکەم هەڵگێڕاوەتەوە نازانم تۆ پێت چۆنە؟».

لەو کاتەدا کە میوانەکە سەری بەرز کردەوە سەیری دەستەکەکان بکا مێردەکە کوڵەوەژێکی گەرم دانرا بوو لە ناکاو ژەندی بە ژنەکەوە بۆ ئەوە تۆزێ ببزوێتەوە و لەو بزووتنەوەدا خوّی داپۆشێ. ژنە لەبەر گەرمی کوڵەوەژەکە داچڵەکا و کتوپڕ بایەکی لێ بەر بووەوە، کابرای میوان سەیرێکی دەستەکەکانی کرد و وتی: «بەخوا برا هەر دەستت لێ نەدایە چاتر بوو».

٤٣. دوو کابرای کورد هەبوون یەکێکیان «ئازاد»ی ناو بوو، یەکێکیان «شێرزاد». هەردووکیان پاڵەوان و بەجەرگ بوون. بە سەپانی چوونە لای کابرایەکی‌تر. شەوێ ئەمان لەم دیو خەرمانەکەوە نوستبوون کابرای خاوەن خەرمانیش لەو دیوەوە. لە نیوەشەوا دز دێتە سەریان، کابرای خاوەن خەرمان بە ئاگا دێت و ناوێری دەنگ بکا دەست ئەکا بە وڕێنە کردن، لەبەر خوّیەوە ئەڵێ: «پارەم ببوایە ژنێکم بهێنایە، دوو کوڕم لێ ببوایە یەکێکم ناو بنایە ئازاد یەکێکی شێرزاد». کە ئەگاتە ئازاد و شێرزادەکە، بە قایمتر ئەیڵێت. ئازاد و شێرزاد لە خەوەکە ڕائەپەڕن و دزەکان ئەگرن.

٤٤. کەریم‌بەگی فەتاح‌بەگی جاف ئەچێتە بەغدا لە دووکانی ئەجزاچییەك ئەیەوێ خوّی بکێشێ، لەو کاتەدا ژنێك لەوێ ئەبێ ئەویش خوّی ئەکێشێ. کەریم‌بەگ کە چاوی پێ ئەکەوێ ژنەی

بەلاوە زۆر زل ئەبێ، لە زلیەکەی سەرسام ئەمێنێ. کتوپڕ شانی ئەگرێ ئەڵێ: «خوشکم، مەڕۆ بزانم کاممان زلترین؟» لە پاشا خۆی ئەکێشێ، کەچی ئەم زیاتر دەرئەچێ. دێت بەلای ژنەکەوە ـ ئەوا خەڵکێکی زۆریش لە خزمەتکار و خەڵکی‌تر لەوێ وەستاون ـ ئەڵێ: «ئەگەر زیادەکەی من بخرێتە تۆوە وەکوو یەك دەرئەچین». ژنەش دەست ئەکا بە پێکەنین و لێ ئەدا ئەڕوا.

٤٥. کابرایەکی کورد ماینێکی زۆر چاکی هەبوو؛ کابرا خۆی چووبوو بۆ کاروان، شەوێ دز هاتنە سەر ماڵەکەی بۆ ماینەکە، کەسیشی لە ماڵەوە نەبوو تەنها ژنەکەی نەبێ. ژن هەستی کرد وا دز دەورەی ماڵەکەیان داوە ڕووی کردە ماینەکە و پێی وت:

**ماینــە کــەوەی یەلخــوزە قــەزات بکەوێ لــەم کوزە**
**ئیمشەو نەتبا ئەو دزە**

دز مایینیان برد. کابرا هاتەوە و سەیری کرد ماین نەماوە؛ لە ژنەکەی پرسی. ئەویش پێی وت کە دز هاتن بردیان، بەڵام ئەتوانی بیدۆزیتەوە. وتی چۆن؟ وتی: پەستەیەکی وام وتووە بە ماینەکەدا هەستە بڕۆ بزانە لە چ شوێنێك ئەم پەستەیانە ئەوت لەوێیە.

کابرا چوو؛ لە پاش گەڕانێکی زۆر ڕێی کەوتە گوندێك سەیری کرد منداڵان ئەو پەستەیە ئەڵێن. لە منداڵێکی پرسی کە ئەمە لە کوێ فێر بووە؛ ئەویش وتی: فڵانە ماڵ چووبوون بۆ دزی، ماینێکیان هێنابووەوە. کە هاتنەوە ئەم پەستەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. ماڵەکەی لێ پرسی، ئەویش پێشانی دا. کە چووە ژوورەوە ماینەکەی بەرچاو کەوت، ڕاست نەوی لە جڵەوەکەی کێشایە دەرەوە و هێنایەوە.

٤٦. فەقیەشێتە هەبوو لەناو جافدا، ڕۆژێك ئەچێتە لای مەحمووپاشا. پاشا لێی ئەپرسێ: «ها فەقیەشێتە ئێستە چی ئەکەی؟» ئەویش ئەڵێ: «وەڵڵا پاشا! سەگ بە توولە ئەکەم». پاشاش ئەڵێ: فەقیەشێتە سەگ بە توولە مانای چییە؟ ئەڵێ: «پاشا! مانای چی، مانای چی؟ یانێ لە تۆی ئەسێنم و ئەیدەم بەو». پاشا دەست ئەکا بە پێکەنین.

٤٧. کوڕە مەلایەك هەبوو لە سولەیمانی، باوکی ئەینایە بەر هەر کار و فرمانێك سەقامگیر نەئەبوو. ڕۆژێ هەندێ لە فەقیەکانی باوکی ئامۆژگاری ئەکەن و بەسەریا دێن ئەڵێن: «تۆ تەماشای ئەوڕەحمانی برات کە بەو منداڵییە بزانە چەن زیرەك و گوێڕایەڵە». ئەویش تۆزێ ڕائەمێنێ و لە پاشا ئەڵێ: «ئم، ئم با ئەویش گەورە بێ بزانن چۆن وەکوو منی لێ دێت».

٤٨. کابرایەکی کورد بەڕۆژوو بوو؛ زۆری برسی بوو. تۆزێکی مابوو ڕۆژ ئاوا ببێ، بانگی ژنەکەی کرد وتی: خێراکە نانم بۆ بێنە با ڕۆژووەکەم بکەمەوە. ژنەکە وتی: پیاوەکە خۆ ڕۆژ هێشتا بەرزە، دوو گەزی ماوە، هەتا نوێژی شێوان نەبێ ڕۆژووی چی ئەکەیتەوە؟ ئەویش وتی: «کچێ، نانەکەم بۆ بێنە، خوا بەم هەزار گەزە ڕۆیوە منەتم لێ نەزانێ بەم دوو گەزەش هەر نایزانێ!».

٤٩. کابرایەکی کورد چووە لای مەلا وتی: قوربان کوێخاکەمان زۆرم زوڵم لێ ئەکا و ماڵم ئەخوا؛ نازانم خوا لە ڕۆژی قیامەتا هەقم چۆن ئەستێنێ؟ مەلاش وتی: برام، ئیسلام گەورەیە؛ ڕۆژی قیامەت خوا بە تۆ ئەڵێ: لەم پیاوە خۆش ببە قەسرەکەت چەند بێ

ئەوەندەیترت بۆ زیاد ئەکا. تۆش گەردنی ئازا ئەکەی و خواش ئەو ئەبەخشێ. کابرا وتی: «مامۆستا، کە خوا وتی: وەرە لێی خۆش ببە قەسرەکەت بۆ گەورە ئەکەم، ئەڵێم بینایی چاوان قەسرم ناوێ، تۆ کاولە ئاشێکم بدەرێ دوو بەشی دڵۆپە بێ، بەڵام من لەو سەگبابە خۆش نابم».

٥٠. یەکێك لە بەگزادەکانی «هەڵەدن» شەوێکی زستان خۆی و ڕەنجبەرێکی لە گوێئاگردانەکە بەرامبەر بە یەك دانیشتبوون. بەگ، ڕانکێکی دڕاوی لە پێدا ئەبێ، هەموو گەڵوگونی دیار ئەبێ. ڕوو ئەکاتە ڕەنجبەرەکە و ئەڵێ: ڕۆڵە ئیمساڵ بەخێر توتنێکی زۆر بکەین، ڕەزی سەرچاوەشمان ـ ئیشەڵڵا ـ ترێی زۆر ئەبێ، ئەیکەین بە مێوژ و دۆشاو. ئەچم لە کەرکووك هەمووی ئەفرۆشم، جوان ئەسپێکی چاك ئەکڕم و قامچی ڕەختێکی لێ ئەدەم. ڕەنجبەرەکەش ئەڵێ: «بەگم! من دوعا ئەکەم ئێستاکە خوا بیدا، قامچی دەرپێیەك بکەی بۆ قامچی ڕەخت، ئەوسا خوا گەورەیە».

٥١. «فەتاح ئەفەنی» ناوێك قازی بوو؛ بەڵام پیاوێکی گێل و بێئەقڵ بوو. خزمەتکارێکی هەبوو ناوی مام خدر بوو. وا ڕێ کەوت موتەسەڕف لێکەوت و قازی بوو بە وەکیل. ئێوارە ئەچێتەوە ماڵەوە بانگ ئەکا: «خدر، خدر! وەرە هەی کەری بێئەقڵ! تۆهەر بە منت ئەوت نابی بە هیچ، ئەوا لە قازێتی قەزاوە بووم بە قازی لیوا و ئەمڕۆش بووم بە وەکیلی موتەسەڕف».

مام خدریش وتی: «ئەفەنی! ئەگەر بەختت بەم جۆرە بێ، ئەبی بە قازی ولایەت و ئەبی بە وەکیلی والیش؛ وە دیسان من وتوومە تۆ نابی بە پیاو، خۆ نەموتووە نابی بە موتەسەڕف».

٥٢. پیاوێـك هەبوو لـە سولەیمانی، کـە ئیشـێك ئەهاتە پێشـەوە ئەیوت: «هەر سێ تەڵاقی خۆم و عەلی‌عیرفان کەوتبێ ئەم ئیشه وا نییه». پێیان ئەوت: تۆ چیت داوه بەسەر عەلی‌عیرفانەوە؟ بۆچ ئەیخەیتە پاڵ خۆت؟ ئەویش ئەیوت: «خۆم دەمێکە تەڵاقم نەماوە!».

٥٣. کابرایەکـی فەلا جووتیارێکی هەبوو؛ زۆر توورە و کەللەشـەق بوو. شەوێك لە زستانا چێشتی نیسکێنەیان خواردبوو، ئاغە و جووتیـار لـە بـەر ئاگرەکـە دانیشـتبوون. ئاغـە زۆر تینـووی بـوو نیسـکێنە جۆشی دابوو. نەیئەوێرا بە ڕاستی داوای ئاو بکات ئەیوت: «گۆزە ئاوەکە وا لـە هەیـوان؛ بەخـوا ڕەنگـە چـاك سـارد بووبـێ و ئێسـتا خواردنـەوەی خۆش بێ». جووتیارەکەش بە ناوچاوانێکی گرژ و بە توورەییەوە ئەیوت: «شەوەکەی ساردە؛ هەڵبەت ئەویش سارد ئەبێت».

ئاغـە وتـی: «ئـای نیسـکێنە چەند ئاو کێشـە». کابرا وتی: «سـەگباب خێوە، چاری هەر ئەوەیە پیاو کەمی لێ بخوا».

٥٤. کابرایـەك لەسـەر ئیشـێکی خـراپ گیرابـوو. شـاکر ئەفەنـدی ـ حاکمـی منفرد ـ لێـی پرسـی: تـۆ ئـەم ئیشـە خراپـە و بـێ مەعنایەت بۆچی کرد؟ کابرا وتی: «قوربان! شـەیتان پێـی کردم». شـاکر ئەفەندیش وتی: «مردووت مرێ! بۆچی ناڵێی خۆم کردم؛ شەیتان بێزی نەهات سوجدە بۆ ئادەم ببا، ئێستا دێت گەوادی بۆ قنگ هەڵپچڕاوێکی وەکوو تۆ ئەکات».

٥٥. جارێـك کابرایەکـی کورد لای ڕان ئەبێ و مێگەلەکەی ئەباتە گوێ چەمێك. پەڵەیەك هەرزن دیار ئەبێ، بەناو هەرزنەکەدا ئەیبا بۆ سـەر ئاوەکە. کابرای گۆرانی خاوەن هەرزن چاوی لێ ئەبێ، بە

هەڕاکردن دێت و ئەڵێ: برا بەولادا ڕانەکە بەرە. خوا هەڵناگرێ بۆچی بەناو هەرزنەکەدا ئەیبەی؟ کوردەش ئەڵێ: «گۆرانە گاڵت وە گوێزە».

٥٦. کابرایەکی کوردی کەم دەست ڕۆژێك میوانێکی هات، ئەویش هەڵسا بە هەرجۆرێ بوو پەنجاییەك برنج و پەنجاییەك ڕۆنی بە قەرز پەیدا کرد و هێنایەوە دای بە ژنەکەی بۆیان لێ بنێ. ژنە چوو بە جارێ هەموو ڕۆنەکەی کردە پەنجاییە برنجەکە و لێی نا بە چێشت. ئێوارە کە نانی دانا میوانەکە لەبەر شڵپەی ڕۆن دەستی نەگەیشتە برنجەکە زوو تێری خوارد و چووە دواوە. لە پاشا کە ڕۆیشت، پیاوەکە بە ژنەکەی وتی: «ئەرێ ژنەکە من بە هەزار ناری عەلی پەنجاییەك ڕۆنم قەرز کردبوو؛ تۆ بۆچی بە جارێ کردت بە چێشت؟» ژنە وتی: «بەخوا مێردەکە بۆ ڕووسووری تۆ وام کرد». کابرا وتی: «بەخوا من ئەمویست ڕووڕەشی لای خوایش بوومایە و تۆ ئەو هەموو ڕۆنەت بە فیڕۆ نەدایە».

٥٧. سێ چوار پیاو ئەبن بە میوانی ماڵێك. ژنەکە نانیان بۆ دروست ئەکا، مناڵێکی ئەبێ هەر نووکەنووك ئەکا و داوای چێشت ئەکا. دایکەکەی چەپۆکێك ئەکێشێ بە سەریا و ئەڵێ: «داکەوە باوانت شێوێ! لە میوانەکان خرابترت بەسەر هاتووە».

٥٨. کابرایەك چووە لای سەعاتچییەك سەعاتێکی لێ کڕی، بەڵام زۆر هەرزانی لێ کڕی. بە سەعاتچییەکەی وت: تۆ کە بەم نرخە هەرزانە سەعات بفرۆشی قازانجت لە کوێ ئەبێ؟ سەعاتچی وتی: «تۆ پیرۆزت بێ! سەعاتەکە بەرە. بە خێر وەختێ کە تێك چوو و شکا، ئەو وەختە قازانجەکەم دەست ئەکەوێ».

٥٩. حاجی‌برایم بەگی دەکە جاڕی دابوو بە ئاواییا هەرکە نوێژ نەکا مریشکێك جەریمەیەتی. کابرایەك هەبوو «قولی» ناو بوو، چەند مریشکێکی بوو دابووی بە جەریمەدا، هیچی بە دەستەوە نەمابوو. ئەچوو بۆ مزگەوت و نوێژی ئەکرد ئەیوت: «نیەتمە ئەم نوێژە ئەکەم بۆ حاجی برایم‌بەگ». ئەیانوت: کورە ئەوە بۆچ وا ئەڵێیت؟ ئەیوت: «براکەم، حاجی برایم‌بەگ تاڵانی کردم. من نوێژ ناکەم وە زۆر نوێژم پێ ئەکا؛ ئەمە نوێژی ئەوە. ئاخر من باوکم نوێژی کردگە، باپیرم نوێژی کردگە؟ من چی و نوێژ چی؟!».

٦٠. دەستەیەك فەقێ چوونە سەر کانییەك. سەیریان کرد چوار پێنج ژن بە ڕووتوقووتی خۆیان ئەششت. یەکێکیان گێڕایەوە وتی: یەکێ لە ژنەکان چاوی بە ئێمە کەوت بانگی ئەوانی‌تری کرد: کچێ! خۆتان داپۆشن ئەو پیاوانە هاتن. یەکێ لە ژنەکان بە ڕووتی هەڵسایە سەر پێ چاوی بە ئێمە کەوت. هیچ خۆی دانەپۆشی و خۆیشی تێك نەدا بە ژنەکەی‌تری وت: کەنی باوانت شێوێ! کوا پیاون، ئەمانە فەقێن».

٦١. جارێك «ئەحەی کرنوو» ڕێی ئەکەوێتە ئاوایی «سەرشاتە». پیرێژنێك بەرەنگاری ئەبێ و سەیری سەر و فەساڵی ئەکا و ئەڵێ: «بەقوربانت بم! وا دیارە تۆ حەکیمی. کۆکەیەکی بێ فەرمە بەڵکوو دەرمانێکم بەیتێ بۆ ئەم کۆکەیە». ئەویش هێنای تۆزێ زەنجەفیڵی وردی دایە، وتی بە کەفلەمە بیخۆ. دەستی برد کەڵەشاخێکیشی دەرهێنا ڕۆن گەرچەکی تێدا بوو، وتی: ئەمەش دەرمانێکی‌ترە، لەو وەختەدا کە کەفلەمەکە ئەخۆی تۆزێ لەمەش بە پەنجە ـ شەرع شەرمی بۆ نییە ـ لە قنگت هەڵسوو، ئیتر بە دوو سێ ڕۆژ چاك ئەبیتەوە. پیرێژن چوو

کەفلەمەکەی خوارد و ڕۆنەکەشی دا لە خۆی، کەچی کۆکەکەی زیاتر بوو. ئەمجارە بە دەمیشیەوە ئەترِیّ؛ بەڵام هەرکە ئەترِی ئەیوت: «ئەی وە ڕیش باوك حەکیمەکە».

٦٢. کابرایەکی کورد چووە سەر ڕووبارێك ویستی لێی بپەڕێتەوە نەیئەوێرا. گۆرانێك لەوێ ڕاوەستا بوو، پێی وت: برا ئەم ئاوە نامبا ئەگەر لێی بدەم؟ گۆرانەش وتی: «نەء». وتی: ئەگەر بردمی؟ وتی: ئەگەر بردتی تفێ بکە لە ڕیشم. کوردە دای لە ئاوەکە، ئاو ڕاپێچی دا. لەناو ئاوەکەدا خەریك بوو ئەخنکا و تفی ئەکرد لە ئاوەکە. گۆرانەکە لای وا بوو ئەمە تف لەم ئەکا، ڕووی تێکرد و پێی وت: «تفی خۆت بکە و برِۆ!».

٦٣. کابرایەکی سەید بێوەژنێکی هێنابوو، شەوێ چووە لای. تا کابرا کوتێکی بەوەوە ئەدا، بێوەژنەکە چوار کوتی بەمەوە ئەدا. کابرا پشتێنێکی سەوزی لە پشتا بوو، ڕووی کردە بێوەژنەکە و پێی وت: «دایکم بە نۆرە، خوشکم بە نۆرە؛ بیکە بە خاتری ئەم شاڵە سەوزە کە لە پشتمایە ئەگەر سەرم لێ تێك دەی؟».

٦٤. کابرایەك دوو کوڕی هەبوو، یەکێکیان ناوی «خلە» بوو ئەویتریان «بلە». خلە حیز و بلە زۆر ئازا بوو. هەتیو و مەتیو بە کابرایان ئەوت: خلەمان گاوە. ئەویش ئەیوت: «خۆیشم ئەتوانم خلە بگێم، ئێوە ئەگەر ئازان بلە بگێن».

٦٥. ژنێك دوو دۆستی هەبوو، یەکێکیان ناوی «جەبار» بوو یەکێکیان «عەباس». شەوێك ڕێکەوت هەردووکیان چوون بۆلای ژنە. کوتوپڕ لەو وەختەدا مێردەکەی هاتەوە. ژنە لە تاوانا شاردنیەوە.

لە پاشا لەگەڵ مێردەکەیا دەستی کرد بە وردە گلەیی و وتی: ئەوەم بۆ بکڕە و ئەوەم بۆ بێنە. هەر شتێکی ئەوت کابرا ئەیوت: «جەبار بیدا». جەبار لەولاوە لەناو ئاخوڕەکەدا سەری ڕاست کردەوە وتی: «گشتی ئەخەی بەسەر منا؛ ئەی عەباسە مل قەوی بۆچ شتێك نەسێنێت؟».

٦٦. جارێـك لـە ئاوایی «عەنبار» (عەنبار: گوندێکە لە موکریان) فەقێکان شـەوی جەژن ئەچنە لای مـەلا برایم ئاغای عەنبار بۆ ڕۆن و برنجی جەژن. ئەویش هیچیان ناداتێ. بە ناهومێدی ئەگەڕێنەوە و قسـەکە بـۆ مـەلا شـەفیعی مامۆستایان ـکـە مودەڕڕسی عەنبار بـوو- ئەگێڕنـەوە ئەویـش ئەڵـێ: «وا نابـێ. بچن پێـی بڵێن: ئاغا برنج و ڕۆنی جەژنمـان ئەدەیتـێ خۆمـان لێـی بنێیـن، یا خـود بێین لـە دیواخان نانی جـەژن بخۆیـن؟ ئیتر ئەو ڕێگەیەکی سێهەمی لا نییە، بـە دڵی خۆتان بەڕێتان ئەکا».

ئەمانیش ئەچن و دائەنیشن. ئاغا ئەڵێ: «ها، چییە دیسان بەرۆکتان گرتمەوە؟» ئەمانیش ئەڵێن: «ئاغا ئەوا سبەینێ جەژنە؛ گۆشت و ڕۆن و برنجمان ئەدەیتێ خۆمان لە حوجرە لێی بنێین یا خود بێین لە دیواخان نانـی جەژن بخۆیـن؟» ئاغاش ئەڵێ: «پەککوا! خۆ ڕێگەیەکی‌تر بۆ پیاو ناهێڵنـەوە». ئینجـا بـە تەوسێکەوە سـەیرێکیان ئـەکا و ئەڵـێ: «ها ها، کارەکـەر و خزمەتـکارم بـۆ ڕاگرتـوون. کارەکـەر و خزمەتـکار! بچن، بچن ڕۆن و برنج و کەڵەشێرێکیان بدەنێ با خۆیان لێی بنێن و قوزەڵقورتی کەن. لایان وایە من خزمەتکاری ئەوانم».

٦٧. کابرایەکـی خاوەن ماڵات لەگەڵ خەڕاتێك دەمەقاڵیان ئەبێ و بۆ شـەرعکردن ئەچنـە لای مەلایەك. مـەلا پێیـان ئەڵێ:

سبەینێ بێنەوە. تەورێکی دارشکاندنیان دەبێ، مەلا بە خەڕاتەکە ئەڵێ: وەستا کلکێکی جوانمان بۆ بخەرە ئەو تەورە. خەڕات ئەچێ بە دڵ و بە گیان کلك بۆ تەور دروست ئەکا و ئەیهێنێ، بەو نیازە کە مەلا سبەینێ چاوێکی لێوە بێ. بەڵام لە پێش هاتنی خەڕاتا کابرای خاوەن ماڵات مەنێك ڕۆن بۆ مەلا ئەهێنێ و ئەڵێ: مامۆستا ڕۆنی مانگا زەردە؛ زۆر خۆشە.

سبەینێ کە شەرعەکەیان ئەکا خەڕاتەکە ئەبینێ وا مەلا بەلای کابراکەیترا دایئەکێشێ. ئەڵێ: «مامۆستا کلکە تەورەکە باش بوو؟» مەلا ئەڵێ: «بڕۆ، خزمە مانگا ڕیا بە کلکە تەورتا».

٦٨. کابرایەکی پیری کورد دوو سێ کوڕی هەبوو. کوڕەکان ڕۆژێك دانیشتبوون قسەیان لە ڕێکخستنی ماڵ و ماڵاتیانەوە ئەکرد و ئەیانوت: ئەمە بکەین و ئەوە بکەین؛ کەرێکی شینیشیان هەبوو. یەکێکیان وتی: کەرەشینیش بفرۆشین بیدەین بە ژنێك بۆ باوکمان. باوکەکەیان لەولاوە لەم قسەیە گوێیەکی قوت کردەوە، لە پاشا قسەکەیان گۆڕی و هەر نەچوونەوە سەری. ئینجا باوکە هەڵیدایە وتی: «ڕۆڵە! لابەن قسە لە چییەوە ئەکەن؟ قسە لە کەرەشینەوە بکەن».

٦٩. کابرایەکی کورد عەلەی ناو ئەبێ، لەگەڵ کابرایەکی گاڵتەچی شاری ئەچنە مزگەوت. کابرا بە کوردە ئەڵێ: هەرچی مەلا کردی ئێمەش ئەوە ئەکەین. کە ئەچنە نوێژەوە کابرای کورد لە پشت مەلاوە ئەوەستێ و کابرای شاریش لە سەفی دووهەما لە پشت کوردەوە ئەوەستێ. کە ئەچنە «سجدە»، کابرای شاری دەست ئەبا گونی عەلە ئەگرێ، عەلەش لای وا ئەبێ نوێژ ئاوایە. ئەویش دەست ئەبا گونی

مەلا ئەگرێ. مەلا تۆزێ بە دەنگی بەرز ئەڵێ: «سُبحانَ رَبِّيَ الأعلى» کابرای شاری تۆزێ گونی عەلە ئەگوشێ. عەلەش گونی مەلا ئەگوشێ و مەلا تەنگەتاو ئەبێ و بە قایم و بە جیڕی ئەڵێ: «سُبحانَ رَبِّيَ الأعلى». عەلەش ئەڵێ: «عەلە و مەلەی نەگەرەکە وەو شێخ کەریمە تا گونم بەر نەدەن گونت بەر نادەم».

٧٠. دوو ئاغا پێکەوە قاوڵتی ئەکەن، یەکێکیان دەنکێ برنج بە ڕیشیەوە ئەمێنێتەوە. خزمەتکارێکی ئاقڵی ئەبێ دەرفەتی دەست ناکەوێ کە ئاغا تێبگەیێنێ. ئینجا هەر لە دیواخانەکەدا ڕووی تێ ئەکا و ئەڵێ: «ئاغە! ئاسکێ لە چیمەنەکەتا ئەلەوەڕێ ئەمر بکە بە پێنج کەس بچن دەری‌کەن». ئاغە دەستبەجێ تێ ئەگا و دەست ئەبا بە هەر پێنج پەنجەی دەنکە برنجەکە دەرئەهێنێ و فڕێی ئەدا.

ئاغەکەی‌تر کە دێتەوە ماڵەوە ئەچێتە ئەدەبخانە و بە خزمەتکارەکەی خۆی ئەڵێ ئا بچۆ مەسینەیەکم بۆ بێنە. کابرا مەسینەکەی بۆ ئەبا و ئاغەکەی پێی ئەڵێ: ئاگات لێبوو خزمەتکاری خەڵکی چلۆن ئاقڵانە ئاغەی خۆیان تێ ئەگەیەنن بۆ ئەو دەنکە برنجە کە لە ڕیشیا مابووەوە؟ دەسا تۆیش بزانم ئەتوانی ئاقڵییەکی وا بنوێنی؟ خزمەتکار ئەڵێ: بمبینە.

بە هیوای ئەوە نۆکەرەکەی قسەیەکی ئاقڵانە بکات، دەنکێ برنج بە ڕیشی خۆیەوە قایم ئەکات. خزمەتکارەکە چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ: ئاغە، ئاغە! ئەوی سەر پێشاوەکە وا بە ڕیشتەوە!».

٧١. کابرایەکی بانەیی هەبوو گوڵمحەمەدی ناو بوو؛ ئازا و نەترس بوو. هەموو جارێك بە تەنها کاروانی لە بانەوە ئەبرد بۆ سەقز و لە سەقزەوە کاروانی ئەهێنایەوە بۆ بانە. جەردە نەیائەتوانی بچنە سەر

ڕێی. ڕۆژێك چوار هەتیو تەگبیری لێ ئەکەن ئەڵێن نە ئێمە ئەو بکوژین و نە ئەو یەکێ لە ئێمە بکوژێ، بە فێڵ ڕووتی بکەینەوە.

هەڵئەستن لە «کەلی خان» لەسەر ڕێگەکەیا بۆی دائەنیشن. وەختێ لە دوورەوە قەرانتووی دەرئەکەوێ هەر چواریان تفەنگەکانی خۆیان ئەشارنەوە و ئەبن بە دوو دەستەوە و بە درۆ دەست ئەکەن بە جنێودان بە یەکتری و لە پاشا بە زللە و مستەکۆڵە لە سەروگوێلاکی یەك بەر ئەبن. گوڵمحەمەد کە ئەبینێ دەست ئەکا بە جنێو پێدانیان، ئەڵێ: هەتیو شەڕ مەکەن لێتان ئەدەم و لوولە تفەنگێ لە بن دەستی یەکێکیان ئەسرەوێنێ. کوتوپڕ یەکێ لوولە تفەنگەکە و یەکێ جڵەوی ئەسپەکەی و دوانیشیان هەر یەکێ قۆڵێکی ئەگرن و دائەبەزێنن پاکوپوختە ڕووتوقووتی ئەکەنەوە. ئیتر گوڵمحەمەد وەکوو شەلی شوانانگاو دێتەوە. لێی ئەپرسن: خۆ تۆ کەس نەیئەتوانی بێتە ڕێت، ئەم جارە بۆچی ئەمەت بەسەر هات؟ وتی: «فلانی هەرکەسێ پیاوەتی لە کەلی خان بکات وەهای بەسەر دێ».

**٧٢.** کابرایەکی کورد ڕێی ئەکەوێتە ماڵی پیاوێکی شینکی. برسی ئەبێ داوای نان ئەکا. خانەخوێ سێ چوار نان و جامێ دۆشاوی بۆ دائەنێ. میوان تەماشا ئەکا نانەکە هەرزنە و زۆر ڕەقە؛ دۆشاوەکەش ڕۆنە، هەرچەن ئەیکا بە دۆشاوەکەدا شتێکی وای پێوە نابێ. ناچار نانەکە لە دەستیا ورد ئەکا ئەیکاتە دەمیەوە و جامە دۆشاوەکە ئەنێ بە سەریەوە قومی زل زلی لێ ئەدا. کابرای خانەخوێ وتی: «خزمە چلۆن نان و دۆشاو وا ئەخورێ؟ ئەبێ نانەکە لە دۆشاوەکە هەڵکێشی و بیخۆی». میوانەکەش وتی: «قوربان! ئەم نانە ڕەقە و ئەم دۆشاوە شلە تۆ بۆ منت داناوە بیکەم بە قوزەڵقورتم، ئەبێ بەم جۆرە بخورێ».

**٧٣.** کابرایەکی پاك و تەمیزی سنەیی ڕۆژێك بە پیادە بە ڕێگادا ئەڕوا و ئەگاتە قەراخ ئاوی قشلاخ، ئەڵێ: من نادەم لەم رووبارە؛ جلەکانم تەڕ ناکەم. کەسێك بێ ولاغێکم بۆ بێنێ سواری ببم یا خود بمکاتە کۆڵی بمباتە ئەو بەر، چەندی پارە بوێ ئەیدەمێ. کابرایەکی «نایسەر»ی لەوێ ئەبێ ئەڵێ: دوو قڕانم بدەرێ من بە کۆڵ ئەتپەڕێنمەوە. کابرا دوو قڕانەکەی ئەداتێ و سواری کۆڵی ئەبێ. کابرای نایسەری لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا خۆی ئەدا بە زەویدا، هەموو لەشی ئەو هەژارە تەڕ ئەبێ. بەم جۆرە ئەچنە ئەو بەرەوە.

سنەییەکە ئەڵێ: خوا بتگرێ من بۆیە پارەم دا بە تۆ کە جلەکانم تەڕ نەبێ؛ تۆ بۆچی وات کرد؟ کابرا ئەڵێ: «وەڵلا قوربان! من بە منالی شیری گامێشم خواردووە. بە دەست خۆم نییە لێم بووە بە خوو، هەرچەن بچمە ناو ئاو ئەبێ بنووم». سنەییەکەش ئەڵێ: «بەخوا فلانی، جلەکانی من وشك ئەبێتەوە؛ بەڵام ئاخری تۆ بەم خووە ئەچی».

**٧٤.** کابرایەکی شارەزووری لە ئاشنایەکی بازرگانی سولەیمانی هەندێ کووتاڵی لێ کڕی کە پاییز وەختی حاسڵات پارەکەی بداتێ. بازرگان دەفتەری گرت وتی: «دە گەز بلووری، هەر گەزی بە دوو قڕانە؛ تۆ بڵێ دوو قڕان و نیو ئەمە ٢٥ قڕان. بیست گەز چیت، هەرگەزێك بە تارانییەك، تۆ بڵێ بە ڕیاڵێك ئەمە هەمووی کردیە ٢٥ تارانی. مەرحەمەیەك نرخی دوو قڕانە، تۆ بڵێ دوو قڕان و نیو، فیستێکی ژنانە بایی سێ قڕانە، تۆ بڵێ سی و نیو. کەوایەکی شەیتان بێزی بە هەقی دروون و هەموو شتێکەوە ئەکاتە سیانزە قڕان، تۆ بڵێ پانزە. جووتێ کەوش و جووتێ کلاش، هەقەکەی نۆ قڕانە، تۆ بڵێ دە قڕان قەیناکا».

ئەمانەی لە دەفتەرەکە نووسی و ئینجا وتی: «عەزیزم، تۆ مەڵێ خاترم ناگرێ؛ دووکان دووکانی خۆتە، بەڵام شتێك هەیە من قەرزاری خەڵکم و تۆش هەتا سێ مانگیکە پارەم نادەیتێ، هەشت قڕان با قازانجی بێ».
ئەویش نووسرا.

پاشان وتی: «ڕۆحەکەم! خۆ تۆ لە سایەی خواوە خاوەن خەرمان و بەرەجووتی، کە خەرمان هەڵئەگری بایی دە، پانزە تارانی هەر خەرمانلۆغە بە خەڵکی ئەدەی، با هەشت تارانیش خەرمانلۆغە بێ، ئەویش نووسرا و ئینجا بە کابرای وت: هەروەکوو عەرزم کردی دووکان دووکانی خۆتە، هەر شتێکت پێویست بوو ئەوانە هەیە. کابراش کەلوپەلی خۆی پێچایەوە و گەلێ ماڵاواییشی لێ کرد و ڕۆیشت.

**٧٥.** مەلایەك لە دێیەك ڕۆژێ حەدیسی ئەخوێندەوە فەرمووی: «هەرکەسێ قڕانێك لە ڕێی خوادا بدا، خوای "تَبارَك و تَعالی" دە قڕانی ئەداتەوە». کابرایەك گوێی لەم وەعزە بوو وتی: «من بیست سەر بزنم هەیە، وا چاکە بیفرۆشم و پارەکەی بکەم بە خێر بەڵکوو پارەیەکی زۆرم دەست بکەوێ». هەڵسا بزنەکانی پێش خۆی دا بردنیە شار فرۆشتنی دای بە پانزە لیرە. چواردە لیرەی دا بە هەژار و فەقیر. لیرەیەکیشی بۆ خەرجی خۆی گلدایەوە. پێنج شەش ڕۆژ سووڕایەوە هیچی دەست نەکەوت.

هات چووە مزگەوتێك لە ئەدەبخانەکە دەستی بە ئاو ئەگەیاند خەیاڵ بردیەوە وتی: «سەیرکە ئەم مەلایە چۆن تەفرەی منی دا و چی پێ کردم؟ هاتم بە قسەی ئەو هەرچێکم هەبوو لە ناوم دا و ئەوا ئێستە لە قڕانێ زیاتر هیچم پێ نەماوە. خستمیە سەر ساجی عەلی. شەرت بێ کە چوومەوە هیچ نەکەم تا مەلا ئەکوژم، چونکە منی ماڵوێران کرد».

لەو کاتەدا قڕانییەکەش لە باخەڵی دەرپەڕی کەوتە عابخانەکەوە. وتی: خۆ من هیچم پێ نییە بیدەم بە نان پێی بڕۆمەوە؛ جلەکانی داکەند و خۆی خستە عابخانەکەوە بەڵکە قڕانیەکە دەربێنێ. عابخانەکە قووڵ بوو، نوقم بوو، سێ قوم گواو چووە دەمیەوە قووتی دا. کە دەستی گێڕا پریاسکەیەکی بەردەست کەوت؛ دەری هێنا و سەرکەوتە سەرێ. چووە وسڵخانەکە لەشی خۆی شت و جلەکانی لە بەر کردەوە و پریاسکەی کردەوە، سەیری کرد سەدوچل لیرەی تیایە. ئیتر دەستبەجێ ملی ڕێگای گرت و هاتەوە.

ڕۆژێك کە دیسان مەلا وەعزی ئەدا فەرمووی: «هەرکەسێ قڕانێك لە ڕێی خوادا بدا خوا دە قڕانی پێ ئەدا». کابرا هەڵیدایە وتی: «مامۆستا تۆ کە حەدیس ئەخوێنی بە تەواوی بیخوێنە، لێی کورت مەکەرەوە». مەلا پرسی چلۆن؟ وتی: «ئەوەش بڵێ هەتا سێ قومیش گواو نەخواتەوە خوا نایداتێ!».

**٧٦.** لەو وڵاتە تازە ئەو پۆلیسانە داهاتبوون کە پێیان ئەڵێن: «پۆلیسی غەیرە نیزامی». دەستەیەك لەمانە لەو شاخەی پشتی پێنجوێندا بەشوێن چەتەدا ئەسووڕێنەوە، دوو کوڕی جاف تووشی ئەمانە ئەبن. یەکێکیان بەو یەکەیان ئەڵێ: ئەرێ برا ئەمانە چین؟ ئەڵێ: «برا بێژم چی؟ ئەگەر بێژم پۆلیسن، پۆلیس نین. ئەمە ڕەنگبێ ئەوانە بوون کە پێیان بێژن پۆلیسی غەیرە نیزامی». ئەڵێ: برا پۆلیسی غەیرە نیزامی یانێ چی؟ ئەڵێ: کوڕە یانی وەکوو ڕەییفی زەمانی عوسمانی. ئەڵێ: «ها ڕەییف! دەسا برا ئەم دەور و دووکانەش دووی دا لەمە. چاوت لێ وو عوسمانیش هەر کە کەوتە ڕەییف گرتن چۆن یەکێکی دا لەمە؟».

**٧٧.** مەلایەك هەبوو لە سولەیمانی ـ بە ڕەحمەت بێ!ـ بزەنیی ئەم مەلایە ناوبانگی دەرکردبوو. دوو ژنی هەبوو، لەگەڵ شتی‌تریش هەموو بە دەستیەوە هەراسانیان پێ هەڵگیرابوو. مەلا لەم دوا دواییەدا چاوەکانی کز بووبوو؛ هاتوچۆی لای حەکیمی ئەکرد بۆی. حەکیم ڕۆژێك پێی وت: مەلا تۆزی خۆت لە ئیشی شەرعی بگرەوە. وتی: «حەکیم ئەفەنی ناتوانم». وتی: کە ناتوانی هاتوچۆی لای منیش مەکە؛ چونکە من تا تۆ ئەوە ئیشت بێ چاوتم پێ چاك ناکرێتەوە.

چووە لای حەکیمێکی‌تر، هەموو وایان پێ وت. تەنانەت حەکیمێك پێی وت: دە ڕۆژ واز بێنە من چاکت ئەکەمەوە. وتی: ناتوانم. وتی حەفتەیەك. وتی ناتوانم؛ وتی: حەکیم ئەفەنی ئەمانەی پێ ناوێ یەك سەعات ناتوانم ئەو ئیشە نەکەم. حەکیم وتی: کەواتە بڕۆ چاوی تۆ بە من چاك ناکرێتەوە. زۆری پێ‌نەچوو مەلا کوێر بوو؛ ئینجا ئەیوت: «ئۆخەی وا کوێر بووم، ئیتر جارێکی‌کە پێم ناڵێن گان مەکە».

**٧٨.** کابرایەکی حەکیم هەبوو کوڕێکی هەبوو فێری پزیشکی ئەکرد، بۆ ئەوە ئەگەر جارجار بهاتنایە بە شوێنیا بۆ سەر نەخۆش، خۆی پیر بوو کوڕەکەی بناردایە. ڕۆژێك هاتن بە شوێنیا بۆ ئەوەی بچێت بۆ سەر نەخۆشێك. کابرا کوڕەکەی نارد. کوڕ کە چوو هیچی لە نەخۆشی نەخۆشەکە نەئەزانی هەر ئەوەندە نەبێ وتی: ئەمە دەروونی ئەگرێ، ئاوی ساردی بدەنێ با بخواتەوە. هێنایان ئاویان دا بە نەخۆش؛ هەر دایانێ و خواردیەوە نەخۆش وەڕس بوو، وتی: بۆ خاتری خوا چیم لێ ئەکەن؟ ئەم هەموو ئاوە چییە؟ من ناتوانم.

کوڕە حەکیم وتی: ئێوە بە گوێی ئەو مەکەن بیدەنێ. ئینجا بە زۆر

ئەیانکرد بە گەروویا. نەخۆشی قوڕبەسەر هەناسەی لێ بڕا، ئیتر جێگە نەمایەوە ئاوی تێ‌کەن. کوڕە حەکیم وتی: ئەوە بۆچی نایدەنێ؟ وتیان: ورگی پڕ بوو جێگە نەماوەتەوە. وتی: بۆچ من حەکیمم یان ئێوە؟ بێنن لە خوارەوە دەستووری کەن بە ئاوی سارد. دەستیان کرد بە دەستوورکردنی. کوتوپڕ ئەوەندەیان زانی شەقەیەك لە ورگی کابراوە هات. کە سەیریان کرد وا ورگی شەقی برد و ئاو بەو ناوەدا فیچقەی کرد.

کابرای نەخۆش بە ئاو مرد و کوڕە حەکیم هاتەوە بۆلای باوکی کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە. باوکی وتی: ئاخر تۆ بۆچی وات کرد؟ وتی: بابە! هیچم لێ نەزانی؛ لە ئاو بێ مزەڕەتترم نەدۆزییەوە بۆی، ئاویش ئەو کەتنەی کرد. ئینجا باوکی وتی: «ڕۆڵە! تۆ کە ئەچیتە سەر نەخۆشێك هەر کە چوویتە حەوشەکەیانەوە لە پێشا چاوەچاو بکە بزانە چی کەوتووە: پەڕە مریشك، توێکڵە هێلکە، توێکڵە شووتی، چی کەوتووە. کە چوویتە سەری و نەبزت گرت بڵێ: ئەم نەخۆشە ئەو شتەی خواردووە بۆیە نەخۆش کەوتووە؛ جارێ هیچی مەدەنێ هەتا ئێوارێ خۆم دێمەوە، بۆ ئەوەی ئەو شتە هەزم بکا؛ ئەو وەختە دەرمانی ئەدەمێ. ئەوسا کە هاتیتەوە شتەکە بۆ من بگێڕەوە من دەرمانەکەت پێ ئەڵێم و کە چوویتەوە ئەیدەیتێ. ئیتر ئەمەیە حەکیمی. وتی: «باشە بابە».

ڕۆژی دوایی لە ماڵێکی گەورەوە هاتن بە شوێن حەکیمەکەدا بۆ سەر نەخۆشێك. حەکیمیش کوڕەکەی نارد و پێی وت: ئامۆژگارییەکەت لەبیر نەچێتەوە. کوڕەکە چوو؛ چووە حەوشەوە چاوە چاوی کرد شتێکی وای بەرچاو نەکەوت، تەنها کورتانە کەرێك نەبێ کە دانرابوو. چووە سەرەوە نەبزی نەخۆشەکەی گرت و وتی: «ها، ئەمە گۆشتی کەری خواردووە بۆیە نەخۆش کەوتووە. هەتا ئێوارە هیچی مەدەنێ با گۆشتەکە

هەزم کا ئەو وەختە خۆم دێمەوە دەرمانی ئەدەمێ». ئیتر هەڵسا و هاتەوە بۆلای باوکی.

ئەهلی ماڵەکەش هەموو لەم حەکیمییە سەریان سڕ ما. بە باوکی وت: «بابە ئەو نەخۆشە گۆشتی کەری خواردبوو، بۆیە نەخۆش کەوتبوو. جا تۆش دەرمانەکەی بۆ بڵێ». باوکی وتی: چلۆن؟ وتی: بابە هەرچەن چاوەچاوم کرد هیچم بەرچاو نەکەوت؛ نە توێکڵە شووتی، نە هەنار، نە هێلکە، تەنها کورتانە کەرێ دانرا بوو. دیارە ئەوە گۆشتی کەری خواردووە بۆیە ئەو کورتانە لەوێ کەوتبوو. ئینجا باوکی وتی: «بە خێر بێیتەوە ڕۆڵە! ئێوارە کە چوویتەوە بۆ سەری بڵێ: دەرمانی ئەو کەسە کە گۆشتی کەر بخوا ئەوەیە مێشکی پیاوی کەری دەرخوارد بدرێ، ئەو وەختە چاك ئەبێتەوە».

٧٩. جارێـك کابرایەکی کـورد ڕووەو قیبلـە میزی ئەکـرد. مەلایەك چـاوی پـێ کـەوت، وتـی: بـرا چۆن ڕووەو قیبلە میـز ئەکەی، ئاخر نازانی حەرامە؟ کابرا پشتی کردە قیبلەوە دەستی کرد بە میز کردن. مەلا وتی: برا ئەوە چۆن پشت ئەکەیتە قیبلەوە میز ئەکەی؟ ئینجا ڕووی کردە خۆرەڵات. مەلا دیسان وتی: برا نازانی حەرامە پیاو ڕووەو خۆرەڵات میز بکا؟ کابرا ڕووی کردە خۆرنشین. مەلا وتی: ئای ئەوە چۆن ڕوو ئەکەیتە خۆرنشین و میز ئەکەی؟ کابرای قوڕبەسەر میزی لێ بوو بە قوزەڵقورت. ئینجا سـەری کێری گرت و بە دەوری خۆیا ئەسووڕایەوە و میزی ئەکرد و ئەیوت: «خوا سەر لەو کەسە بشێوێنێ کە سەری لێ شێواندم».

٨٠. کابرایـەك لەگـەڵ کاروان چووبـوو بۆ سـنە. لـە بازاڕ تووشـی ناسـیاوێکی هـات، وتـی: ئێـوارە بـۆ نان خـواردن وەرە بـۆ ماڵـی ئێمە. ئێوارە کابرا هەڵسا بچێ بۆ ماڵەکە، لە ڕێگا تووشی هاوڕێیەکی بوو

وتی: بۆ کوێ ئەچی؟ وتی: ئەچم بۆ ماڵی فلانکەس. وتی: پیاوی چاك بە ئەمنیش لەگەڵ خۆت بەرە. وتی: باوکم ئەو پیاوە هەر خۆمی بانگ کردووە تۆ بیەم بڵێم چی؟ وتی: بڵێ برامە.

لێیان دا ڕۆیشتن؛ لە ڕێگەدا تووشی ناسیاوێکی‌تر هاتن. پرسی: بۆ کوێ ئەچن؟ کابرا وتی: فلانکەس منی بانگ کردووە ئەچم بۆ ئەوێ. پرسی ئەی ئەمە چییە لەگەڵت؟ وتی: وەڵلا ئەڵێ منیش بەرە و بڵێ برامە. کابرا وتی: کەواتە منیش دێم با بڕۆین. لەوێ بڵێ کوڕمە. چارناچار لێیان دا ڕۆیشتن. دیسان لە ڕێگا تووشی یەکێکی‌تر هاتن. پرسی: خێرە وا یەکتان گرتووە؟ وتی: وەڵلا! من لە ماڵی فلانکەس بانگ کراوم؛ ئێستە وا ئەمانەش هاتوون هەریەکە ناوێکیان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە. وتی: «یاڵڵا! با بڕۆین منیش دێم». کابرا وتی: باوکم ئەوا ئەمە کوڕمە و ئەمەش برامە و تۆ بکەم بە چی؟ وتی: بڕۆین خاوەن ماڵەکە خۆی ناوم بۆ ئەدۆزێتەوە. هەر چواریان چوون.

خانەخۆی وتی: ئەرێ برا من هەر تۆم بانگ کردبوو ئەمانە چین لەگەڵت؟ وتی: لێیان بپرسە خۆیان پێت ئەڵێن. ڕووی کردە یەکێکیان وتی: برا تۆ چیت؟ وتی: من برایم، لەوی‌تریانی پرسی: ئەی تۆ چیت؟ وتی: قوربان منیش کوڕیم. کابرا ئیتر ورگی ئاوسا پێی هەڵنەگیرا ڕووی کردە ئەوی ئاخر وتی: «ئەی کەرانباوگاو تۆ چیت؟ گوو خۆریت؟» کابرا ڕووی کردە هاوڕێکانی وتی: «نەموت خۆی ناوم بۆ ئەدۆزێتەوە».

**٨١.** لە قسەی گوێ‌ئاگردانی کوردانە ئەڵێ: دنیا زستان بوو؛ بەفر لە زەویدا بوو. ڕێوییەك و ورچێك هەریەکە سێ بەچکەیان هەبوو؛ بوون بە دەستە برا و چوونە ئەشکەوتێکەوە بەو نیازە تا زستان

ئەڕوا ببن بە یەك ماڵ. ورچە هەموو ڕۆژێك ئەچووە دەرەوە شتێکی پەیدا ئەکرد ئەیهێنایەوە خۆی و بەچکەکانی ئەیانخوارد؛ ڕێوی لەبەر بەفر دەر و دەشتی پێ نەئەکرا خۆی و بەچکەکانی لە برسا لات کەوتبوون. ڕۆژێك ورچە لە ماڵ نەبوو ڕێوی برسیەتی زۆری بۆ هێنا، چوو یەکێ لە بەچکەکانی ورچەی هێنا خۆی و بەچکەکانی خواردیان و دەم و لێوی خۆیان سڕییەوە. ئێوارە ورچەکە هاتەوە، ڕێوی بە نووکەنووك چووە پێشوازیەوە وتی: «یەکێ لە بەچکەکانمان نەماوە». ورچەکە هاتەوە سەیری کرد لە بەچکەکانی ئەوە؛ دەستی کرد بە بۆڕەبۆڕ و گریان؛ ڕێویش لەگەڵیا.

زەمانێکی‌تری پێ چوو، ورچە لە ماڵ نەبوو، ڕێوییەکە چوو یەکێکی‌تر لە بەچکەکانی هێنا و خۆی و بەچکەکانی خواردیان و دەم و لەوسی خۆیان سڕییەوە. ئێوارە کە ورچە هاتەوە، ڕێوی بە نووزەنووز چوو بە پیریەوە و وتی: «یەکێ لە بەچکەکانمان دیسان نەماوە». ورچە وتی: «لە هینەکانی من یا هینەکانی تۆ؟» وتی: «نازانم؛ ئەوەندە ئەزانم لە سەرزلە خڕەکان نەماوە». ورچەکە هات و تەماشای کرد لە بەچکەکانی ئەوە، دیسان خۆی نایە قوڕ و کەوتەوە بۆڕەبۆڕ؛ ڕێویش لەگەڵیا.

دوو بەشی زستان ڕۆیشت، دیسانەوە ڕۆژێك ورچە لە ماڵ نەبوو ڕێوی چوو تاقە بەچکە ورچێك مابوو، ئەویشی هێنا لەگەڵ بەچکەکانی خۆیا شەقوپەقیان کرد خواردیان و دەم و لێوی خۆیان سڕییەوە. ئێوارە کە ورچە هاتەوە ڕێوی خۆی نایە قوڕ و هەر لە دورەوە بە گریان و باوکەڕۆ ڕووی کردە ورچە. ورچە پرسی: ئەوە چییە؟ وتی: «بەخوا ئاغە، دیسان دانەیەکی‌تر لە بەچکەکانمان نەماوە». ورچە وتی: «لە هینەکانی من یا هینەکانی تۆ؟»

ئەوا ئیتر بەهاریش هات و دنیا ڕەشایی تێ‌کەوت. ڕێوی خۆی تووڕە

کرد و وتی: «بێ‌قەزا بی! من ئەم زستانە هیچ دەنگم نەکردووە و هەر دامە سك. ئەم من من و تۆ تۆیە چییە ئەیکەی؟ بڵێ بەچکەکانمان، ئیتر ئەمە چییە؟ تازە جارێکی‌کە من ئەم هاوڕێتی و یەك ماڵییە ناکەم، بە دوعا...». ئەمەی وت و لەگەڵ بەچکەکانی خۆیا خۆیان دەرباز کرد.

٨٢. مەلایەك لە دێیەکا وەکوو عادەتی کوردەواری ڕۆژی جەژن بوو لەگەڵ ئەهلی جەماعەتەکەی چوونە جەژنە پیرۆزەی ماڵەکان. ئەچوونە هەر ماڵێك ئەبوا شتێکیان هەر بخواردایە. مەلا ئەوەندەی خواردبوو لە پێ کەوتبوو. گوێدرێژێکیان هێنا سواری بوو کەوتە پێشیان. ماڵی پیرێژنێك لە خواری ئاواییەوە مابوو، چوونە ئەوێش. مەلا وتی: دانەنیشین؛ هەر بەسەر پێوە جەژنەپیرۆزەی لێ ئەکەین و ئەگەڕێینەوە. کە چوون ئیتر نە ئەو دابەزی نە خەڵکەکەش دانیشتن هەر لەبەر قاپییەکەوە جەژنەپیرۆزەیان کرد و بەرەو دوا بوونەوە. پیرێژن هاتە دەرەوە وتی: لە دەورتان گەڕێم! ئاخر دانیشن پارووە نانێك بخۆن. خەڵکەکە وتیان: ناخۆین، ناتوانین. مەلا پرسی: چیتان هەیە؟ پیرێژن وتی: «لە دەورت گەڕێم! شیرەوایە». مەلا وتی: «کەواتە سەری کەرەکە بسووڕێننەوە سووکە».

٨٣. ئەڵێ: سێ کابرای کورد هەبوون یەکێکیان چڵمن، یەکێکیان کەچەڵ، یەکێکیان شەل. هاتن گرەویان کرد کە تا سەعاتێك نە چڵمنەکە لووتی بسڕێت، نە کەچەڵەکە سەری بخورێنێ، نە شەلەکەش قاچی ببزوێنێ. چڵمن لە پاش تۆزێك ئاگری تێ‌بەربوو لەبەر چڵم؛ وتی: «باوکم - بەڕەحمەت بێ! - تیرەندازێکی زۆر زۆر دەست ڕاست بوو. تیری بۆ هەر شتێك بهاویشتایە سەری نەئەکرد». ئینجا هێنای دەستی چەپی

درێژ کردەوە و دەستی ڕاستی بە بەر لووتیا بردەوە بۆلای دەستی چەپ، خێرا خێرا ئەیهێنا و ئەیبرد؛ ئەیوت ئاواش تیرەکەی ئەهاویشت. بەو فێڵە خورووی لووتی خۆی دامرکانەوە. کەچەڵەکەش وتی: «بە خوا برا دنیا دەوران دەورانە ـ هەردوو دەستی خۆی توند برد بۆ سەری خۆی و کڵاوەکەی گرت و هەر لە سەریا خێرا خێرا ئەیسووڕاندەوە ـ باوکی ڕەحمەتیت ڕۆیشت، ئێستە تۆ بەم سەروگوێلاکەوە لە شوێنێ بەجێ ماوی». ئەویش بەم جۆرە خورووی سەری خۆی شکاند. کابرای شەلەش کە ئەمەی چاوپێکەوت، قاچەکەی بەرز کردەوە و وتی: «پیاوی درۆزن، ئەم قاچەم بە قنگی! کەی وا بوو؟»

٨٤. لەو کوردەوارییە فەقێیەك ئەچێتە گوندێك ئەبێ بە میوانی ماڵی مەلا. مەلا خۆی لە ماڵەوە نابێ. مەلاژن ڕایەخی بۆ ڕائەخا و نانی بۆ دائەنێ و بەخێرهاتنێکی جوانی ئەکا. فەقێ ئەپرسێ: مامۆستا لە کوێیە؟ مەلاژنیش ئەڵێ: بە قوربانت بم لە ئاواییەکەمان شاییێك هەیە لەسەر شاییەکەیە. فەقێش لە دڵی خۆیا ئەڵێ: چ قەیدی هەیە چووە نیکاحەکە بکا ئەگەڕێتەوە.

زۆری پێ ناچێ مەلا دێتەوە؛ شتێکی درێژ لە ژێر عەباکەیا ئەبێ، ئەیبا لەولاوە دایئەنێ و خۆی دێت دائەنیشێ و گەلێ بەخێرهاتنی فەقێکە ئەکا. فەقێ لە دڵیا ئەبێ بە گرێ کە ئەو شتە درێژە چی بوو مەلا داینا. لێی ئەپرسێ: مامۆستا پرسیار عەیب نییە هەرچەن بێ ئەدەبیشە، بەڵام ئەوە چی بوو لەولاوە داتنا؟ مەلاش ئەڵێ: «کورم زوڕنا بوو». فەقێکە زۆر سەرسام ئەبێ ئەڵێ: مامۆستا زوڕنای چی؟ ئەڵێ: «ڕۆڵە لە سەر شاییەکە بووم، شاییەکەم بە زوڕنا بۆ ئەگێڕان». فەقێ زۆری

لێ ئەکۆڵێتەوە. ئاخری ئەویش ئەڵێ: «کوڕم، نانی مەلایەتییەکە نامانبا بەڕێوە. ئەگەر زوڕنای بە دەمەوە لێ نەدەین ئیدارەی پێ ناکەین».

٨٥. ئافرەتێك گیسکێکی هەبوو سەری بڕیبوو. چوو بۆ کانی گۆزەیێ ئاو بێنێ؛ کەلەشە گیسکەکەش لەوێ کەوتبوو. مەلایەکی حافز لە حەوشەکەدا بوو، قورئانی ئەخوێند. بە مەلاکەی وت: ئاگایەکت لەو کەلەشە گیسکە بێ پشیلە نەیخوا تا دێمەوە. گۆزەی هەڵگرت و ڕۆیشت. کە گەیشتە سەر کانییەکە لەوێوە چاوی لێ بوو وا پشیلەیەك خەریکی گۆشتەکەیە؛ بانگی کرد: مامۆستا وا پشیلە گۆشتەکەی برد. مامۆستا لەسەرخۆی و بە هێمنی وتی: «فوصصصە». پشیلە گوێی نەدایە، گیسکی برد و ئافرەت گەیشتەوە، مامۆستا هێشتا «فوصصصە»کەی دوایی نەهێنابوو. وتی: «مەلا، باوانت شێوێ بڵێ: "فس"، ئەم "فوص فوصە" چییە؟» مامۆستا وتی: «ئافرەت! تۆ نابێ تۆزێ ئەقڵت بێ؟ من چۆن قەرائەتی خۆم بۆ گیسکەلەڕێکی تۆ تێك ئەدەم؟».

٨٦. مەلایەك لە دێیەك بوو، خەڵکەکە چوون ملیان گرت وتیان: مەلا، ئەبێ بێیت فیتفیتانێمان لەگەڵ بکەی؛ مەلای فڵانە گوند و فڵانە گوند هەموو فیتفیتانێ ئەکەن لەگەڵ خەڵکەکەدا؛ گوایە تۆ لەگەڵ ئێمە بۆچ نایکەی؟ مەلا وتی: باوکم، وازم لێ بێنن من پیاوی فیتفیتانێ نیم. ئەم زۆری وت و ئەوان کەمیان بیست. ناچار هەڵسا کیسە و سەبیلەکەی هەڵگرت و چوونە سەر کانی ژنان؛ شوێنی فیت لەوێ بوو.

لەو کاتەدا دوو ژن لەسەر کانییەکە لەسەر ئاو بوو بە شەڕیان؛ یەکێکیان بەوی‌کەیانی وت: «بڕۆ هەی واوا لێ کراو، تۆ ئەوە نیت مەلا گاتی؟!»

ئەوەی‌کەشیان پێی وتەوە: «هەی دێڵە کەر! مەلا منی گاوە یا تۆ؟!».

مەلاش لەولاوە دەستی ئەهێنا بەسەر سەبیلەکەیا بۆ ئەوە چاخی کا بۆ فیت‌فیتێنێ؛ وتی: «دەسا دێڵەشرینە، وەڵڵا هەردووکتانم گاوە». خەڵکەکە وتیان: مەلا ئەوە قسەیە تۆ ئەیکەی؟ وتی: «باوکم بۆچ قسە نییە؟ فت‌فتێنێ ئەم قسانەشی تێدایە؛ ئەگینە بۆچ من مەلام یا فت‌فتێنێ‌کەر؟»

**٨٧.** کابرایەك هەبوو لە هەولێر «مستۆی وەستا چیچوو»یان پێ ئەوت. خەنە و وسمە و شتومەکی ئەفرۆشت لەناو گوزەرەکەدا. کابرایەکی دراوسێ دووکانی هەبوو لە بەرانبەریەوە. لە بەیانی تا ئێوارە هیچ ئیشیان نەبوو ئەوە نەبێ کە یەکێك بەوێدا تێ‌ئەپەڕی، دەستیان ئەکرد بە قسە پێ وتن و تانوت لێدان لێی. کەس نەمابووەوە کە لە دەست ئەمانە دەرچێ و ڕزگاری بووبێ.

ئینجا خەڵکەکە هەستان و چوونە لای بایزاغا (ئاغای هەولێر) شکاتیان لێیان کرد. بایزاغا بانگی کردن، پسوولەی سەد لیرەی لێ سەندن کە جارێکی‌کە قسە بە کەس نەڵێن. کابراکان لە ترسی ئەم جەریمەیە ئیتر ببڕای ببڕای ناوی کەسیان نەئەهێنا.

ڕۆژێك ئەوا قرچەی نیوەڕۆیە و دنیا زۆر گەرمە و کەس لە گەرمانا ئۆقرەی نییە. سەیریان کرد کابرایەکی کورد باوەشێ چەتفە و مشکی بەستووە بە سەرەوە، مراخانی و شەرواڵێکی ناوداری لە بەرایە. هەر لەبەر موسڵدانیەوە تا سەر سنگی پشتێنی تێ‌ئاڵاندووە. لە سەرەوە پەستەکێکی لە بەرایە، لەسەر ئەوەوە پاڵتۆوێك، قۆڵی لە عەبایەکی چۆغەی شان سورمەیی زستانی هەڵکێشاوە. مستۆ، کە ئەمەی چاوپێ‌کەوت هەر لە دووکانەکەیدا پەڕییە خوارەوە دەستی کابرای گرت و بانگی دراوسێ

دووکانەکەشی کرد وتی: وەرە. پێکەوە هەموو چوونە لای بایزاغا و کیسەیەکی لە بەردەما دانا و وتی: ئاغە شەقم برد. ئەمە سەد لیرە جەریمەکە و با قسەی خۆم بکەم. ئاغە! لەم کابرایە بپرسە ئەوا عالەم لە گەرمانا ئەکوڵێ، ئەم هەموو جلە چییە لەبەری کردووە؟ ئاغایش جلوبەرگ و خۆپێچانەوەکەی کابرای بەلاوە زۆر سەیر بوو بەم قرچەی هاوینەدا. ئینجا مستۆ هاتەوە قسە وتی: «ئاغە! من کە قسە ئەکەم وەنەبێ قسەکانم بێ جێ و خۆڕایی بێ، قسە ئا لە شتی واوە ئەکەم. ئاخر دە پێی بڵێ سەگی سەگباب عالەم لەبەر گەرما پرووزەی بە ئاسمانا ئەچێ، تۆ بۆچ وەکوو یاپراخ خۆتت پێچاوەتەوە؟»

ئیتر ئاغە سەد لیرەکەی دایەوە بە مستۆ و وتی: بڕۆ سەربەست بە، چی قسە ئەکەن لەگەڵ هاوڕێکەتا بیکەن؛ بۆم دەرکەوت قسەکانتان هەموو لە شوێنی خۆیانە.

**٨٨.** کابرایەکی دەوڵەمەند ئەکەوێتە سەروسەودای حەج. لەگەڵ کاروان بەڕێ ئەکەون، ئەڕۆن؛ لووسکەیەکی ئەبێ ئەویش لەگەڵ خۆی ئەبا. ئەگەنە ئەو وڵاتی «نەجد»ە کابرا هەوەس ئەیگرێ و بەرۆکی لووسکەکەی ئەگرێ. کوڕەش ئەڵێ: نابێ و نەکراوە لەناو ئەم حەشاماتەدا چۆن ئەبێ؟ ئاخر ئێمە بۆ حەج ئەچین. کابرا ئەڵێ: «هەتیو! تۆ لێرە وا بکەی باقڵێکم لەسەر کێوی عەرەفات دەنگمان دەردێنی!».

**٨٩.** پیاوێـک لـە سولەیمانی هەبوو «حاجی ئەحمەد»ـی ناو بوو؛ بانگی موحەممەد بە ئاشکرا خۆشە، حاجی ئەحمەدڕەش. دوکتۆرێکیش لەو وەختەدا لە سولەیمانی بوو پێیان ئەوت: «دکتر مَلِك». ئەم حاجی ئەحمەدە خێزانەکەی نەخۆش ئەبێ ئەیبا بۆلای دوکتۆر مەلیک. هەر جارە کە ئەیبا پارەیەکی باشی لێ ئەستێنێ. حاجیش بێجگە لەوە

کە لە دڵا دەردەدڵ بکا هیچی‌تری پێ ناوترێ. جارێکیان ئەیباتەوە بۆلای، ئەویش داوای چل ڕووپیە هەقی تەماشاکردنی لێ ئەکا. ئەو سەردەمە لەگەڵ ئەوەشا کە پارە کەم بوو، دیناریش هەبوو ڕووپیەش هەبوو.

حاجی چل ڕووپیە هەڵئەگرێ و ئەکەوێتە بازاڕی سولەیمانی، هەمووی ئەکا بە پوول و بە عانە و ئەیکاتە دەستەسرێکەوە و نقەنق پێوە ئەنیشێ و ئەیبا بۆ دوکتۆر و لە سەر مێزەکەی دایئەنێ. دوکتۆر ئەڵێ: کاکە ئەحمەد ئەوە چییە؟ (ئەو وەختە حەجی نەکردبوو) ئەڵێ: قوربان چل ڕووپیەکەیە. ئەڵێ: جا وا بۆچی؟ من ئەم هەموو پوول و عانەیە چی لێ بکەم؟ ئەڵێ: «قوربان چیت ئەوێ؟ ئەی بچم سێ دانە قاقەزی یەك دیناریت بۆ بێنم، بە سەری ئەو دوو پەنجە نازدارەت بە هێواشی هەڵیگری و بیخەیتە گیرفانی ئەو کراسە سپیە جوانەتەوە، وەکوو مێشێ هەڵبگری وابێ؟ نەوەڵڵا! بە لایەنی کەمەوە با ئێستا تووشی ئەوەندە ئەرك ببیت کە تا لەسەر مێزەکە هەڵیئەگری و ئەیدەی بە کۆڵی فەڕاشەکەتا، بەڵکوو لەبەر قورسییەکەی ناوکت بکەوێ و ئەو وەختە بزانی کە چل ڕووپیە ئەمەیە و بە خوێنی جگەر پەیدا ئەبێ؛ نەوەك سێ قاقەزی سووکەڵە کەوا تۆ بە هیچی نەزانی».

٩٠. کابرایەك لەسەر ڕووبارێك ڕاوەستابوو خەڵکی ئەپەڕاندەوە. چەند کەسێك هاتن وتیان: یەکێ بە چەند ئەمانپەڕێنیتەوە؟ وتی: یەکێ بە قڕانێك. وتیان: ئەگەر ئاو بردینی؟ وتی: «هەرکامێکتان ئاو بردی پارەی ئەوەم مەدەنێ».

٩١. کابرایەك هەبوو «یارەحمەد»ـی ناو بوو؛ تووشی کابرایەکی سنەیی بوو. تێی هەڵپێچیا وتی: تۆ ناوی باوکت چییە؟ ئەویش هەر ناوێکی پێ ئەوت بڕوای پێ نەئەکرد و هەر لێشی ئەپرسی: تۆ ناوی

باوکت چییە؟ ئەویش وتی: باوکم! نازانم تۆ ناوی باوکی منت بۆ چییە و چیت داوە لە ناوی ئەو؟ یارەحمەد وتی: کەرانباوگاو! ناوی باوکتم بۆ چییە؟ بۆ ئەوە قنگی پیێ بسڕم. وتی: «ها! کەواتە هەقتە، دەسا ناوی کێری کەرە».

**٩٢.** قازی گاوانی کەوتە سەودای دروستکردنی خانوویەك. کابرایەکی بەننای هێنا بۆ ئەوەی بزانێ چەندی تێ ئەچێ. کابرا عەرزی کرد: قوربان من بە دووسەدوپەنجا قڕان خانوویەکت بۆ دروست ئەکەم کۆشکەکەی خان‌ئەحمەدخانیش نەیگاتێ. قازی وتی: وەستا نەورۆز پیاوی چاك بە، من دەرامەتێکی وام نییە؛ کۆشکی خان‌ئەحمەدخانیم ناوێ، شتێکی وا خۆم و منداڵەکانم ستاری تیا بگرین بەسمە؛ سەرم مەکە بە پەتەوە. وەستا وتی: قوربان چی ئەفەرمووی؟ ئەوی من عەرزت ئەکەم دووسەدوپەنجا قڕانیشی لێ زیادە و تاقانە کۆشکیش ئەبێ لەم شارەدا. قازی ئەفەنی وتی: وەستا نەورۆز دووسەدوپەنجا قڕان نا، من پێنجسەد قڕانم هەیە، ئەوە پێنجسەد قڕانەکە و چواردیوارێکم بۆ پێکەوە بنێ. وەستا وتی: قوربان تۆ ئیتر کارت نەبێ. پێنجسەد قڕانی وەرگرت و ڕۆیشت.

کرێکار و پاچ و خاکەنازی نارد و بناغەی نیمچە خانوویەکیان دایەوە؛ بناغەی نیمچە خانوویەکیان دایەوە. بناغە هێشتا نەگەیشتبووە سەر، پارە نەما و هاتەوە بۆ خزمەت قازی وتی: قوربان پارە نەما. قازی ناوکی کەوت وتی: وەستا! تۆ ئەو وەختە کۆشکی خان‌ئەحمەدخانت بە دووسەدوپەنجا قڕان بۆ دروست ئەکردم؛ کەچی ئێستا بە پێنجسەد قڕان خانوویەکی ئەحەی جاویدت بۆ دروست‌کردووم و هێشتا هەر لە بناغەشدایە؟ وەستا فەرمووی: قوربان! خۆ من پارەکەتم نەخستۆتە گیرفانم هەر لە خانووەکەی خۆتا خەرجم کردووە. ناچار قازی ئەفەنی ئاوا پێوە بووە شتومەکی ناو

ماڵەکەی فرۆشت، ئەویشی دا بە وەستا نەورۆز.

وەستا بەینێکی‌تر هاتەوە بۆ پارە. قازی ئەمجا خشڵ و لاگیرەی خێزانەکەی فرۆشت و ئەویشی دایە. پاش چەند ڕۆژێکی‌تر وەستا هاتەوە بۆ پارە. خانوویشی هێشتا چوار دیوارەکەی سەر نەکەوتووە. ئەمجا قازی ئەفەنی کەوتە قەرز و قۆڵە لە دۆست و ناسراو، ئەویشی دایە؛ خانوو هەر تەواو نەبوو. کەوتە فرۆشتنی کەوچك و تەنەکە شکاو و تەڵەمشکی ناو ماڵ؛ ئەویشی دایە هەر تەواو نەبوو. ئیتر هیچی بە دەستەوە نەما. لە مایەی دنیا چوار کتێبی مابوو هەستا بردیە بازاڕ ئەوانیشی فرۆشت و چوو لەناو ئاسنگەرەکانا تەشوویەك و خاکەنازێکی بچکۆڵە و بەکرەیەکی بەنتایی کڕی و ئەمانەی برد بۆ مەحکەمە. لەوێ بانگی فەڕاشەکەی خۆی کرد، وتی: وەرە ڕۆڵە! ئەو قورئانە هەڵگرە لەوێ. فەڕاش قورئانی هەڵگرت و تەشوو و شتەکەی لە شوێنی دانا. ئەمجا هەرکەسە ئەهات بۆ مەحکەمە بۆ شەرعکردن، ئەگەر شەرع سوێندی بەر ئەو بخستایە قازی خۆی تێ ئەکرد و دەستی بۆ شتومەکەکان ڕائەکێشا و پێی ئەوت بڵێ: «ئا ئەو شتومەکانە بکەوێتە ماڵمەوە ئەم ئیشەم نەکردووە، وەیا ئەو پارەم لا نییە».

**٩٣.** کابرایەکی کورد ڕانە مەڕێکی هەبوو. کابرا پیاوێکی نوێژکەر بوو. قڕ کەوتە ڕانەکەی، هەر جارە تا ئەچوو بۆ مزگەوت و ئەهاتەوە هەندێکی لێ ئەمرد. وای لێ هات هیچی نەما تاقە بزنێك نەبێ. بزن بە دار و بەردەوە نەئەوێستا. ڕۆژێك کابرا ڕووی تێکرد وتی: «سەگباب خێوە! دائەساکی باشە، ئەگینا نوێژێکت تێ ئەگرم و تۆیش لە کۆڵ ئەکەمەوە».



# شەکراوی دەماخ

**٩٤.** کابرایـەك گێڕایـەوە وتی: عێـل ئەچوون بۆ کوێـستان. ڕۆژێك لەو دەشـتی شـلێرەدا تەماشـام کرد ئەوا سێ چوار زەلام چاڵ هەڵئەکەنن. چووم بە لایانەوە؛ سـەیرم کرد پیاوێکی زۆر پیر دانیشـتووە نان و ماسـت ئەخوا و ئەوانی‌تریـش چاڵێکی قووڵیـان هەڵکەنـدووە، ڕاوەستاون. لێم پرسی برا ئەمە چییە؟ وتیان: «بـرا ئەم ڕیش چەرمۆکە باوکمانـە. ئێمـە ئەچیـن بۆ کوێستان، ئەمیش ناکەوێتـە پاییز هـەتا بیهێنینـەوە؛ گۆڕستانەکەیشمان لێرەیـە. ئەوە ئێستا گۆڕمان بۆ هەڵکەند کـە چاوەڕێـی ئەوەیـن نان و ماستەکەی بخوا و بیخەینـە گۆڕەکـە و دایپۆشین و بچین وە دوای خێڵەکەدا».

پیاوەکـەش وردە وردە نان و ماسـت ئەخوا و سـەیریان ئەکا. منیش وتـم: خـوا بتانگرێ پیـاو ئەوە زت و زیندووە چـی ئەخەنە چاڵ؟ وتیان: «برا بەشی خۆی عومری کردگە با هەر لێرە بیخەینە چاڵ خاسە. لەولاوە بۆمان ناگەڕێتەوە وە دەم کۆچ و بارەوە».

وتـی: بـە هەرجـۆر بـوو پیاوەکـەم لێ سـەندن و ئەوانم بـەڕێ کرد بە شـوێن خێڵەکەدا. پیاوم هێنایەماڵەوە. پاییز کە عێل سـەرەوخوار بووەوە کابرا هەستا چووە پێشوازی عێلەوە.

**٩٥.** کابرایەکـی پینەچـی بۆ کارکردن ڕێـی ئەکەوێتە «هەڵەدن» و لە مزگەوتەکەدا ئەبێ. بەیانی مجەورەکە ئاگر ئەکاتەوە، پینەچی

زۆری سەرما ئەبێ ئەچێتە بەر ئاگرەکە. ئەوەندە ئەزانێ کابرایەك دێت مجەورەکە پێی ئەڵێ: «ئەلیاس بەگ فەرموو لای سەرەوە». ئەلیاس بەگ ئەکەوێتە ژوور پینەچییەوە. یەکێکی‌تر دێت ئەڵێن: خدربەگ فەرموو لای ژوورەوە. ئەویش تەکە تەکە بە پینەچی ئەکا. زەلامێکی‌تر دێت ئەڵێن: فەرموو بەکربەگ بچۆرە ئەو سەرەوە. ئەویش ئەکەوێتە ژوور پینەچییەوە.

بەم تەرحە هەژارە ئەکەوێتە بەر دەرگا و سەرما لە بن دەستی ئەدا. لەو وەختەدا گوێرەکەیەك دێتە بەر قاپی مزگەوت؛ پینەچی ئەڵێ: «فەرموو گوێرەکەبەگ بۆلای سەرەوە». ئینجا خەڵکەکە ئیتر دێڵن تۆزێ پینەچی گەرم ببێتەوە.

**٩٦.** کابرایەکی کورد ژنێکی هەبوو. زۆر لات بوو. زستان داهات؛ هیچیان نەبوو. قسەیان کرد بە یەك کە هەریەکەیان بچنەوە ماڵی باوکیان و بڵێن بووە بە شەڕمان و پێکەوە نامانکرێ؛ بۆ ئەوە ئەو زستانە خۆیان پێیانەوە بەخێو بکەن.

لێیان دا ڕۆیشتن. کە کەوتنە بەهار پیاوەکە چوو بە شوێن ژنەکەیا و لە ماڵی خەزوورەکەیا بە فێڵ دەستی کرد بە قسە کردن ئەیوت: «ژنەکە لەگەڵم وەرەوە و من مێردتم و خراپیم چییە؟ بۆچ تۆراوی؟».

ئەوا خەزوورەکەشی دانیشتووە و لەنگەرییەك «ئاردەوا»یان بۆ کردوون لەگەڵ کوڕەکەدا پێکەوە ئەیخۆن. لەنگەرییەکە بە لای خەزوورەکەدا لار بۆتەوە هەرچی ڕۆنەکەیە کەوتووە بەلای ئەودا. ژنەکە چوو پەنجەیەکی هێنا بە ناوەڕاستی ئاردەواکەدا بۆ ئەوە ڕۆنەکەی بکەوێ بەلای مێردەکەیا و بە دەمیشیەوە وتی: «بەخوا بابە! تا دنیا ئاوابێ من لەگەڵ ئەم مێردەم ناچمەوە». باوکەکەش فێڵباز بوو، کە زانی وایە و کچەکەی بۆ ئەوە وای

کرد کە ڕۆنەکە بکەوێ بە لای مێردەکەیا و ئەم شەڕ و هەرایانە درۆ بووە، کەوچکێکی هەڵگرت و ئاردەواکەی تێکدا و بە دەمیەوە وتی: «بەخوا ڕۆڵە! تا دنیا وا تێك چووبێ تۆ ناچیتەوە لای ئەم مێردەت».

**٩٧.** دوو کابرا چوونە شار؛ چوونە ماڵی کابرایەکی بازرگان بوون بە میوان. ئێوارە کە نانیان بۆ دانان، قاپێ فرنیش لەسەر سینییەکە بوو. یەکێکیان پرسی: برا ئەم شتە خۆشە چییە؟ ئەوی‌تریان وتی: «بەڕەحمەت بێ باوکم هەموو جار ئەیوت: شار دوو شتی خۆشە: یەکێ حەمام؛ یەکێ مزگەوت. ئەمە یان حەمامە یان مزگەوت».

**٩٨.** دوو ماڵی ئاخەسووری ساڵێك لە «کانی گومە» مانەوە، نەچوون بۆ کوێستان. هاوین هات، ئینجا ئاوی سارد نەبوو بیخۆنەوە. یەکێکیان بانگی هاوماڵەکەی کرد وتی: «حەمە، سەد خۆزگەم بە پار ئەم وەختە ئاگات لێ بوو ماڵمان لە توراغ تەپە بوو؛ ئینجا کە تینوومان ئەبوو، دەممان ئەخستە کانییە ساردەکەوە قوممان لێ ئەدا؟ ئای سەد جار قوم!».

**٩٩.** جارێك مەلایەکی سەر سپی ئەچێتە خێڵێکەوە. پیاوێکی پیری زەلامی سەرکۆماریان ئەبێ، ئەبێ بە میوانی ئەو. باسوخواسی نوێژی لەگەڵ ئەکاتەوە. کابراش هیچی لێ نازانێ و نەیبیستووە. ئەمیش ئامۆژگاری ئەکا ئەڵێ: تۆ پیاوێکی پیریت و دنیا ئەبڕێتەوە و ئەبێ فێری نوێژ بیت و نوێژ بکە بۆ قیامەتت چاکە. کابرا ئەڵێ: باشە، فێرم کە. مەلا پێنج شەش ڕۆژ «رکوع» و «سجدە» و دانیشتنی فێر ئەکا.

کوتوپڕ کابرا ئەمرێ. دەر و دراوسێ دێن بۆ پرسە و سەرخۆشی کردن. لە کوڕەکەی ئەپرسن: برا باوکت چی بوو وا مرد؟ ئەویش ئەڵێ: «بەخوا هیچی نەو، ساق و سەلیم بوو». ئاخر نابێ ئەبێ نەخۆشییەکی هەر

بووبێت. کوڕە ئەڵێ: «برا بێژم چی؟ شەش حەوت ڕۆژ لەمەوپێش کاورایەکی سەر چەرمگی گەماڵباوکی لێ پەیدا بوو، هات فێری خوویەکی کرد پێیان ئەوت نوێژ. وەك هەسوون ئەیوەستان وە پێوە، وەك کەوان ئەیچەمانەوە، وەك توولە بۆی پێ‌ئەکرد وە زەوییەوە، وەك گەماڵ قنگەلفسی پێ ئەدایەوە، ئەوەندەشی ئاو دا وە قنگیەوە تا لە قنگیەوە ئاوجزی کرد؛ ئیتر بەرگەی نەگرت پسیا و مرد».

١٠٠. کابرایەك پیرەداکێکی ئەبێ و ئەمرێ. دەست ئەکا بە گریان و هاوار ئەڵێت: «باوکەڕۆ! براڕۆ! بێ‌کەس خۆم». خەڵك و خوا لێی کۆ ئەبنەوە و ئەڵێن: چی بووە؟ ئەڵێ: «ئەم خێڵە گشتی یاهوویە؛ هیچیان وە هاواری کەسەوە نایەن و لە هاوسێ ناپرسنەوە». ئەوانیش ئەڵێن: کورە ئاخر چی بووە؟ ئەڵێ: «ئاگام لێوو کە ئیزرائیل هات گیانی دایکم بکێشێ؛ منیش دەستێکم گرت وە دەمیەوە، دەستێکی‌تریشم گرت وە کوزیەوە، خێرەمەندێکی‌تر نەو دەستی بگرێ وە قنگیەوە. ئیزرائیل دەویت باوك لە قنگیەوە گیانەکەی کێشا؛ منیش هەردوو دەستم هەبوو. براکەم وازم لێ بێرن، پیاگی بێکەس هەر بۆ مردن خاسە».

١٠١. کابرایەکی کورد نانیان نەمابوو، کۆڵێ گەنمی هەڵگرت و چوو بۆ ئاش کە بیهاڕێ. ئاشەوانەکە لەوێ نەبوو؛ ژنەکەی لەسەر ئاشەکە بوو. کابرا لێی پاڕایەوە وتی: نانمان نییە، نۆرەبڕیم بۆ بکە باراشەکەم بۆ بهاڕە. ژنە ئاشەوان هەمانەی هەڵگرت کە بیخاتە سەر دۆڵیانی ئاشەکە، هەمانە گەنم گران بوو بایەکی لێ بەر بووەوە. کابرا وتی: «ئای بە کێرم». ژنە ئاشەوان وتی: «حیزباب! شەرت بێ باراشەکەت بۆ لێ نەکەم بچۆ بۆ ئاشێکی‌تر». کابرا وتی: «ناماقوولیم کرد. توخوا مناڵەکانم نانیان نییە و

برسییانە، تکات لێ ئەکەم لێم ببوورە و باراشەکەم بۆ لێ بکە». ژنە ئاشەوان دڵی پێ سووتا و هەمانەکەی هەڵگرتەوە کە بیخاتە سەر دۆڵیانەکە دیسان بایەکی تری گەورەی لێ بووەوە. کابرا وتی: «بەخوا ئەگەر مناڵەکانم هەموویان لە برسا مردبن هەر بە کێرم».

١٠٢. پیاوێك بۆی گێڕامەوە وتی: شەوێك لەو گەرمیانە ڕێم کەوتە ماڵی کوردێك. دنیا زستان بوو. کابرای خاوەن‌ماڵ لەو دیوی چیغەکەوە لەگەڵ ژنەکەی نوستبوون، منیش لەم دیوەوە. کەوتە نیوەشەو گوێم لە دەنگی ورتەیەك بوو. سەیرم کرد وا کابرای خاوەن‌ماڵ بەرۆکی ژنەکەی خۆی گرتووە و داوای ئیشی شەرعی لێ ئەکا. ئەویش نایداتێ. زۆری لەگەڵ خەریك بوو هەر نەیدایێ، لە پاشا وتی: «کچەکە وەو شێخ کەریمە ئەگەر نەمدەیتێ ئەچمە زگی میوانەکە». کابرا وتی: منیش لەو دیوەوە دڵم داخورپا، ئەو وەختەش مووم لێ نەهاتبوو. لە پاش بگرە و بەردەیەکی ئەوان و پاڕانەوە و نزایەکی من کە ئەم ژنە دڵی نەرم بێ ژنەکە وتی: «بێرۆ، بێرۆ، با بوێ وە خاتری کەریمەسوور و ئەو میوانە، با حەیامان نەچێ».

١٠٣. لە ئاوایی «سەرشاتە» زەماوەند بوو. کابرایەکی کورد ڕانەکەی بردبوو بۆ گوێ سیروان. لەوبەری سیروانەوە شوانێکی بەرچاو کەوت. کە سەیری کرد فەتەی عەولە، وتی: «هۆ هۆ، هۆ فەتە، ئەوە تۆ نەچووگیتە زەماوەنەکەوە؟» ئەویش وتی: «ناوەڵڵا نەچووگم. لە کوێیە؟» وتی: «لە ئاوایی سەرشاتەیە». وتی: براکە کێ لێ وو؟ وتی: «کوچکت لێ نەوارێ! چی کێ لێ وو؛ ئامەیە و خەجەیە و مەجەیە».

ئینجا فەتە گوێ فەرەنجییەکەی خۆی گرت و هەڵیئەسووڕان و بە

تاقی تەنیا لەوبەر ئاوەکەوە هەڵئەپەڕی و ئەیوت:

**ئامە وخەجە ومەجالەیە        شایی و بووکی فەتالەیە**

ئەم کابراکەیتریش لەمبەر ئاوەکەوە بۆی ئەسەندەوە.

١٠٤. مەحمووپاشا لە ئەستەمبوڵ هەڵاتبوو. بەسەر وڵاتی ڕووسیادا هاتبووەوە. هەموو کوێخا و سەرکۆماری عەشرەتی جاف ئەچن بە پیریەوە. کە بە خزمەتی ئەگەن یەکە یەکە دەستی ماچ ئەکەن و بەخێرهاتنەوەی ئەکەن. لەناو خەڵکەکەدا کابرایەکیان شەش حەو جار دەستی ماچ کرد و وتی: «پاشا، بەخێر بێتەوە، یارەبی بەخێر بێتەوە، سەد جار بەخێر بێتەوە». پیاوێکیکە وتی: «خزمە، تۆ جارێ دوو جار، سێ جار بەخێرهاتنەوەت کرد ئیتر بەسە ئەمە چیت کرد؟» کابرا وتی: «عەشرەت لێمگەڕێن؛ وەو سەیساقە لەو ڕۆژەوە پاشا چووگە بۆ ئەستەموڵ من هەر وەکوو جاشکێ دایکی لێ گوم بووبێ بە چەم و دۆڵ و کەژەوە لووشکە لووشک و زووڕە زووڕم بووە».

١٠٥. سێ چوار ماڵ مرزنگ لە ڕانیە ئەبن. نەخۆشی چاوەقووڵە دائەکەوێ، ئەوانیش ماڵ بار ئەکەن هەر لەو شەوە لە «زێ» ئەپەڕنەوە و دێنە ئەمبەر بناری تەلان دەوار هەڵئەدەن. وەختی هەتاو کەوتن یەکێکیان ئەڕشێتەوە و ئەمرێ. ئینجا گەورەکەیان ئەیوت: «دەك ماڵت بە قوڕ گیرێ ئیزرائیل! وەرە بەم تاریکە شەوە لە بیتوێنەوە بێ و بەناو ئەم هەموو دار و دەوەنەدا ئێمە بدۆزیەوە و چقڵێکیش نەدا لە چاوت، چاوێکت دەربێنێ».

١٠٦. ساڵێك خێڵ ئەگاتە دەشتی شلێر. هۆبەیەك چەند ڕۆژێك لەوێ ئەمێننەوە؛ باران نایەڵێ بار کەن بچن بۆ کوێستان.

کوێخایەکی ڕیش سپییان ئەبێ ئەڵێ: «کوڕینە با وە فێڵ بار کەین، وە دزی خواوە». ئەڵێن باشە.

کابرا پاش خەوتنان هەڵئەستێ ئەچێتە سەر گردەکە و ڕوو ئەکاتە ئاسمان ئەوا هەور و شرێخوهۆڕیشە. بە دەنگی بەرز ئەڵێ: «بار ناکەین، بار ناکەین شریخوهۆڕت بوڕەوە». دەستیشی لە خێڵەکە هەڵئەتەکێنێ و بەبێ دەنگ پێیان ئەڵێ: «وە دۆڵا، وە دۆڵا، دۆڵاودۆڵ بۆی بڕۆن». لەو وەختەدا ئەیکاتە برووسکە و چەخماخە. کابرا ئەڵێ: «ئەی کوچکی تۆی لێ نەوارێ! ئەوە من ئێژم بار ناکەین، کەچی ئەو تازە کوچك و چەخماخەم بۆ هەڵئەکا وە شوێنمانا، وا ئەزانێ من درۆ ئەکەم».

.١٠٧ فەقێیەك گێڕایەوە وتی: ساڵێك لەو کوێستانی بانە زۆر سارد بوو. چوومە ژووری مزگەوتەکە بۆ نوێژ کردن. بەیانی زوو بوو، مزگەوتەکەش ئێجگار سارد بوو، نوێژەکەم بە پەلەپەل کرد و چوومە حوجرە. کونێك لە حوجرەکەدا بوو ئەیڕوانییە ژووری مزگەوتەکە. کابرایەکی ڕیش‌سپی هەبوو مام وەسمانیان پێ ئەوت. دەستنوێژی شۆردبوو، ئاوەکە بە ڕیش و سمێڵیەوە بووبوو بە زەنگوڵی سەهۆڵ. خێرا نوێژەکەی کرد و سەلامی دایەوە. منیش لە کونەکەوە وتم: «وەرمان نەگرت». کابرا سەیرێکی ئەملاوئەولای خۆی کرد کەس دیار نەبوو، هەستا نوێژەکەی کردەوە. دیسان وتم: «وەرمان نەگرت». سەیرێکی‌تری کرد کەس دیار نییە؛ زۆر سەری سوڕما، بەڵام لە سەرمانا هێزی تیا نەماوە. بە ناچاری هەڵسا نوێژەکەی کردەوە. هەمدیسان وتم: «وەرمان نەگرت و قەبووڵ نەبوو». هەر هەستا و کردی بە پێڵاوەکانیا و بۆی دەرچوو وتی: «وەرت گرت، وەرت نەگرت، چاوت دەرئەهات و ملت ئەشکا. خۆ من لە سەرمانا زیرەم کرد. وەرمان

نەگرت، وەرمان نەگرت، جیکەنەیە، جیکەنە. دەموفلقت خواتەوە، خۆی لەو ئاسمانەوە دانیشتووە و خەڵکی کردووە بە هەلاج».

١٠٨. کابرایەکی بێسەری گێڕایەوە وتی: باوکم وتی: ساڵێك «بابەڕەسووڵ» ناردی بۆ لەشکەرکە بچێ شەڕ لەگەڵ هەمەوەن بکا. ئێمەش لە بەردەست «فەرعاناغا»دا بیست‌وچوار سوار هاتینە سولەیمانی لە ماڵی بابەڕەسووڵ دابەزین. ژوورێکی گەورەیان بۆ فەرش کردین و ئێوارە نانیان بۆمان هاورد؛ چی بێژن؟ «گێتکە»؛ بەڵام گێتکە! هەریەکە بە قەدەر تووتەڵە سەگێکی یەك مانگی خڕەکە. کە هەڵمانپچڕی ناوەکەی پڕ کرابوو لە برنج وەکوو پڵاو. ئەوەندە گەنوگووی بۆنخۆشی تێ کرابوو هەروا پیاو وڕ ئەبوو. ئەوەندەمان خوارد ئەوەندەمان خوارد، هەتا لە لووتمان هاتەوە.

شەو خزمەتکارەکەی بابە ڕەسووڵ لەو دیوەوە دەرگاکەی داخستبوو. لە نیوە شەوا ئیشی سەراومان بوو، ورد بووینەوە دەرگا داخراوە. چی بکەین، چی نەکەین؟ بوو بە گیز و هۆڕ، ناچار فەرشەکانمان هەڵدایەوە و ژێرەکەیمان پڕ کرد لە پیسایی. بەیانی فەرعاناغا ئەمەی دی وتی: «عەشرەت وەختی ڕاوەستان نییە، ئیتر هەرکەسە پەلاماری ولاغی خۆی دا، سوار بوو بەرە و ماڵ تێمان تەقان».

١٠٩. پیاوێك گێڕایەوە وتی: ڕۆژێك تووشی کوڕێك بووم سەگێکی سەمەند کردبوو؛ شیرێکی ڕووتی بە دەستەوە گرتبوو، لێم پرسی: برا ئەمە چییە؟ ئەم سەگە بۆ کوێ ئەبەی و چی لێ ئەکەی؟ وتی: «وەڵڵا برا بێژن سەگەکەت هار بووگە، وا منیش ئەیبەم ئەیکوژم». وتی: منیش پێم وت: خوا هەڵناگرێ ئەم سەگە هەژارە بۆچ ئەکوژی؟

هیچ نیشانەی هاری لێوە دیار نییە. ئەویش وتی: «برا بم وە قوروانت، ئەوەتە هار بووگە، یێژم سەگی هار یێژی شەخسە. هاو ماڵە دەویت باوکەکانم یێژن هار بووگە؛ یێژم چی؟» کابرا وتی: منیش ڕۆیشتم ئیتر ڕانەوەستام قسەی تری لەگەڵ بکەم.

.١١٠ لە سەرگوزەشتی کوردانەیە ئەگێڕنەوە ئەڵێن: جارێك پیرێژنێك کورد ئەچێتە لای سلێمان پێغەمبەر، ئەڵێ: دێوێکم بدەرێ تەنها ڕۆژێك، بۆ ئەوە کۆشکێکم بۆ دروست بکا. سولەیمانیش دێوێکی ئەداتێ. دێوە لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ کۆشکێکی نایابی بۆ دروست ئەکا، لە پاشا ئەڵێ: ئیشی ترت هەیە تا بۆت بکەم؟ ئەویش ئەڵێ: هیچ ئیشی ترم نییە. دێوە ئەڵێ: ئاخر نابێ بێ ئیش دابنیشم؛ من بۆ ئەوە هاتووم ڕۆژێك ئیشت بۆ بکەم. دەست ئەکا بە تێکدانی کۆشکەکە، تا ئێوارە تێکی ئەداتەوە و لێ ئەدا ئەڕوا.

پیرێژنەکە بەیانی لێ ئەدا ئەچێتەوە بۆلای سلێمان پێغەمبەر کارەساتەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: دێوێکی ترم بدەرێ با کۆشکێکی ترم بۆ دروست بکا. ئەویش دێوێکی تری ئەداتێ. ئەمیش وەکوو هێنەکەی دوێنێ تا نیوەڕۆ کۆشکەکە دروست ئەکا و لەبەر بێ ئیشی تا ئێوارە ئەیڕووخێنێتەوە.

پیرێژنەکە سەرلەنوێ ئەچێتەوە بۆ شکات. سلێمان پێغەمبەریش ئەڵێ: دایکم ئاخر هەقیانە، نابێ بێ ئیش دابنیشن. پیرێژن ئەڵێ: دێوێکی ترم بدەرێ، ئیشی بۆ ئەدۆزمەوە. دێوێکی تری ئەداتێ، ئەمیان تا چێشتەنگاو کۆشکەکە دروست ئەکا و لە پاشا ئەڵێ: ئیشی ترت هەیە؟ پیرێژنە ئەڵێ: ئا هەیە؛ دێنێ باوەشێنێکی ئەداتە دەست و لنگەوقووچ

بۆی ئەکەوێ و کونی ئەشکەوتەکەی خۆی ئەخاتە بەردەست و ئەڵێ: باوەشێنی ئەم ئەشکەوتە بکە تا بە «با» کونەکەی ئەگریت. دێوەش دەست ئەکا بە باوەشێن کردن. تا دەمەدەمی عەسر بە تەواوی دەستی شڵ ئەبێ؛ لەو کاتەدا پیرێژنەکە دنیا گەرمە و فێنکی ئەبێتەوە، تڕێك ئەکەنێ. دێوەکە ڕائەچڵەکێ و ئەڵێ: ئەوە چی بوو؟ ئەویش ئەڵێ: ئەوە کونی تێ بوو. دێوە سەرێك با ئەدا و ئەڵێ: «موبارەك نەبێ! من هێشتا ئەوی‌ترم نەگرتووە، کەچی کونێکی‌تری تێ بوو». هەر هەڵئەستێ باوەشێنەکە فڕێ ئەدا و بۆی دەرئەچێ.

١١١. ساڵێك لە وەختی بەهارا کۆمەڵێك دانیشتبوون لە گوێ ئاوێك. یەکێکیان وتی: بەخوا بەهار خۆشە پیاو بچێ بۆ سەیران و چێشتی خۆش لەگەڵ خۆی بەرێ و یاری و گەمە بکەن. یەکێکی‌تریان هەڵیدایە و وتی: «خالۆ! ناشوکری نەبێ! کەیفخۆشی نەماوە. بە سەرەکەی تۆ ساڵێك ماڵمان لەم شارەزوورە بوو، ڕۆژێك کوڕە کوڕەی هاوماڵ گرد بووینەوە. یەکێ ماست، یەکێ ماستاو، یەکێ دۆ، یەکێ سیرێژ، گلێرمان کردەوە. لالە فەتەم بەڕەحمەت بێ! مەشکەیەکی سووری ماڵی میمکە فەرخە هەبوو، تەقەڵبڕمان کرد. سواری نێرەکەرە بۆزی خۆی بوو، مەشکەی نایە بەردەمی بۆ سەراوی سوبحاناغا. کاتێ ڕوانیمان لە نیوەی ڕێگا پشکی مەشکە بەر بوو، هیچ دەست نەکەوت پێی بگرێتەوە. لالەی چەمەریم ناچار کێری خۆی نیایە کونەکەیەوە هەتا چووینە سەر سەدەکە. لەوێ ڕامان‌کرد سێ چوار تەبەقمان هاورد مەشکەمان تێ قلپاند. ئینجا یەکێ نانی گەنم، یەکێ نانی جۆڕەشی گەرمیان، یەکێ نانی زەڕات. خوا نەیبڕێ تێمان وڵی و کردمان بە زڵیا و پڵیا و هەریەکێ بە قەد مانگایەکمان

خواردن. ئیتر لەو سەرەوە بە شەق لە یەك هەڵدان هاتینەوە. ئێستاکە کوانێ ئەو سەیر و سەفایە؟».

١١٢. بەگەی حوسێن مەولان هەبوو پیاوی مستەفابەگی سلێمان کەندی بوو. وتی: چەند دانەیێ پێستە ڕێویم پێ بوو؛ ئەمبرد بۆ سابڵاخ بیفرۆشم. ئەو ساڵەش ڕێوی حیز بوو، پارەی نەئەکرد. شەوێ ڕێم کەوتە «یاڵاوا». ماڵێکی گەورەم لێ وەدەرکەوت، چوومە ئەوێ. هەر کە نزیك بوومەوە ئافرەتێکی جوانکەلە هات و سەر ڕێگەی پێ گرتم؛ وتی: «بەخوا باوکم، جێگەمان نییە و پیاومان لە ماڵەوە نییە». هەرچەند وتم: کچێ! ئافرەتی چاك بە، بەم زستانە و بەم نیوەشەوە بچمە کوێ، هەموو ئاوایی نوستوون، کێ ڕێگەم ئەکاتەوە، هیچ کەڵکی نەبوو. من زۆرم وت و ئەو کەمی بیست. لێی دا ڕۆیشت و قاپییەکەی داخست. منیش لە دەرەوە مامەوە سەرما کوتامی. ناچار تەپاڵدانێك هەبوو خۆمم کوتایە ئەوێ.

شەو بوو بە نیوەشەو، سەیرم کرد قاپی حەوشەکە کرایەوە و ئافرەتێك بەبێ چرپە هات بۆ تەپاڵدانەکە. ناسیمەوە کە ئەمە ئافرەتەکەی ئێوارەیە. هات بە هێواشی بانگی کرد: «حەمەدێ هاتووی؟» منیش هیچ خۆمم نەبرکان، وتم: «ئا». گرتمۆڵکەیەکی بۆ فڕێ دام وتی: «ئەوە بخۆ ئێستە دێمەوە بۆ لات». کە کردمەوە تەماشام کرد دەستەسرێکی سپی ڕیشوو‌داری هەڵبستراوە، پڕیەتی لەگوێز و مێوژ و بادام؛ تێرم لێ خوارد. لەو وەختەدا ئافرەتەکە هاتەوە لامەوە، دەستمان کردە ملی یەك و یەکێکمان کرد. لە پاشا پێی وتم: «حەمەدێ گیان! کە چوویتە شار چیم بۆ دێنی؟» منیش وتم: «بەخوا خۆت ئەزانی هیچیترم پێ نییە؛ هەر ڕێوییە و ڕێوی، ئەگەر پارەی کرد هەرشتێکت ویست بۆت دێنم».

کوتوپـڕ لێم کشـایەوە و وتـی: «ئای ڕێوی باوەحیـز! ئەمەتۆی؟ ئەوە چی ئەکەی لێرە؟» و هەڵسا خێرا ڕۆیشت. وتی: منیش لە ترسا ئیتر نەموێرا لـەوێ دانیشـم، وتـم: ئێسـتە ئەچـێ خەڵکم بەسـەرا ئەڕژێنـێ. هەستام «کادانێك» بوو چوومە کادانەکەوە.

زۆری پـێ نەچـوو تەماشـام کـرد ژنەکـە هاتـە کادانەکەوە بە سـەبرێ بانگی کرد: «حەمەدێ هاتووی؟» منیش دەنگی خۆمم گۆڕی لە سەرخۆ وتم: ئا هاتـووم. هاتـە تەنیشـتمەوە دەسـتمان کـردە ملـی یەك و لەوێشـا یەکێکی‌ترمـان کرد. پاشـان وتـی: «حەمەدێ گیان! کە چوویتە سـابڵاخ چیم بۆ دێنی؟» منیش وتم: «بەخوا هـەر ڕێوییە و ڕێوی ئەگەر پارەی کرد چیت بوێ بۆت دێنم». سەیرم کرد دیسان خۆی ڕاپسکاندەوە و وتی: «ئای ڕێوی کەرانباوگاو! ئەوە گەیشتیتە ئێرەش؟» ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیـشت.

فلانـی ئەمجا بـە تـەواوی ترسـم لـێ پەیـدا بـوو، هەڵسـام ئەوێشـم بەجێ‌هێشـت. پشتیرە کۆنێـك هەبـوو چوومـە ئەوێـوە. لەوێـش زۆری پێ‌نەچـوو دیسـان ئافرەتەکە هاتەوە سـەری کرد بـە ژوورەکەدا و منیش کۆکەیەکـی بچکۆڵـەم کرد وتی: «حەمەدێ ئـەوە لەوێیت؟» منیش زۆر بە سـەبر وتم: «ئا». ئەمجا بە سەربەسـتی هاتە لامەوە و دەسـتمان کردە ملـی یـەك؛ لەوێـش یەکێکی‌ترمـان کـرد. لـە پاشـا وتـی: «حەمـەدێ کە چوویتـە شـار چیم بۆ دێنی؟» منیش وتـم: «بەخوا فلانی هەر ڕێوییە و ڕێـوی ئەگـەر پارەی کـرد چیت بوێت بۆت دێنم». ژنە ئەمجارە دەسـتی کرد بە پێکەنین و وتی: «خوا بتگرێ ڕێوی بۆ خۆت و بۆ کەتنت، گووی تۆیش بە گۆڕی بابی حەمەدێ».

ئینجا لێم پرسـی: ئێسـتە پێم بڵێ بزانم باسوخواس چییە؟ وتی: چیت

پێ بڵێم؟ ئەمە لەگەڵ حەمەدێ کەرانباوگاو گۆیا دڵمان پێکەوە بوو. ئیمشەو بڕیارمان دابوو بە یەك کە بێت بۆ لام. ئەوا ئەو حیزەڵەی خوێڕییە نەهات و تۆیش ئەم کەتنەت گێڕا. منیش وتم قەیدی نییە ئێمە بە ئیشی خۆمان گەیشتین هەرچەند زۆریشم سەرما بوو.

بەیانی ئیتر نان و شیوێکی باشی دامێ و بەڕێی کردم. کە ڕۆیشتم دنیا بوو بە چێشتەنگاو. لەسەر کانییەك دانیشتم، دەسەسرە سپیم دەرهێنا هەندێ گوێز و مێوژی تێدا مابوو خواردم؛ سەیرم کرد کابرایەك هات، ئەویش دانیشت چاوی بە دەستەسرەکە کەوت، بە لایەوە سەیر بوو، وتی برا ئەو دەستەسرەت لە کوێ بوو؟ وتم: برا ناوت چییە؟ وتی: «حەمەدێ». وتم: کەوابێ هی تۆیە و هەموو کارەساتەکەم بۆ گێڕایەوە. کابرا لە داخا وەختبوو شەق بەرێ و دەستەڵاتیشی بە سەرما نەبوو؛ من لەو زەلامتر و بەهێزتر بووم. وتم: برا تووڕەیی پێ ناوێ، تۆیش قسە بکە. کابرا دەستی کرد بە پێکەنین وتی: «وەڵڵا ڕاستی ئەوەیە ئەم دەستەسرە هی منە، گوێز و مێوژ و بادامم تێ کردبوو؛ بە دیاری بردبووم بۆ ئەو دۆستەم، وە پێشم وتبوو شەوێ دێم. ئیتر بۆم ڕێ نەکەوت بچم ئەوا تۆ دەستی خۆتت وەشاند». وتم: برا گوێی مەدەرێ سووچی خۆت بووە، بۆ لەمەودواتان. دەستەسرەکەم پێ دایەوە و پێکیشەوە چووین بۆ سابڵاخ تا ناو شار هاوڕێ بووین، لەوێ ئیتر لە یەك ون بووین.

.١١٣ لە دەوری قاجارییەکانا قونسوڵی عوسمانی لە سنە هەبوو. هەرکەس بچوایەتە ژێر بەیداخی ئەوانەوە، ئەبوو بە تەبەعە. ڕەوشتی جێبەجێ کردنی ئەم تەبەعیەتیەش ئەمەبوو، هەرکەس بیویستایە ببێ بە تەبەعە ئەچووە بەر قونسوڵخانە ئەیوت: ئەبم بە تەبەعە. قاپیوانەکە

ئەهاتە دەرەوە پەنجەیەکی تەڕ ئەکرد و ئەینا بە ناوچەوانیەوە ئەیوت: «بڕۆ تەبەعە بە». وەستا باقری دەلاك چوو، بوو بە تەبەعە و لە پاشا چووەوە بۆ ماڵی خۆیان. ماڵیان لە گەڕەکی «جۆراوا» بوو. بە تووڕەییەکەوە بانگی کرد لە حەنیفەخانمی ژنی وتی: «کچێ پارووێ نانم بۆ بێنە». حەنیفەخانمیش سەری سڕ ما، وتی: «پیاگەکە! ئەم زوانەت لە کوێنە هاوردگە؟» وەستا باقر وتی: «ئەڵێم پارووێ نانم بۆ بێنە قەحپەباب! ئەگینە هەڵئەستم بە خنجوکان پارچە پارچەت ئەکەم». حەنیفەخانم هاتەوە قسەو وتی: «پیاگەکە بۆ خاتری ڕەزای خوا، تۆ سنەیی، دایکت سنەیی، باوکت سنەیی ئەم زوانەت ئازا لە کوێ هاوردەوە؟» وەستا باقر ئەوەندەی‌تر تووڕە بوو، حەنیفەخانم ناچار ئیتر دەنگی نەکرد و وتی: قەیناکا و نانی بۆ هێنا.

دەور سووڕایەوە؛ تەبەعە وەکوو پێستە ڕێوی، پێستی قیمەتی ئەکرد. ڕۆژێك حەنیفەخانم سەیری کرد وا وەستا باقر بە هەڵەداوان و تەپوکوت خۆی کوتایەوە بۆ ماڵەوە و «کەنوو»یەکیان هەبوو، چوو لەوێ خۆی شاردەوە. حەنیفەخانم زانی چە باسە، چووە سەر کەنووەکە تەماشای کرد وا وەستا باقر گورپەی کردووە. بانگی کرد: «پیاوەکە هەستە وا لە دەرەوە قازانج داوات ئەکەن». وەستا وتی: «بە قوربانت بم ژنەکە! بێژە لێرە نییە». حەنیفەخانمیش وتی: «هەستە سەگباب! ڕاستەوە داوات ئەکەن». وەستا دیسان وتی: «حەفجار بێم بە دەورتا حەنیفەخانم گیان! بێژە بە سەر ئێوە نەهاتگەسەوە». حەنیفەخانم ئینجا وتی: «قەحپەباب! کوا خنجوکەکانت؟».

(حەنیفەخانم ئافرەتێکی عەنتیکە و گاڵتەچی بوو؛ ئەمەی هەر بۆ پەن لەگەڵ وەستا باقری مێردیا گێڕا ئەگەینە هیچ لە ئارادا نەبوو).

١١٤. کوێخا فەتحوڵڵای بابەکراویٚ گێڕایەوە وتی: ساڵێك لەگەڵ شێخ ئەحمەد بەردەزەردی پێکەوە قسەمان کرد بەیەك، کە شەو بچین بۆ دزی. پاش خەوتنان خۆمان گورج کردەوە و چووینە قەراخ دێیەك پارێزمان بردە بەرماڵێکی دەوڵەمەن. لە پاڵ تەیمانەکەوە تەماشامان کرد ژنێك لەسەر کەپرێك دانیشتبوو. چاوەڕێ بووین کە ژنەکە خەوی لێ بکەوێ، ئەو وەختە دەست بدەین بە ئیشەوە. سەیرمان کرد ژنەکە هەر نەنوست و بەینە بەینە کۆکەیەکیشی بۆ ئەکرد؛ ئێمەش لەبەر ئەوە نەوەك بیکا بە هەرا، نەچووینە سەر ماڵەکە.

کە بوو بە نیوەشەو، سەیرمان کرد ئەوا زەلامێك بە ماتەمات هات و لە تەیمانە ڕووخاوەکەوە چووە ژێر کەپرەکە. ئێمەش دە هەنگاوێك لێی دوور بووین؛ خۆمان بە دیوارەکەوە مات کردبوو؛ ئەوەندەمان زانی ژنەکە لەسەر کەپرەکە هاتە خوارەوە لە ژێر کەپرەکەدا ڕاکشا و زەلامەکە سواری بوو.

لەو کاتەدا منداڵێکی پێنج شەشساڵان لەسەر کەپرەکەوە بانگی کرد: «ئامۆژن، ئامۆژن!» ژنەکە لە ژێر زەلامەکە وتی: «فاتەکە! ڕۆڵە مەگری ئەوا دێمەوە؛ ئینجا هەر بانگم بکە با نەترسم». کچەکە ئیتر هەر ئەیوت ئامۆژن، ئەویش جوابی ئەدایەوە، لە پاش دوو سێ جار کچەکە بێدەنگ بوو؛ تۆمەس خەوی لێ کەوتبووە. ژنەکە لە ژێر زەلامەکەوە بانگی کردەوە، فاتەکە دە بانگم کە با نەترسم. منیش هەتا هێزم تیابوو وتم: «بێ‌بەلا بی! ئێوە دوو، ئێمەش دوو ئەمە چوار، فاتەکەش یەك ئەمە پێنج، هێشتا هەر ئەترسی؟» لەگەڵ ئەمەم وت زەلامەکە هەستا و ڕای کرد. ئیتر منیش بانگم کرد: «خەڵکینە! هەستن بۆ خاتری خوا ئەو کابرایە ئەم ژنەی گا». لە دەر و دراوسێ چوار پێنج کەس خەبەریان بووەوە و

وتیان: کوڕە کامەتە زەلام؟ وتم: ئەوەتە ڕای کرد بۆ پشتی مزگەوت. وتیان: ژنەکە کامەیە؟ وتم: «ئەو ژنە کە ناوی نازانم و ئامۆژنی فاتەکەیە».

وتی: ئیتر خەڵکێکی زۆر کۆ بوونەوە ئێمەش ڕامانکرد و دوور کەوتینەوە؛ خەڵکەکە چوونە سەر ماڵەکە. ئێمە لە دووری ئاوایی بووین گوێمان لێ بوو ژنەکە سوێندی ئەخوارد کە هیچ نەبووە و درۆیە. منیش بانگم کرد: خزمینە «وەڵڵا و بیللا درۆ نییە؛ ڕاستە». یەکێك لە ئاواییەکە بانگی کرد وتی: «تۆ کێیت؟». وتم: «بەخوا من دزم». ئیتر شێخ ئەحمەد هەر مرد لە پێکەنینا؛ لە پاشا وتی: «مردووت مرێ! تۆ بۆچ ئەم هەرایەت نایەوە، نەتهێشت شتێکمان دەستکەوێ؟» وتم: «خزمە! بەخوا شتێك بە گەوادی دەستم کەوێ هەر نامەوێ». لە پاش ئەوە هەرکەسە چووینەوە بۆ ماڵی خۆمان و هیچمان دەست نەکەوت.

.١١٥ عەزیزاغای چاوقوڵیحەکایەتخوان نزیکی سەد ساڵێك عەمری هەبوو؛ نەخۆش کەوتبوو، بێ حاڵ بوو. پێی ئەڵێن ئەوا حاجی ئەمینی ئەحمەدی خێلە هاتە لات. بەو بێحاڵییە بە کوڕەکانی ئەڵێ: گورج سەرینێ بدەنە پاڵم و هەڵمسێنن؛ کە دانیشتم، عەباکەم بکەنە بەرم. ئەوانیش بە گورجی وەکوو باوکیان وتوویە وەها ئەکەن؛ مەگەر لەگەڵ حاجیئەمین ڕقیان لە یەکتری بووە. کە حاجیئەمین دێت ئەڵێ: ئاغە چلۆنی؟ ئاغە ئەڵێ: بەخوا شوکر چاك بوومەتەوە؛ هیچ ناخۆشیم نەماوە؛ ئەوە ئێستا ئەچم بۆ بازاڕ و ئەڵێ: ئا کوڕە ـ غەنی ـ ڕۆڵە قەنەیەکم بۆ تێکە. قەنەی بۆ تێ ئەکەن؛ دەست ئەکا بە قەنەکێشان. وتیان: حاجی ئەمین هەناسەیەکی هەڵکێشا و ڕۆیشت؛ هەر لە دەرگاوە چووە دەرەوە ئیتر عەزیزاغا گیانی دەرچوو.

١١٦. مەلا مەئموونی هەڵەبجەیی سواری ماینێکی لەڕی گەڕی خارشتاوی کلك ڕووتاوە ئەبێ و ئەچێ بۆ شاری هەورامان.

کە لە دوورەوە دەرئەکەوێ، بە جارێ پیاو و ژن و منداڵ بە هەڕا کردن ئەچن بە پیریەوە؛ یەکێ دەستی ماچ ئەکا، یەکێ داوێنی، یەکێ ئاوزنگیەکەی، یەکێ کلکی ماینەکەی. ئەم لەو ئەپرسێ ئەمە چییە و ئەو لەو، یەکێ لە یەکێکی‌تر، هەر ئەڵێ نازانم؛ هەتا پیاوێکی ڕیش‌سپی ژیر دێتە پێشەوە لێی ئەپرسن: ئەمە چییە؟ ئەویش ئەڵێ: «ئینە حەزرەتو عەلین و ئانەش دوڵدوڵەن سوارش بیەن». لە دوای هەموو چشتێ لالە زۆراب دێتە پێشەوە بە خەڵکەکە ئەڵێ: «نا، نا، نا، حەزرەتو عەلی نیەن؛ ئینە حەمەد پاشایەنی و ئانەش ئەسپە سعوودەنی»[1].

١١٧. کابرایەکی کورد لە موغاغ بوو ساڵێك لە وەختی بەهارا بە ماڵەوە چووە «سووسەی گرێ» ئەم کابرایە ناوی ڕەمەزان بوو، مانگایەکی هەبوو سەرلەئێوارە کە گاگەل دێنەوە مانگاکەی نایەتەوە. ئەویش بە فکری خۆی وائەزانێ کە مانگاکە چووەتە ناو دەغڵەوە، ئەڵێ: قەیناکا با بۆ خۆی بلەوەڕێ.

شەخسێك لە نزیك ماڵەکەیەوە بوو ئەڵێ: شەخسەکە مانگا زەردم دایە دەستت ئاگاداری بە، مەگەر مانگاکە ئێوارە هاتۆتەوە لەولای شەخسەکەوە چاڵێك ـ کە هاوین بۆ دەغڵ هەڵکەنراوە و لەبەر باران پڕ بووە لە ئاو ـ ئەکەوێتە ناویەوە مردار ئەبێتەوە.

ئینجا بەیانی کەسێك چاوی پێ‌ئەکەوێ بانگی ڕەمەزان ئەکات، ڕەمەزان ئەچێت و چاوی پێ‌ئەکەوێ دەست ئەکا بە باوکەڕۆ، خەڵکەکە

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «نا نا نا، حەزرەتو عەلی نیا؛ ئینە حەمەدپاشان و ئانەیچ ئەسپی سعوودین». (هەڵەگر).]

گێڕایانەوە وتیان: ڕەمەزان ڕووی کردبووە شەخسەکە و ئەیوت: ئەرێ شەخسەکە باوکتم کوشتگە، دایکتم کوشتگە، هەموو ڕۆژێك فاتحەم بۆ خوێندگی، ئێوارە چەند دەخیل و دەستە داوێنت بووم، ئاگات لە مانگاکەم وێ. نەدەبوو بێژی ڕەمەزانی مل شکاو هەڵسە مانگاکەت کەوتگەسە چاڵەوە، هەر خەوەرێکت بدامایە، دراوسێتی وا ئەوێ؟ ئای جارێکیتر فاتیحەت بۆ ئەخوێنم! مەگەر بکەمە قنگی خۆت و دایکتەوە دەویت باوك!.

**١١٨.** مەلای تەڕەمار ـ کە پیاوێکی بەناوبانگە ـ دوو ژنی ئەبێ. شەوێك ئارەزووی ژنە بچکۆلانەکەی ئەبێ، بەڵام لەبەر ژنە گەورەکەی ناوێرێ. ئاخری پێ ئەنێ بە جەرگی خۆیا بە ژنە گەورەکە ئەڵێ: توخوا زۆرم تینووە، بچۆ گۆزەیەك ئاوی تازەم لە کانی بۆ بێنە. ژنەکەش هەڵئەستێ گۆزە ئەنێ بە شانیەوە و ئەڕوا. کە ژنە دوور ئەکەوێتەوە مەلا دەرگا پێوە ئەدا دەست ئەکا بە ئیشی شەرعی.

ئینجا ژنەکە ئەچێتە کانی گۆزەکە ئەشوا و پڕی ئەکا؛ لە دڵی خۆیا لێکی ئەداتەوە ئەڵێ: بەم شەوە ئەم پیاوە بەبۆنەی ئاو هێنانەوە دەستی بە منەوە نا؛ بەخوا ڕەنگە فیکرێکی بووبێ؛ با بچمەوە.

بە پەلەپەل دێتەوە. وەختێ ئەنێ بە دەرگاوە تەقەی دەرگا دێت. مەلا ئیشی تەواو ئەبێ، بەڵام پێی ناکرێ دەرپێیەکەی لە پێ بکاتەوە؛ بەرماڵێ لەوێ ئەبێ فڕکە ئەکاتە سەر بەرماڵەکە بۆ ئەوەی ژنەکە هیچ فیکرێکی لێ نەکا، دائەنیشێ و ئەڵێ: «**التّحيّات للّٰه السّلام عليك**». ژنەکە هەستی پێ ئەکا کەوا شتێکی قەوماندووە، ئەچێ دەست ئەبا کەواکەی لا ئەدا و تەماشای ناو گەڵی ئەکا، ئەڵێ: «سا پیاوی درۆزن

ڕووی بابی ڕەش بێ! ئەم کێرە، کێری "التّحیات لله"یە؟» مەلا ئیتر پێ ئەکەنێ.

۱۱۹. سێ زەلامی کورد چوونە شاری سنە لە ماڵی پیاوێك میوان بوون. لە بەرانبەر ماڵی خانەخوێکەوە مزگەوتێك هەبوو؛ تەماشایان کرد خەڵکی هاتوچۆیان ئەکرد. یەکێکیان ناوی حەمە بوو، پیاوێکی زۆر ژیر بوو. لە دوو هاوڕێکەی تری پرسی بزانم ئەزانن ئەو خانگە چییە؟ هەردووکیان وتیان: نایزانین. وتی: دەسا من ئەیزانم، وتیان چییە؟ وتی: «وەڵڵا ئەوە نوێژدانە». کابراکان وتیان: «دەك بە چاوی چڵکنەوە بی حەمە، ئەمیشت زانی؟» خانەخوێکەیان گوێی لەم گفتوگۆیە بوو؛ نوێژی شێوان وتی: خزمینە! با بچین بۆ نوێژ. وتیان: باشە. یەکێکیان وتی: حەمە، خۆ ئێمە نوێژ نازانین؛ چی بکەین؟ وتی: قەیناکا مەلا چی بکا ئێمەش ئەوە ئەکەین. ڕەفیقێکیان ڕووی کردە ئەویتر وتی: «بێ ئەقڵ! پیاو لەگەڵ حەمە بێ شەیتان فەخری کردبێ چۆن یەکی لەسەر هیچ ئەکەوێ؟» کە چوونە مزگەوت هەرسێکیان لە تەنیشت یەکەوە لە سەفێکدا ڕاوەستان.

مەلا چووە «ركوع». حەمە لەگەڵ یەکێ لە ڕەفێقەکانیا چوونە ڕکووع؛ بەڵام یەکێکیان هەر ڕەپ ڕاوەستا بوو. حەمە لە نوێژەکەدا وتی: «کوڕە عەول مردگت بمرێ بچەمێرەوە مەلا ڕمیا». بۆ گۆبەند لە ڕکاتی دووهەما بۆچی عەول ترێکی نەکەند. شەفە لە نوێژەکەدا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: «هەی بە کێرم، هەی بە کێرم». عەولیش وتی: «شەفەی دەویت باوك تۆ ئەبێ هەروا بێ‌حەیا بی؛ بکەم وە قنگ باوکتەوە سا ڕاوەستە با بچینە دەرەوە؛ وە شێخ کەریم! ئەوەندەت لێ‌دەم وە کەر بێژی باوە».

شەفە وتی: «مەگەر دوو تری‌تر لە کێرم بدەی». ئیتر حەمە ڕووی تێ‌کرد و وتی: «کەرانباوگاوینە! ئەم شەڕەتان لە چییە؟ ئاخر نازانن نوێژەکەتان ئەورگێ ئەگەر قسە بکەن؟».

١٢٠. سێ زەلام ئەچنە مزگەوتێك بۆ نوێژ کردن. یەکێکیان زۆر ئاقڵ ئەبێ، ئەڵێ پیاو لە نوێژا نابێ قسەکا و هەرچی مەلا بیکا ئەبێ ئێمەش ئەوە بکەین. کە ئەچن و نوێژ دائەبەسن، مەلا ئەچێتە ڕکووع؛ یەکێکیان هەروا ڕەپ ڕائەوەستێ. یەکێ لە هاوڕێکانی پێی ئەڵێ: «کوڕە بڕمێرەوە، مەلاکە ڕمیا». ئەویش پێی ئەڵێ: «ئۆهۆ! دەستت وە گونم! نوێژەکەت وڕیا». ئەوی ئاقڵیشیان ئەڵێ: «دەویت باوك چییە ئەم هەرا و هوریایە؟ خۆم خاسم کرد نوێژم نەوڕیا».

١٢١. حەمەبەگی‌حاجی ڕەسووڵ‌بەگ گێڕایەوە وتی: کابرایەکی کورد مەڕومالاتێکی زۆری هەبوو لەگەڵ تاقە کوڕێکا؛ زۆری خۆش ئەویست و هەموو ڕۆژێکیش ئەینارده لای ڕانەکە. ڕۆژێك کابرا لەگەڵ ژنەکەی قسەی کرد وتی: زۆر حەز ئەکەم ژن بۆ کوڕەکەمان بهێنین و «ئەلی‌مرا»ی برام کچێکی هەیە؛ هەرچی بێ ئەو باشترە، با بۆی بێنین. بەم جۆرە بڕییانەوە و کابرا چوو خوازبێنی کرد؛ لە پاش چەند ڕۆژ بووکیان گواستەوە.

ئێوارە کوڕە ڕانەکەی هێنایەوە بۆ دەوری ماڵ، بانگیان کرد. کە هات چاوی بە بووك کەوت، ڕووی کردە هاوڕێکی خۆی -کە دراوسێ و هاوماڵیان بوو لەو شوێنە بوو- وتی: حەمە ئەوە چییە؟ وتی: «ئەوە بووکە بۆ تۆمان هاوردگە، بچۆرە لای». وتی: «حەمە مردگت مرێ! من بەم گەڵوگون و ڕانکەوە حەدم چییە بچمە لای ئەو هۆرییە! ئەو لە ئاڵووالادا

ئێژی گوڵنگی سوورە». حەمە وتی: «کوڕە نایناسیتەوە؟» وتی: «ناوەڵڵا!» وتی: «کوڕە ئەو کتکاڵی کەنیشکی مامەتە؛ کتکاڵ، خۆم و خۆت کە لە کەوانەی ڕانا هەموو ڕۆژ کەڕەتێ لە دواوە شتمان لێ دەرئەهاورد». بەم جۆرە پێی ناساندووە.

شەو بەسەردا هات؛ زاوایان هێنا بیکەنە پەردە، دایکی زاوا وتی: ڕۆڵە بێ ئامۆژگاریت بکەم کە چۆن بچیتە لای. وتی: دایە بۆچی وا ئەزانی هیچم نەدیگە؟ چووە پەردە زۆر چاك کوتایە پاش بووك. هاتە دەرەوە وتی: بووم بە زاوا. دایکی زاوا لەگەڵ یەك دوو ژن چوون تەماشایان کرد هیچ نیشانەیەك نەبوو. زاوایان بانگ کرد وتیان: کوڕە خۆ تۆ درۆ ئەکەیت نەبوویت بە زاوا. ڕووی کردە ژنەکان و وتی: «ئەی ئەگەر نەبووم بە زاوا ئەمە گووی ئێوەیە بە لەشمەوە؟!» ژنەکان وتیان وەرە وانابێ؛ شوێنەکەیان بۆ باس کرد و دووبارە ناردیانەوە ژوورەوە. ئەمجارە کە ئیشی جێبەجێ کرد و چاوی بە خۆین کەوت هاتە دەرەوە سەری نایە گوێی باوکییەوە و وتی: «باوە! هەتا ماڵ مامۆم نەیانزانیگە بارکە بڕۆین». باوکی وتی: بۆچی چی بووە؟ وتی: باوە هورگیم دڕیگە. باوکی وتی: مەترسە ڕۆڵە؛ ئەوە نیشانەی زاوایەتییە؛ قەیناکا.

سبەینێ ڕۆژ بووەوە کوڕە وتی: «بەخوا باوە لەگەڵ ڕان ناچم؛ یان ئەبێ کتکاڵیشم لەگەڵ بێ». باوکی وتی: ڕۆڵە نەبووە بە باو کتکاڵ بێت؛ نابێ بێت. وتی: «دەسا کوزەکەی ئەوەم». باوکی فیکری کردەوە چوو گورچیلەی مەڕێك ـکە سەریان بڕیبوو ـ هێنای دایێ و وتی: ئەوە کوزەکەیە بیبە لەگەڵ خۆت.

کوڕە گورچیلەکەی هێنا لە دووری ئاواییەوە سەر بەردێك داینا، هەر تۆزە ناتۆزێك ئەچوو ماچێکی ئەکردەوە و دائەنایەوە. کوتوپڕ قەلەڕەشێك

هات گورچیلەکەی هەلگرت و بردی. کوڕە بە باوکەڕۆ هاتەوە بۆ ماڵەوە. باوکی پرسی: چییە؟ وتی: «باوە! قەل هات کوزەکەی برد». باوکی وتی: «ڕۆڵە، هەرا مەکە؛ بۆم سەندوویەوە». وتی: «بەخوا بە چاوی خۆم نەیبینم بڕوا ناکەم». وتی: بچۆ تەماشا کە. کوڕە چوو ژنەکەی دەرپێی داکەند و نیشانی دا. کوڕە فیکەیەکی کرد و وتی: «هەی باوکم بێ وە قوربانت! لە ترسی قەلەکە خۆی خەزانگەسە کێوە!؟».

١٢٢. دوو کابرا دراوسێ بوون. یەکێکیان دوو ژنی هەبوو، هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو هەڵئەسا ئەچوو لە مزگەوت نوێژی ئەکرد. دراوسێکەی پرسی: ئەوە بۆچی تۆ هەموو ڕۆژێ ئەچی نوێژی بەیانیان ئەکەی بە جەماعەت؟ منیش زۆرم لەلا خۆشە بێم و نوێژ بە جەماعەت بکەم، کەچی خەبەرم نابێتەوە و هەموو ڕۆژێ نوێژی بەیانیم ئەچێ. کابرا وتی: خزمە! تۆ تاقە ژنێکت هەیە؛ چونکە هەر خۆی لە ماڵایە دەربەستی ئەوە نییە لە قیامەتا بچێتە بەهەشت یا بچێتە جەحەننەم. پرسی: ئەی تۆ؟ وتی: من چونکە دوو ژنم هەیە لەبەر ئەوە کە هەریەك بە جیا دڵم ڕابگرێ لەگەڵ مەلا بانگی دا یەکێ جلەکانم ئەدۆزێتەوە و یەکێ قاچم ئەشێلێ و بە دەورما دێن تا خەبەرم ئەکەنەوە، جلەکانم بۆ ئەگرن هەتا لە بەری ئەکەم؛ پێڵاوەکانم بۆ دائەنێن و ئەڵێن با نوێژەکەت نەچێ و خوا لێت نەڕەنجێ.

کابرای‌تر وتی: وا چاکە منیش ژنێکی‌تر بۆ خۆم بێنم. چوو ژنێکی‌کەی هێنا؛ زۆری پێ‌نەچوو بشێوی و ئاژاوە کەوتە ماڵەکەیەوە؛ ئیتر هەموو وەختێ شەڕ و هەرا بوو. کابرا عەیشی لێ تاڵ بوو؛ هێشتا نیوەشەو بوو لە ماڵ دەرئەپەڕییە دەرەوە. بەیانییەك کابرای هاوڕێ هاتە مزگەوت

سەیری کرد ئەوا ئەو زووتر هاتۆتە مزگەوت؛ بە پێکەنینەوە وتی: «هەر دوعای خێرم بۆ بکە ئاگات لێیە بەیانیان چۆن زوو دێیت بۆ مزگەوت و نوێژەکەت ناچێ». کابرا وتی: «یاخوا بەو دوعای خێرانە بی کە من بۆت ئەکەم هەی ناجسنێ بەد فەساڵ! ئاخر باوکتم کوشتبوو؟ براتم کووشتبوو؟ تۆ چە ڕقێکت لە من بوو بەم دەردەت بردم؟».

١٢٣. جارێـك فەتاحـی بارامی هەمەوەند دەرئەچـێ بۆ ڕاوەڕووت. لەو دەشـتە تووشـی هەلاجێك ئەبێت؛ لە دڵی خۆیا ئەڵێ: با سەیرێك بکـەم بـە هـەلاج. ئەڵـێ: «ئـەرێ کاورای هـەلاج! ئـەوە بـۆچ هەرشتێك ئەبـێ ئەڵێـن وەکـوو گونـی هـەلاج ئەلـەرزێ؟ ئـا مشـتە و کەوانەکـە هەڵگـرە و تـۆزێ هەلاجـی بکـە بزانـم گونت چـۆن ئەلەرزێ». هەلاجیـش ئەڵـێ: ئاغـە پیاوەتیـت بـێ، وازم لـێ بێنـە؛ مـن کابرایەکـی هەژارم با بڕۆم بەڕێی خۆمەوە. ئەڵێ: ئەوە کەلامم بێ! هەلاجی نەکەی ئەتکوژم. هەلاج ناچار دەرپێی بۆ دائەکەنێ و لەسەر بەرزاییەك دەست ئـەکا بـە هەلاجـی کـردن و فەتاحیش ئەچێتە شـوێنێکی نزم لـە ژێرەوە سەیری گونی ئەکا بزانێ چۆن ئەلەرزێ.

تەماشا ئەکا وا شتێکیتر بە گونیا شۆڕ بووەتەوە؛ ئەڵێ: هەلاجە ئەوە چییـە؟ ئەڵـێ: پریاسـکەیە. ئەڵـێ: کەواتـە بیـدە بـە مـن، تۆ سـێ گونت بۆچییـە؟ لێـی ئەسـتێنێ؛ کـە ئەیکاتـەوە پارەیـە. پارە هەڵئەگـرێ و ئەڵێ: هەلاج بەسە ئیتر؛ گەردنم ئازا کە. وە کەلام من وتم هەردوو گونت ببینم نەمزانی بووە وە سێ. بڕۆ خوات لەگەڵ بە دوو گونەکەتەوە».

١٢٤. پیاوێك بوو لە «حەمامیان» سۆفی سولەیمانی ناو بوو. پیاوێکی زۆر لـە خواتـرس و بەدیـن و موریـدی «شـێخی بورهان» بوو؛

هەموو دەمێ لە مزگەوت خەریکی زیکر و فیکر بوو؛ ئێجگار کە ناوی خۆی بیستبووەوە (سۆفی سلێمان پیاوێکی دیندارە) بە تەواوی لە وزە دەرچووبوو؛ لە پێش نیوەشەوا ئەچووە مزگەوت و خەریکی تەسبیحات بوو. دەستە فەقێیەك لە حەمامیان هەبوون، سۆفی سلێمان لەگەڵیان تێکچووبوو؛ ئەم لێیان بووبوو بە کاك ئەحمەدی شێخ. هەر پێ ئەوتن: فەقێنە دیانەت وا نابێ کە ئێوە ئەیکەن. ئەیویست ئەوانیش وەکوو ئەم وا بن. لەگەڵ ئەوەدا ئەوان خەریکی خوێندنی خۆیان بوون، سەرەڕای ئەمە ژووری مزگەوتەکەش پاڵی دابوو بە حوجرەی فەقێکانەوە. ئەم بە شەو کە ئەچوو زیکر و فیکری ئەکرد، بە جارێ موتاڵا و دەوری لەوان تێك ئەدا. ئەگەر بیانوتایە سۆفی سلێمان وا نابێ، ئەو ئەیوت ئێوە زەنیقن!.

ڕۆژێك فەقیەکان قسە ئەکەن بە یەك کە چارێکی بکەن. فەقێیەکی قوماربازیان تیا ئەبێ ئەچێ بە لایەوە ئەڵێ: سۆفی سلێمان من تا ئێستە هەرچێکم لەگەڵ کردوویت ئەبێ لێم ببووری و بە خەڵەتا چووبووم. دوێنێ شەو خەوم دیوە و پاشەڕۆژێکی زۆر گەورەت هەیە. لە ئێستە بە دواوە لەسەر دەستی تۆدا تۆبە بێ هەر بەو شەرتە لێم دلگران نەبی و چاوت لێم بێ».

سۆفی سلێمان بەم قسەیە تۆزێ خۆی گڤ ئەکاتەوە و ئەڵێ: «ئاخر فەقێنە! من هەموو جار پێم ئەوتن کە دنیا خاڵی نییە لە پیاوچاك، لە سۆزی ناڵەی ئەولیایان سەر بکەنەوە».

بە دوو ڕۆژ دوای ئەوە فەقێ ئەچێتەوە لای سۆفی سلێمان و ئەڵێ: «ڕۆحم بە قوربانت بێ! لە خەوما چووبووی بۆ ئاسمان و وایان پێ وتم کە بوویت بە پێغەمبەر». سۆفی سولەیمانیش ئەڵێ: «خوا ئەیزانێ؛ منیش لە خۆما شتێك شك ئەبەم؛ چل ساڵە زیکر و فیکر ئەکەم،

هەڵبەت ئەبێ بەرێکی بێ بۆ ئەم ئۆمەتە». ئیتر فەقێ لەم بەینانەدا هەموو دەمێ دەستی ماچ ئەکا و دەست لەسەر سنگ ڕووبەرووی ئەوەستێ و سۆفیش جارجار بە بۆنی کەرامەت قسەیەکی لەگەڵ ئەکا.

چەند ڕۆژێکی پێ ئەچێ ڕۆژێکیان بەیانی زوو فەقێ هەڵئەستێ و ئەچێتە خزمەتی سۆفی سلێمان ئەڵێ: «ڕۆحم بە قوربانت بێ شاهی ئەولیا! سەرەی ئەوەت هاتووە بچی بۆ ئاسمان. ئێمشەو لە خەوما بە خزمەتی شێخی بورهان گەیشتم؛ فەرمووی سلێمان پێ گەیشت و شەوی دوایی ئەچێ بۆ ئاسمان». سۆفی سلێمان هووێکی کرد و وتی: «منیش وام بۆ دەرکەوتووە ئێمشەو "جبرائیل" دێت بە شوێنما». فەقێش وتی: «من لە کتێبا دیومە ئەفەرموێ: لەم ئۆمەتە یەکێك لە بیست‌وحەوتی شەوی مانگێکا لە پاش نیوەشەو کە دنیا کش و مات بێ "جبرائیل" عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەیبا بۆ ئاسمان و ئەبێ بە "پێغەمبەر". ئەوا ئێستە بۆم دەرکەوت کە ئەو کەسە زاتی موبارەکی جەنابتە».

سۆفی ئمێکی بۆ کرد و هەستا چووەوە ژێر ڕیشەکەی تاشی و کەوایەکی سەوزی هەبوو، لەبەری کرد و هاتەوە دانیشت بەو نیازە کە ئێمشەو ئەچێ بۆ ئاسمان. ئیتر لای کەسیش دەنگی نەکرد؛ هەر تۆزە نە تۆزێك ئەچوو دەستنوێژەکەی تازە ئەکردەوە و تەزبیحەکەشی ئەخستە ملی.

فەقێش لەولاوە کارەساتی ئەم بەینەی هەموو سەعاتێ گەیاندووە بە فەقێیەکانی‌تر و ئینجا هاتن لە پێش هەموو شتێکا شتومەك و ئەسپابی خۆیان پێچایەوە و هەریەکە بۆخچەی خۆی حازر کرد و داینا. ئینجا دوو گوریسیان پەیدا کرد و پێکیانەوە بەست. دنیاش زستانە؛ تف هەڵخەی بە ئاسمانا ئەیبەستێت.

کەوتە شەوێ و بەشێك لە شەو ڕۆیشت؛ هەموو خەڵکی ئاوایی نوستن؛ لێیان دا چوونە سەر بانی ژووری مزگەوتەکە لە کونە بەڕۆژەکەوە بەبێ دەنگ گوریسەکەیان ڕاهێشتە خوارەوە. سۆفی سولەیمانیش لە خوارەوە ئەوە دانیشتووە و زیکر و فیکر ئەکا و هەر چاوەڕێی ئەوەیە جبرائیل بێت بە شوێنیا. ژووری مزگەوتەکەش زۆر ساردە؛ بەڵام گەرمی بە خزمەت گەیشتنی بینایی چاوان سۆفی سولەیمانی گەرم کردۆتەوە.

سۆفی ئەوەندەی زانی وا شتێك لە عاستی ئەو هاتە خوارەوە. ئەویش هەر بە عەنقەستی لە عاستی کونە بەڕۆژەکەدا دانیشتبوو. شتەکە وردە وردە وەکوو مار کشا و هاتە سەر سەریەوە، ئەمیش دەستێکی بۆ برد، سەیری کرد گوریسە. هوویەکی کرد و لە خۆشییا وەختبوو پەڕ دەر کا. دەنگێکی ناسك لەسەر بانەکەوە هات وتی: «یا پێغەمبەر! گوریسی مەحەببەت لە خۆتەوە ببەستە». سۆفیش گوریسی لەناو قەدی توند شەتەك دا و وتی: «ئیش بکە». ئینجا وردە وردە هەڵیانکێشا هەتا نزیك بە بن میچکەیان کردەوە و سەری دای لە بن میچکە. وتی: «جورەئیل لەسەر خۆت». ئەوان تۆزێکیتر گوریسیان ڕاکێشا و سۆفی توند بوو لە بن میچ؛ وتی: «جورەئیل! ئەڵێم لەسەر خۆت». خێرا گوریسیان ڕاکێشا و سۆفی سلێمان بە تەواوی لە بن میچ توند بوو. تۆزێ عەزیەتی پێ گەیشت؛ وتی: «جورەئیل! قسە بە گوێتا بچێ؛ ئەڵێم لەسەر خۆت». هەموو پەراسووەکانی وەختبوو بەسەر یەکا ورد ببێ وتی: «جورەئیلی کەرانباوگاو! هەموو پەراسووم شکا، لەسەر خۆت».

ئینجا گوریسیان وەکوو داری تەون لە سەر بان بەستەوە و هاتنە خوارەوە. هەرکە نەوی لە بوخچەی خۆی و حەمامیانیان؛ هەر بەو شەوە و بەو تۆفە بەجێ‌هێشت. «سۆفی سلێمان»یش لەملاوە هەر

دەست ئەکا بە جنێودان بە جوبرائیل و هەر پێی ئەڵێ لەسەر خۆت هەتا زمانی ئەشکێ.

ئیتر ڕۆژ ئەبێتەوە خەڵکی وردە وردە دێن بۆ نوێژی بەیانی؛ تەماشا ئەکەن لەم ژووری مزگەوتە نووزەیەك دێت و بەڵام ڕەنگی نییە. لە ئاخرا سەر بەرز ئەکەنەوە ئەوا یەکێك لە بن میچەکە توند بووە و ئەم نووزەیە لەوەوەیە. ئەچن ئەیکەنەوە و ئەیهێننەوە خوارەوە؛ سەیر ئەکەن ئەمە سۆفی سلێمانە و بەحاڵ گیانی تیا ماوە و زمانی نییە قسە بکا؛ هەم لە سەرمانا، هەم لەبەر لەشی. ئەیدەنە ئاگرەکە گەرمی ئەبێتەوە ئەکەوێتە قسە و کارەساتەکە ئەگێڕێتەوە. خەڵکەکە سەیر ئەکەن فەقیەکانیش دیار نین؛ کە ئەچن بە شوێنیانا تەماشا ئەکەن ڕۆیشتوون؛ ئینجا ئەزانن ئەمە کەتنی ئەوان بووە. ئیتر سۆفی سلێمان بە نیوە نمەك و دەوا و دەرمان بە یەك دوو مانگ ئەو وەختە چاك بوەوە و ئاقڵ بووبوو بۆ دەستە فەقێیەکی تر.

١٢٥. کابرایەکی بانگوێژ بە منداڵانی ئەخوێند. کوڕێکی زیرەك و وریای هەبوو؛ کابرا لەگەڵ دایکی کوڕەکەدا ڕێ کەوتبوو. کوڕە ڕۆژێك چووە لای باوکی وتی: بابە مامۆستام لەگەڵ دایکم بە تەنها لە ژوورێکدا بوون، با بچین مامۆستام بکوژین. باوکەکەی وتی: ڕۆڵە حەواڵەی خوای بکە. لە دوای سێ چوار ڕۆژێکی کە دیسان ئەڵێ: بابە ئیمڕۆ چاوم لێ بوو مامۆستا دەستی لە ملی دایکما بوو با بچین بیکوژین. کابرا ئەڵێ: با ئێمە نەیکوژین هەر حەواڵەی خوای بکەین.

کوڕە تەماشا ئەکا باوکی هیچ نابزوێتەوە؛ هەڵئەستێ ئەچێ شووشەیەك عەرەق ئەکڕێ لە باخەڵی قایمی ئەکا و لە پێش بانگی شێواندا ئەچێتە

مزگەوت لای مامۆستای [و ئەڵێ:] مامۆستا زۆر دەمێکە حەز ئەکەم جارێك لەگەڵ تۆ بێمە سەر منارەکە و تەماشای دنیا بکەم. مامۆستا ئەڵێ: زۆر چاکە ئێستە ئەچم بانگ ئەڵێم تۆیش وەرە.

هەردووکیان سەرکەوتنە سەر منارەکە. بانگوێژەکە هەر لەگەڵ وتی «الله اکبر»، کوڕە پاڵێکی پێوە نا. کابرا کەوتە خوارەوە و دەسبەجێ شووشە عەرەقەکەشی بە دوایا فڕێ دایە خوارەوە. کابرا هەر لە حەواوە هەپروون هەپروون بوو. خەڵکی کە هاتنە دیاری، شووشەیەکی عەرەقش شکاوە؛ عەرەق بەو ناوەدا بڵاو بووەتەوە. وتیان: ئای خۆ ئەم بانگوێژە عەرەقخۆر بووە و بە سەرخۆشی کەوتۆتە خوارەوە.

کوڕە ئیتر هاتە خوارەوە و چوو بە باوکی وت: تۆ ئەزانی مامۆستام عەرەقی خواردبووەوە لەسەر مەنارەکە کەوتە خوارەوە پارچە پارچە بوو؟ کابرا وتی: ڕۆڵە، پێم نەوتی حەواڵەی خوای بکە؟ کوڕە وتی: «قوڕ بەسەر ئەقڵت! بەخوا ئەگەر حەواڵەی خوام بکردایە هەتا دە ساڵیکە لەگەڵ دایکم هەر گەمە و گاڵتەی ئەکرد. خۆم لەسەر مەنارەکە پاڵم پێوە نا و خستمە خوارەوە».

**١٢٦.** عەلیاغای پشدەر لە دێی «گەڵاڵە» دائەنیشت. هەموو هێزێکی ئاغەیەتی دابووە سەر قسەی زل گێڕانەوە. گێڕایەوە وتی:

سەیدێك لەو سەرە هاتبووە لای ئێمە؛ پێیان ئەوت «سەی بارۆکە». ئێمەش زۆر حورمەتمان ئەگرت و لە ڕاستیشدا پیاوێکی خانەدان بوو؛ لێی قەومابوو. ژنێکی بە عیشوە و نازی بوو؛ «سەیزادە سەمەن»یان پێ ئەوت؛ لووتی بە سەی بارۆکەدا نە ئەهێنا. گەڕی ئاڵاندبووە حەسەنی پیاوی من، لە خشتەی بردبوو. شەوێکیان حەسەن پێی وتم: «ئاغە،

ئەو شەوە دەبێ خوازبێنییێکم بۆ بکەی، تا ماڵی سەی باڕۆکە تەشریفت بچێ». گوتم: حەسەن، سەی باڕۆکە کێی هەیە خوازبێنیت بۆ بکەم؟ وتی: ئاغا تۆ تەشریفت بچێ، لەوێ تێدەگەی.

منیش هەڵسام چوومە ماڵی سەی باڕۆکە؛ گوتم: جەنابی سەید بۆ خوازبێنێ هاتووم. سەید وتی: «جا قوربان! من هیچ کەسم نییە ژنەکەم نەبێ». لەولاوە ژنەکەی ڕاپەڕی وتی: «سەید! زاتێکی وەکوو ئاغا بە سەر و سیمایەکەوە تەشریفی هاتووە قەت نەشێ تۆ جوابی بدەی». من لە باری خۆم تەریق بوومەوە. ژنە و خزمەتکارەکەم لە وڵاتی دەرکرد و ژنێکیترم هێنا بۆ سەی باڕۆکە».

**١٢٧.** حەمەبەگی حاجی ڕەسوول بەگ گێڕایەوە وتی: ساڵێك عەسکەر بووم؛ چاوش بووم. ئەو وەختە لەگەڵ زابتێکی ئالایی (بە سەبرێك وتی: ڕەزابەگ بوو) بە مەفرەزە چووینە دێیەك. کوێخای دێیەکە هات بە پیرمانەوە بردینی بۆ مزگەوت؛ چای بۆ لێ نابن، ترێیەکی زۆری بۆ هێنایبن. زۆر خزمەتی کردین. بەرامبەر بەم هەموو خزمەتە ئاغە زابت هەر جنێوی بە کوێخا ئەدا. منیش کوێخاکەم هەر لە زووەوە ئەناسی؛ زۆرم لەلا ناخۆش بوو کە ئەوەندە بە چاوی سووکەوە سەیری ئەکا. چوومە بن دەستیەوە وتم: ئاغە ئەم کوێخایە فەقیرە چاوت لێیە چ خزمەت ئەکا؛ بۆچی ئەمەندە ناشیرینی پێ ئەڵێی؟ وتی: «عەزیزم مەئموور ئەبێ زەبر و زەنگ بنوێنێ بۆ ئەوەی زیاتر بە گەورە تەماشای کەن».

لە پاشا ئیتر چووم بۆ سەر ئاواییەکە دیم کوێخا هات؛ وتی: فلانی ئەم کابرایە چاوت لێیە چیم پێ ئەکا؟ منیش وتم: کوێخا، بەڕاستی من

لە تۆ دڵگرانترم؛ بەڵام بڵێم چی تەربیەتی ئاوایە کە ئەیبینی. ئینجا کوێخا وتی: من بیستوومە ئەم ئاغایە زۆری پێ خۆشە بڵێن تۆ جەهێڵی و پیر نیت. تکا ئەکەم تۆ کە چوویتە دیواخان، بانگم بکە بفەرموو ئا تەماشای دەستم بکە بزانە عومرم چەندە؟ ئیتر بەسمە.

منیش کە هاتمەوە هەیوانی مزگەوتەکە دانیشتم و بانگی کوێخام کرد و وتم: بزانە من عومرم چەندە؟ کوێخا هاتە بەردەمم دەستی ڕاستمی گرت و تەماشای بەری دەستی کردم. لە پاشا سەری هەڵبڕی تەماشایەکی سەروچاومی کرد وتی: فلانی تۆ بە ڕواڵەت منداڵی، کەچی ماشەڵڵا بە عومر گەورەی وە عومرت پەنجا هەتا پەنجا و دوو ئەبێ.

ئاغە کە ئەمەی بیست بانگی کرد: «ئا وەرە کابرا ئەم عیلمەش ئەزانی؟» کوێخای قومارباز وتی: قوربان ئیمە لە باوك و باپیرمانەوە ئەم عیلمە ئەزانین. فەرمووی دە تەماشای دەستم بکە ئاخۆ من عومرم چەندە؟ قەدرێ تەماشای بەری مستی کرد و دوایی وتی: «سوبحانەڵڵا! ئاغە جەنابت ڕاست پێچەوانەی حەمە چاوشی؛ بە ڕواڵەت گەورە و بە عومر منالّی؛ هیچ شکم تیا نییە کە چل‌وپێنج ئەوپەڕی چل‌وشەش عومری جەنابتە».

ئاغە، کە ئەمەی لە کوێخا بیست فەرمووی: «حەمە چاوش! بە قەبری باوکم و بە سەری تۆ! ئەم کابرایە زۆر شارەزایە لەم عیلمەدا و سەدی سەد لێی ئەزانێ». ئینجا فەرمووی: کوێخا وەرە دانیشە. ئیتر ئەو شەوە کوێخا سەعات بە سەعات حورمەتی زیادی ئەکرد. بەیانی کە هاتین بڕۆین ئاغە زۆر لە خۆی بوردەوە و بۆ ئەو قسانەش کە بە کوێخای وتبوو دڵنەوایی کرد و وتی: لێم ببوورە نەمناسیویت کە تۆ ئەوەندە پیاوێکی لایق و زانایت.

**١٢٨.** کابرایەکی کورد گوێدرێژێکی هەبوو؛ مایەی ژیانی بوو. بە هاوینان کاروانی پێ ئەکرد و پێوە بەڕێ ئەچوو. کەوتە زستان و بوو بە ڕێبەندان. بەفر نەیئەهێشت ماڵەوماڵ بکرێ. کابرا پەکی کەوت؛ لە ماڵەوە ئەچوو بۆ مزگەوت و لە مزگەوتەوە ئەهاتەوە بۆ ماڵەوە. لەبەر بێ شتی زۆر پەرێشان بوون.

کوڕێکی هەبوو، چوو تانجییەکی پەیدا کرد و وتی: ئەم زستانە ڕاوی پێ ئەکەم و بەمە بەڵکوو بکەوینە بەهار. تانجی هێنایە ماڵەوە. باوکی چاوی بە تانجی کەوت ئاگری تێ بەربوو؛ وتی: ڕۆڵە هەر ماڵێك سەگی تێدابێ فریشتەی ڕەحمەت ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە. پیاوی چاك بە ئەم تانجییە بەرەڵا کە با خوا غەزەبمان لێ نەگرێ. کوڕەکەش وتی: باوە تۆ ئەزانی ئێمە هیچمان نییە؛ ئێستە ئەم تانجییەم هێناوە بەڵکوو جارجار ڕاوێکمان بۆ بکا و پلەگۆشتێکمان دەستکەوێ بیخۆین. باوکەکە وتی: ڕۆڵە نابێ؛ خوا غەزەبمان لێ ئەگرێ و فریشتەی ڕەحمەت ئیتر سەر ناکا بەم ماڵەدا. کوڕە وتی و باوك وتی؛ ناچار کابرا ماڵەکەی بەجێ هێشت؛ بۆ نوستنیش چوو بۆ مزگەوت لە ترسی ئەوە کە ئیتر مەلایەکەی ڕەحمەت ڕوو ناکاتە ماڵیان.

یەك دوو شەو لە مزگەوت ئەمێنێتەوە لە برسا و لە سەرمانا هێزی لێ ئەبڕێ، لە ماڵیشەوە کەس نایە بە شوێنیا. چارناچار هەڵئەستێ بەرماڵەی ئەدا بەسەر شانیا و بەرەو ماڵ ئەبێتەوە. کە نزیك ئەبێتەوە بۆنی چزوبزی گۆشت دێت بە سەریا؛ ئەمیش زۆر تامەزرۆیە. کە ئەچێتە ژوورەوە ئەپرسێ: ئەم گۆشتە چییە؟ کوڕەکەی ئەڵێ: وەڵڵا! بابە، ئیمڕۆ تانجییەکەم برد بۆ ڕاو. ئەوا بەرانەکێوییەکی کوشتووە و هێنامەوە؛ ئەم گۆشتە ئەوەیە. ئەڵێ: «ئەی تانجییەکە لە کوێیە؟» ئەڵێ: ئەوەتە لەو بەر

قاپییە.

ئینجا ئەڵێ: «توخوا ڕۆڵە تۆ هیچ ڕەحم لە دڵتا هەیە؟ ئاخر ئەو تانجییە بەسەزمانەش ڕۆحی هەیە وەکوو ئێمە؛ چۆن خوا هەڵئەگرێ ئێمە لەم بەر ئاگرە دانیشین و ئەو لەو بەر سەرمایە؟ دە هەستە، هەستە بچۆ بیهێنە ژوورەوە لەو سەرەوە، با بۆ خۆی بکەوێ؛ نەء، خۆم ئەچم؛ چل ساڵە نوێژ ئەکەم و ڕۆژوو ئەگرم مەلایەکەی ڕەحمەت لە ماڵمایە تا ئێستە شتێکیان نەدامێ. تانجییەکە ـ دایکم بە ساقەی بێ!ـ بە شەوێك تێرگۆشتی کردم. هەی بەڵام دا لە چارەی مەلایەکەی ڕەحمەت!». خۆی هەڵئەستێ ئەچێ ئەنەوێ لە کەڵەمەکەی و ئەیهێنێ لە گوێ ئاگردانەکە بەرماڵەکەی بۆ ڕائەخات و دایئەنێ!.

١٢٩. کابرایەك لەو شارەزوورە ژنێکی شاری ـکە ناسیاویان ئەبێ ـ ئەبێ بە میوانیان. ژنەکە پاك و تەمیز و جوانکەلە ئەبێ. کابرای خانەخوێ تەمای تێ ئەکا. دوو سەپانیان ئەبێ، ئەچێ لەگەڵیان قسە ئەکا بە یەك کە شەو بچنە سەر جێگەی ژنەکە. ژنە هەستی پێ ئەکا و لە وەختی نووستنا بە ژنی خانەخوێکە ئەڵێ با جێگەکانمان بگۆڕینەوە. ژنە هەڵئەخەڵەتێنێ جێگەی پێ ئەگۆڕێتەوە.

ئەکەوێتە نیوەشەو کابرای خانەخوێ سەپانەکان هەڵئەستێنێ و یەکێکیان ئەنێرێتە سەر جێگەی ژنە. سەپان ئەڕوا و تاکێك ئەکێشێ بە ژنی خانەخوێدا و ئەگەڕێتەوە. ژنەش لای وا ئەبێ مێردەکەیەتی، دەنگ ناکا. کە ئەگەڕێتەوە سەپانەکەی‌تریش ئەچێ، ئەویش ئیشی خۆی ئەکا. ئینجا کابرای خانەخوێ، خۆی ئەچێ ئەویش ئیشی خۆی ئەکا.

ژنە سەری سڕ ئەمێنێ ئەڵێ: «ئەرێ کەچەڵ ئەمە ئێمشەو چی بوو بوویت بە چۆلەکەوە، هەموو سەعاتێکی پێ نەچوو سێ جار هاتیت؟» کابرا دەنگی ئەناسێ ئەڵێ: «ئای فاتە ئەوە تۆیت؟» ئەڵێ: ئەرێ وەڵڵا. ئەڵێ: «حەمەیش گاتی؟» ئەڵێ: ئەرێ وەڵڵا. ئەڵێ: «خولەش هەر گاتی؟» ئەڵێ: ئەرێ خولەش گامی؛ بۆچی ئەوە ئەوان بوون؟ ئەڵێ: «ئەرێ وەڵڵا ئەوان بوون. ئەی ڕووم ڕەش بێ بۆ کەتنێ گێڕام. ئێستە ئەوانیش گاتیان؟» ئەڵێ: «ئەرێ وەڵڵا! گامیان. دۆشاو بە گونت». ژنەی شاریش لەولاوە بۆ خۆی ڕزگاری ئەبێ.

**١٣٠.** کابرایەکی شارەزووری بە شیعر بە باڵای یارەکەیا دێت، ئەڵێ:

خاڵێک ها وە بان گۆنای یارەوە
ئێژی پشقڵە وە دیوارەوە
نەوێ و بەردەوەل، سەراو و ژاڵە
گشتی وە قوروان پیزەی پشت ماڵە
هەر خۆم وە قوروان ئەگریجەی دێزت
کونەی سەرەوخوار خوشەخوش مێزت
نێر بووگە وە مێ، مێ بووگە وە نێر
مێنگەی کێر وە ژێر حەقی سەن لە نێر

**١٣١.** مەجە گەوجی باوەجانی بە شیعرەوە باسی یارەکەی ئەکرد کە ئەیوت:

ماڵەوماڵێە وەك مانگای چڵێس
زوڵفی لوول داگە وەك پەلکە گورێس

١٣٢. بێوەژنێکی تەرپیری دەوڵەمەند جاڕی دابوو: ئەگەر یەکێك بێت بە شەوێ چل دانەی لەگەڵ بکا مێردی پێ ئەکا؛ خۆ ئەگەر هاتوو یەکێك چوو چلەی تەواو نەکرد، سەد لیرەی لێ ئەستێنێ. بەم جۆرە گرەوی لەگەڵ خەڵك ئەکرد، خەڵکیش بە تەمای سامانەکەی ئەچوون و ئیشەکەیان بۆ تەواو نەئەکرا، قیڕ ئەیگرتن سەد لیرەکەی لێ ئەسەندن. بەم جۆرە سامانێکی زۆری پێکەوە نابوو.

ڕۆژێـك پیاوێکـی زرتەبۆزی گردەپیاو چوو وتی: من هاتووم بۆ ئەم گرەوە. ژنە شوێنی بۆ چاك کرد و دەستیان کرد بە ئیشی خێر کردن؛ هەر دانەیەکیان ئەکرد خەتێکیان لە دیوارەکە ئەکێشا. کابرا تا دە پانزەیەك ڕۆیشت؛ ها خەریکە هیچی پی نەمێنێ؛ سەرەڕای ئەمەش کە گۆشەی چاوی دایە، سەیری کرد هەتا خەتێك لە سەرەوە ئەکێشێ ژنەکە بە دزییەوە لە خوارەوە خەتێکی لێ ئەکوژێنێتەوە؛ کابرا پێی زانی. وتی: ئەوە تۆ بۆچ وا ئەکەی و ئەیکوژێنیتەوە؟ ژنە وتی: بە ئەوەندە ئایەت و بە ئەوەندە سوێند هیچم لێ نەکوژاندۆتەوە.

کابرا سەیری کرد ئەمیش نەکەوێتە فێڵکردن دەری ناهێنی و ئەیدۆڕێنێ. هەر خێرا دەسەسڕەکەی دەرهێنا هێنای بە سەر خەتەکانا هەمووی کوژاندەوە و وتی: «ئەمەی پێ ناوێ من بڵێم کوژاندتەوە و تۆ بڵێ نەمکوژاندۆتەوە؛ ئەم هەویرە ئاوێکی زۆری ئەوێ. با لە سەرەوە تێ هەڵچینەوە». ژنەکە ئەمەی دی بە جارێ ناوکی کەوت، وتی: قوڕ بە سەرم، ئەمە کەتنی بێ ئیمشەو بە جارێ ئەمکوژێ. وتی: «پیاوەکە کۆڵم دا و گرەوەکەت بردەوە».

١٣٣. کابرایەکی سوار، ڕێی ئەکەوێتە دێیەك سەیر ئەکا لەم دێیەدا تەقە و هەرایە و کەس بە سەر کەسەوە نییە؛ جەنگێکە

ئەوپەڕی نەبێتەوە. چەن زەلام کوژراوە و چەن سەر و قۆڵ شکێنراوە. هەرچەند ئەکا بۆی ساغ نابێتەوە ئەم هەرایە لەسەر چی بووە و چییە. لەبەر شڵەژاوی دێیەکەش بۆی ڕێنەکەوت لە ماڵێك تۆزێ لابدا و بحەسێتەوە؛ ناچار لێی دا و ڕۆیشت. کە ئەگاتە قەراخ ئاواییەکە سەیر ئەکا ژنێك لە گوێ سەربانێکا بە پێوە وەستاوە؛ کراسێکی درێژ و کەوایەکی سووری گوڵگوڵی لە بەرایە، سرکەییەکی بە سەرەوەیە، چمکی کەواکەی هەڵکردووە و خستوویەتە گیرفانی؛ تەشییەکی بە دەستەوەیە وردە وردە خەریکە تەشی ئەڕێسێ؛ دەمێ بنێشتیشی لە دەمایە بنێشت ئەجوێ. هەندێ جار بە لایەکی کاکیلەی قەوچەیەك لە بنێشتەکەوە دێنێت و دەنگێکی ناسکی لێوە دێت.

کابرا چوو لەم ژنەی پرسی: ئەرێ خوشکم ئەم هەرایە چییە لەم دێیەدا و ئەم هەموو کوشتارەیان بۆچ لە یەك کردووە؟ ژنە بەبێ ئەوە خۆی تێك بدا بە لەسەرخۆییێکەوە وتی: «بێژم چی برا؟ یێژن منیان گاوە، ئەم هەرایە لەسەر ئەوەیە».

.١٣٤ پیرەمێرد - بەڕەحمەت بێ - بۆی گێڕامەوە وتی: دەستەیەکی وەك گوڵ کەوتبووینە یەك؛ هەر شەوێ لە شوێنێك کۆ ئەبووینەوە؛ بە شیعر و ئەدەبیات و دوایی بە یاری فەقیانە و بەزمی قەدیمانە ڕامانئەبوارد. لە دوای ئەمانە شەوچەرەیان ئەهێنا. جا بەهۆی شەوچەرەوە کابرایەکی لاپلەرسەنگ خۆی کوتابووە ئەو کۆمەڵەوە و عەیشی پێ تاڵ کردبووین. خۆی کردبوو بە هاودەمێکی ناهەموار و لە هەموو قسەیەکدا هەڵێئەدایە و هەرزە چەنەیی ئەکرد؛ جارجارەش باسی خەڵکی ئەهێنایە ناوەوە. هەرچیشیان بهێنایەتە مەجلیس، لە پێشا

پڕی پیا ئەکرد. خوای لێخۆش بێ مامۆستا مەلا حسێنە گۆجە، یەك دوو جار سیخورمەی گەیاندێ، عاری نەئەنا؛ کەسیش ڕووی نەئەهات بە ئاشکرا دەری کا.

مەلا عەزیزێکی داودەییمان بوو زۆر گاڵتەچی و عەنتیکە بوو. ڕۆژێکیان پێم وت: «مەلا عەزیز ئەم کابرایە هەراسی پێ هەڵگرتووین و پێمان چار ناکرێ». وتی: هەر شەوێ لە ماڵی ئێوە بن من دێم بۆتان ئەتارێنم. ڕێکەوت وابوو هەر ئەو شەوە لە ماڵی ئێمە کۆ بووینەوە.

سا وەختی شەوچەرە لە هەیوان دەنگی گەفەی دوو گەماڵ هات، خەبەریان دا کەوا شوانێك هاتووە شکات لای قازی ئەکا، (ئەو سایە مەلا ئەحمەد «صائب» قازی بوو)؛ ئەیانزانی مەلا عەزیز گۆبەندی بە دەستەوەیە. مەلا عەزیز بە تەواوی خۆی خستبووە بەرگی شوانەوە، حەمە سنەیی پیاوی ئێمە و وەهابی مجەوری پەت کردبوو بە خۆی و کەڕەك و سەگ و گاڵۆکیەوە هاتە ژوورەوە وتی: قازی داد! وتیان: کوڕە چی قەوماوە؟ وتی: ئا، ئەو مەلا حسێنەگۆجە پەزی دزیوم. مەلا حسێن وتی: شتی وا نییە. قازی وتی: برام شاهێدت بێنە. وتی: بەسەر چاو وا ئەچم بۆ شاهێد؛ بەڵام سەگەکانم دڕن لە دەرەوە پێی خەڵك ئەگرن، لێرە یەکێك بۆم بگرێ تا ئەچم شاهێدەکانم دێنم.

پەتەکانی دایە دەست کابرای لاپلەرسەنگەوە. سەگەل هیچ مرەیان نەکرد؛ بێدەنگ لێ کەوتن تا شوانە چووە دەرەوە. ئێمەش لە پێش ئەوا یەکە یەکە چووینە دەرەوە. شوانە لە دەرەوە حەل حەلێکی کرد. سەگەل ڕاپەڕێن و کابرایان لەسەر گازی پشت خست، بە هاوار هاوار لە دەرگای حەوشەیان بردە دەرەوە؛ دەرفەتی ئەوەیان نەدا لە دەستیان ڕا کا. تا بردیانە ئەوێ کابرایان نیوە مەرگ و بێهۆش کرد. ئینجا شوانە چوو

سەگەلەکەی لە کۆڵ کردەوە. کابرایان بە بێهۆشی گرتە کۆڵەوە و بردیانەوە بۆ ماڵی خۆیان؛ ئیتر ببڕای ببڕ جارێکی‌تر توخنی گۆبەند بکەوێ.

١٣٥. حەبیبەڵڵاخانی باوەخانی ڕۆژێك لە دیواخانا لەگەڵ پیرۆز خانمی ژنیا دائەنیشێ. کابرایەك ئەچێتە خزمەتی، لێی ئەپرسێ: ها، کابرا ساڵ چونە؟ ئەڵێ: قوروان ساڵی وا هەر نەوگەسەوە. ئەڵێ: «گنۆر پێ گەیشتووە؟» ئەڵێ: «قوروان وە سەر باوکت گنۆر گنۆر نییە، لێرەوە سووکی پێوە ئەدەی لە ژێر پیرۆز خانمەوە وەکوو ماری شڵ سەر تێرێتە دەرەوە».

١٣٦. ڕەشەی عەزەی ئەحمەد عەلی سێتە بەسەر، کە ئەکەوتە ڕەمەزان مەلایەکی ئەهێنا نوێژ و تەراویحی بۆ ئەکردن؛ ڕۆژووەکەشی تەقەڵبڕ ئەکرد، دەنکی لێ نەئەخوارد. کە ئەکەوتنە بیست‌وهەشت و بیست‌ونۆی ڕەمەزان بە براکانی ئەوت: «کوڕینە! وا جەژن هات؛ بچن سێ چوار مەڕێك پەیدا کەن بۆ جەژنەکە». ئەوانیش ڕۆژی پێش جەژن بە زمانی بە ڕۆژووەوە ئەچوون ئەیاندا بەسەر ئاواییەکا تاڵانیان ئەکردن و چەن مەڕێکیشیان ئەهێنا. شەوی جەژن ئەیانگوری و نانی جەژنیان پێ دروست ئەکرد.

١٣٧. کابرایەکی دز شەوێك ئەچێتە سەر ماڵێك. لە کڵاوڕۆژنەکەوە تەماشا ئەکا بزانێ نوستوون یان بە ئاگان. خاوەن ماڵەکە لەگەڵ ژنەکەیا ڕاکشابوو، چاوی لێ بوو بە ژنەکەی وت: بەخوا ئافرەت باش بوو خوا ئەم ماڵ و سامانەی داینێ پێی حەساینەوە (ژنەکەشی تازە هێنابوو). ژنە وتی: بەڕاست پیاوەکە تۆ ئەم سامانەت چۆن دەست

کەوت؟ وتی: «وەڵڵا ژنەکە! من لە هەوەڵەوە ئیشم دزیکردن بوو؛ بە شەو ئەچوومە سەر هەر ماڵێك دەنگم نەئەکرد تا مانگ هەڵئەهات، ئەچوومە سەر بانەکە. کە تیشکی مانگەکە بە کلاوڕۆژنەکەدا ئەچووە خوارەوە، منیش دەستم پێ ئەگرت و ئەموت «ترپ ترپ». وردە وردە پیا ئەچوومە خوارەوە؛ هەر شتێك لە ژوورەکەدا بوایە کۆم ئەکردەوە و ئەمدایە کۆڵما و دەستم ئەگرتەوە بە تیشکەکە و ئەموت: «فجوق فجوق»؛ پیا ئەکەوتمەوە و ئەهاتمەوە. بەم جۆرە من ئەم سامانەم پێکەوە ناوە.

کابرای دزە، کە گوێی لەم قسەیە بوو وتی: کەواتە ئەمە شتێکی ئاسانە؛ با منیش وا بکەم. دەنگی نەکرد تا مانگ هەڵات و تیشکەکەی لە کلاوڕۆژنەکەوە چووە خوارەوە؛ دەستی پێ گرت کە پیا بچێتە خوارەوە هەر وتی: «ترپ ترپ» شڵپ لە خوارەوە زرمەی هات و هەموو پەراسووی ورد بوو بەسەر یەکا. خاوەنماڵ هەڵسا جوان و پوخت باڵی بەست و لەو لاوەوە فڕێی دا و وتی: دە بۆ خۆت فجووق بکە.

**١٣٨.** کابرایەکی «مایندۆڵ»ی چوار کەری دابووە پێش لە شارەوە بۆ ماڵ ئەچووەوە. گەیشتە قەراخ شار سواری یەکێك لە کەرەکان بوو سەیری کرد سێ کەری لە پێشەوەیە، کە دابەزییەوە تەماشای کرد چوارە؛ سوار بووەوە سێیە. سەری لێ تێك چوو. لە پاشا وتی: «بە پێیان بچمەوە کەرێك قازانج بکەم لەوە باشترە سوار بم و کەرێکم لە کیس بچێ». بە پێیان ملی ڕێی گرت تا چووەوە ماڵەوە نیوە مەرگ بوو.

**١٣٩.** «شێخ بابە عەلی سووسە» دەم و نەفەسەکەی دەم و نەفەس نەبوو، هەچ شێت و مارەنگازێکیان ئەبردە لای یەکەو جار چاکی ئەکردەوە.

لەو بناری کۆیە کچێکیان دابوو بە مێرد؛ کچە شەوێ کە زاوا ئەیەوێ بچێتە لای شێت ئەبێ و دەست ئەکا بە کەف چەراندن. شایی لە شاییکاران ئەبێ بە شیوەن. هیچ شێخ و شەخسێك نامێنێتەوە کچە نەبەنە سەری چار ناکرێ. لە ئاخرا ئەیهێنن بۆ سووسە بۆ لای شێخ بابە عەلی. شێخ ژوورێکی چۆڵی سەربەخۆی تەرخان کردبوو بۆ ئەوە کە شێتیان ئەبردە لای، لەوێی دابنێ. کچەی لەو ژوورەدا دانا و بەستیانەوە. شەوێ پاش نوێژی خەوتنان چووە لای کچە و قاپییەکەی لەسەر خۆی داخست، نەیهێشت کەسی‌تر بچێتە ژوورەوە.

چووە بن دەست کچەوە و وتی: کچم پێم بڵێ تۆ دەردت چییە؟ من بۆت چار ئەکەم. تۆ شێت نیت، من زۆر شتی وام دیوە. زۆری سەر خستە سەری لە ئاخرا کچە وەکوو کچێکی ئاقڵ وتی: یا شێخ چارم ئەکەی؟ وتی: ئەمین بە چارت ئەکەم. وتی: ئەوی ڕاستی بێ من شێت نیم؛ لە ماڵی باوکم کوڕێکی دۆستم هەبوو، دەستمان کرد بە یەکا و ئێستە کچێنیم نەماوە. لە ترسی ئەوە کە ئابڕووم نەچێ و نەمکوژن خۆمم شێت کردووە. شێخ وتی: مەترسە بۆت چار ئەکەم. هەستا هاتە دەرەوە.

کەسوکاری کچەی بانگ کرد وتی: «ئەم کچەی ئێوە جنۆکە دەستی لێ وەشاندوە و لەگەڵیایە لێی نابێتەوە، تەنانەت چووەتە ناو سکیەوە. ئێستە من بە دوعا و تەلیسم سازم کردووە کە بێتە دەرەوە و وازی لە کۆڵ بێنێ، بەڵام لە هەر لایەکەوە کە بێتە دەرەوە ئەو چاوەی کوێر ئەبێ؛ ئەگەر لە گوێچکەیەوە دەرچێ گوێی کەڕ ئەبێ ئەگەر لە شەرمیەوە بێتە دەرەوە کچێنی نامێنێ؛ بە کورتی لە هەر شوێنێکیەوە بێتە دەرەوە ئەو شوێنەی ئەفەوتێ. ئێنجا ئێوە ئارەزووی خۆتانە بۆ ئەوە هاتم پرستان پێ بکەم کوێ ئەڵێن تا لەوێوە بیهێنمە دەرەوە؟».

وتیان: وەڵڵا یا شێخ! نامانەوێ کچەکە عەیبدار بێ؛ کەواتە با هەر لە شەرمیەوە بێتە دەرەوە خۆ هیچ نەبێ کچە بەبێ عەیبی وەکوو خۆی ئەمێنێتەوە. شێخ چووەوە بۆلای کچە و لە پاش تۆزێك کچەی هێنایە دەرەوە. کچە لە جاران گەلێ ژیرتر بوو. بەم جۆرە کچەی ڕزگار کرد و کارەساتەکەشی بە کەس نەوت تا لە پاش چەند ساڵ هەروا بەبێ ناو گێڕایەوە.

١٤٠. «شێخ موحەممەدی شێخ جەلال» گێڕایەوە وتی: شێخ لەتیف هەبوو لە ئاوایی «هۆمەرقەڵا» پارچە زەوییەکی هەبوو «قنگە بۆران»یان پێ ئەوت؛ کردبووی بە گەنم. زەوییەکیتریش لە تەنیشت زەوییەکەی ئەوەوە بوو پێیان ئەوت «مەترەقی قازی»، ئەویش هەر کرابوو بە گەنم. جا خەڵکەکە ئەچوون سەیریان ئەکرد ئەیانوت «ماشەڵڵا ماشەڵڵا لە قنگەبۆرانی شێخ لەتیف، مەترەقی قازی داپۆشیوە». شێخ لەتیف لە داخی ئەم بەند و باوە ڕۆژێك گا و گۆتاڵ ئەکاتە زەوییەکەی خۆیەوە هەمووی ئەخۆن.

١٤١. کابرایەکی «خۆشناو» بە کاروان چووبوو بۆ ئەو وڵاتی «ئاڵان»ـە. سەبیلێکی کڕیبوو بردبوویەوە بۆلای خۆیان. لەوێ لەسەر شاخێك چەند کەسێك لە ئاواییەکەی خۆیان لێی کۆ ئەبنەوە و سەیری سەبیلەکە ئەکەن؛ یەکێکیان کوتوپڕ سەبیلەکەی لە دەست ئەکەوێتە خوارەوە و زەرد و کاو ئەبێ، بەوێدا سەبیل ئەڕوا.

ئەمانە ئەکەونە پەرۆشەوە کە چۆن ئەم سەبیلە بێننەوە؟ یەکێکی ژیریان ئەبێ لەناکاو هەڵیئەداتێ ئەڵێ: «ما دۆش دامانە؟ نوکە من سەبیلانتا لۆ دێنمەوە». ئەڵێن: «کوو؟» ئەڵێ: «من دەستی خۆ لە قەفی

وی دارە دەگێرم و خۆ شۆڕ دەکەم؛ یەکێ لە ئەنگۆش دەستی خۆ لە قاچی من توند ئەکا و خۆی شۆڕکاتەوە، یەکێکی تریش لە قاچی وی تا ئەگەینە سەبیلان».

هەموو ئەڵێن: باشە؛ تۆ ئەم فیکرەت لە کوێ کرد؟ کابرا باوەش بە دارەکەدا دەینێتەوە و یەکێکی تریش قاچی ئەو ئەگرێ؛ بە کورتی وەکوو خۆی وتوویەتی وا ئەکەن و بەو جۆرە خۆیان شۆڕ ئەکەنەوە بە شاخەکەدا. کابرا کە پێنج شەش کەسی پیا داڵەرۆچکە ئەبێ، دەستی شل ئەبێ و شانی وەخت ئەبێ لە بن دەربێ؛ بانگیان لێ ئەکا ئەڵێ: «دەسا خۆ توند بگرن، تف لە دەستان دەکەم». هەرکە دەست لە دار بەرەڵا ئەکا هەموویان ئەکەونە خوارەوە هەپرون بە هەپرون ئەبن.

١٤٢. لە گوندێکی ئەو خۆشناوەماڵێك لە گوندێکی تر بووکێك دێنن. بووکە تا دوو سێ ڕۆژ میوان ئەبێ و هیچ ئیش ناکا، لە پاش سێ ڕۆژە خەسووەکەی پێی ئەڵێ: دە کچم هەڵستە ئەوە ئاوە و ئەوە سوێنەیە و ئەوەش ئاردە لەو کەنووە؛ لەو دیوی کۆڵەکەکەوە بیانهێنە و هەویرەکە بکە. کچە هەڵئەستێ و ئەچێتە بەر کەنوو ئارد دەربێنێ. وا ڕێ ئەکەوێ ئەبێ دەستی بەملاوبەولای کۆڵەکەکەدا بەرێ تا ئاردەکە لە کەنووەکەی دەربێنێ. کە دەست ئەبا پاشان دەستی بۆ دەرنایەتەوە و هەر لەوێ وشك ئەوەستێ.

خەسوەکەی کە ئەبینێ وا بووکە هەر دیار نەبوو بانگ ئەکا: «حایشێ! حایشێ! ئەو چما دیار نیت؟» حایشێش ئەڵێ: «مابا کەی، دەستانم حاسی بووینە؟»

خەسووەکە ئەچێ، ڕاستە، دەستی گیری خواردووە؛ چونکە دەستی

بەملاوبەولای کۆڵەکەکەدا بردووە و پڕ مستی کردووە لە ئارد ئیتر چار نییە. ئەیکا بە هەرا و هەموو ئاوایی کۆ ئەبنەوە کە چاری ئەم بەڵا گەورەیە بکەن و بووك ڕزگار بکەن. «مامۆتك»ێك ئەڵێ: ئەبێ هەردوو دەستی ببڕێنەوە. دەست ئەبا بۆ هەرە (مشار) ئەیهێنێ هەردوو دەستی بووکە ببڕێتەوە، مامۆتکێکی‌تر ئەڵێ: «نە بابە وا نابێ؛ بووکیمان بێ دەستان دەبێ با کۆڵەکەکەی ببڕینەوە». هەموویان ئەڵێن: «ئەی ماڵت کاول بێ لۆ زەکاوەتت؟» چما ئەم فێڵەت زانی؟

هەر یەکە دەست ئەدەنە «تەور»ێك و کۆڵەکە ببڕنەوە. کابرایەکی کۆییش لەوێ بوو؛ سەیر ئەکا کۆڵەکەکە ببڕنەوە خانوەکە ئەڕوخێ و ئەویش سەری تیا ئەچێ؛ هەر خێرا پەلاماری سەری بووکە ئەدا دەرزی بە سەرەوە ئەبێ. دەرزیەکی لێ ئەکاتەوە و ئەیچزێنێ بە دەستی بووکەدا. بووکەکە چزەی دەرزی هەست ئەکا هەردوو دەستی خۆی بەرەڵا ئەکا. ئینجا خەڵکەکە دەوری کابرایان ئەدا ئەیانوت «تۆ فریشتەی! بووکانت لە کەندووان کردۆتەوە».

**١٤٣.** حاجی برایماغای عەنبار لەگەڵ حەمەڕەحیمی پیاوی ئەچن بۆ سابڵاخ. لە ڕێگەدا تووشی ماسییەکی زلە ئەبن. حاجی دڵی لێ ئەچێ، ئەڵێ: حەمەڕەحیم، بیکڕە و بۆ ئەم نیوەڕۆیە بۆم بکە بە کەباب.

حەمەڕەحیم ماسی ئەکڕێت و ئەیباتەوە. حاجی نوێژی نیوەڕۆ ئەکا و ئەڵێ: حەمەڕەحیم خەوم دێ؛ تۆزێ ئەنووم. کە هەستام ئەو وەختە نان ئەخۆم. ئەو ئەنوێ و حەمەڕەحیم ماسی دروست ئەکا. ئەچێتە دەرەوە نازانم چی بێنێ، تا دێتەوە پشیلە ماسییەکە ئەفڕێنێ تەنها کلکەکەی ئەمێنێتەوە.

حەمەڕەحیم لەمە زۆر پەست ئەبێ و ماسیتریش نییە بیکڕێ. ناچار دێنێ کلکە ماسی ئەبا ئەیهەنۆی بە دەست و پلی حاجیاغادا و پاش ئەوە جوان و پوخت خۆی قاوەڵتی پێ ئەکا.

حاجیاغا لە خەو هەڵئەستێ و ئەڵێ: حەمەڕەحیم ماسییەکەم بۆ بێنە. ئەڵێ: «قوربان، ماسی چی؟ تۆ لە پێش ئەوەدا بنووی، بۆم کردی بە کەباب و خواردت». ئەڵێ: «کورە قورمساغ! لە کوێ خواردم؟» ئەڵێ: «قوربان، بۆچی جنێو ئەدەی؟ تۆ جارێ بۆنی دەستی خۆت بکە بزانە ئێستەش بۆنی ماسییەکەی لێ دێ یا نە؟ ئەمە چییە هەر لە خۆتەوە هەموو جار پیاو ئەشکێنی؟».

حاجی بۆنی دەستی خۆی ئەکا سەیر ئەکا ڕاست ئەکا بۆنی ماسی لێ دێ؛ ئەڵێ: «دەسا بە گۆڕی بابم ڕاست ئەکەی خواردوومە؛ دیارە ماسی کەرانباوگاو هیچ بەرگە ناگرێ و بڕی سەعاتێك ناکا، کوێڕا بەم سەعاتە خەوە برسیم بووە. دەسا بە سەری تۆ زۆرم برسییە؛ شتێکیترم بۆ بێنە با بیخۆم».

حەمەڕەحیم نانیتری بۆ دێنێ و ئەڵێ: «قوربان، تۆ هەموو جار بەبێ ئەوە لە شت ورد ببیتەوە هەروا لە خۆتەوە وا تووڕە ئەبی، سەرم ئەبەی بە ڕیشی بابما». ئەویش ئەڵێ: «قەیناکا گەوجەکە».

**١٤٤.** کابرایەك هەبوو لە دێی «تورجان»، مام قەرەنی ناو بوو؛ کابرایەکی پیری شڕی هەژار بوو؛ سەر و سەکوتی ئەوەندە سەیر بوو، هەرکە چاوی پێ ئەکەوت دەستی ئەکرد بە پێکەنین. کردەوە و هەڵسان و دانیشتنی وەکوو شێت وابوو؛ کەچی شێتیش نەبوو.

گۆڕستانێك لە نزیکی تورجانە، زۆرتر مردووی ئەو ناوە دێننە ئەوێ.

ڕۆژێـك لـەو دەورە مردووێـك ئەمرێ و ئەیهێننـە ئـەوێ. پیاوەکانی تورجانیـش کۆ ئەبنـەوە ئەچـن بۆ گۆڕستانەکە بۆ ئـەوەی لـە ناشتنی مردووەکەدا لەوێ بن.

مام قەرەنیش ماکەرە قۆڕێکی لاتی هەبوو؛ سواری بوو کەوتە شوێنیان. خەڵکەکـە پێیـان وت: «مام قەرەنی پیاوەتیـت بیێ مەیە؛ خەڵکوخوای بێگانە زۆر لەوێیە. ئێمە بۆ شیوەن ئەچین، بۆ شایـی ناچین؛ شوورەییە نـەوەك یەکـێ بتبینـێ بـۆ ئێمـە باش نییـە. کـە هاتینـەوە دە ڕبـە گەنمت ئەدەینێ». مام قەرەنی وتی: باشە و گەڕایەوە.

پیاوەکان چوون و گەیشتنە سەر گورستانەکە و خەڵکێکیتری زۆریش لـەوێ بـوون. مـام قەرەنـی کەوتـەوە بیـری کـە بـە کام ڕبـە گەنمەکـەی ئەدەنـێ؛ دوو ڕبـە لـە ئاواییەکـەیانا هەیـە: ڕبەیەکـی گـەورە و ڕبەیەکـی بچـووك. هەسـتا چـوو هـەردوو ڕبەکـەی هێنـا هەریـەکـە تاڵە بەنێکـی تێخسـتن و بەسـتی بـە کورتانـی کـەرە لۆتیـەوە و خـۆی سـواری کـەرە بوو و بەڕێ کـەوت. بەنـەکان درێـژ بـوون، ڕبەکان ئەخشـان لـە زەوییەکە و گەلێکیشـیان هـەر زیاد بـوون. بـەم تـەق و هـۆڕ و دیمەنـەوە چـوو بـۆ گۆڕسـتان. مام قەرەنی لە پێشا خۆی بوو ئەتوت مەیموونە، ئێسـتە ئەم دوو ڕبەشـیە وەکوو دوو کیسـەڵ بە شـوێن خۆیـەوە بە تەق و هۆڕ زیاد کرد، ئەوەندەیتر دیمەنی پێ دابوو.

کە چووە سـەر گۆڕسـتان هەموو عالەمەکە دەستیان کرد بە پێکەنین وتی: «ئەوە بۆچ پێئەکەنن؟ من هاتووم بزانم بە کام لەم ڕبانە گەنمەکەم ئەدەنـێ؛ بـە گەورەکـەیان یان بـە چکۆلەکـەیان؟ با بـۆم ساغ ببێتـەوە». وتیـان: «مـام قەرەنـی! ئێمـە وتمـان با کەتـن ڕوو نەدا، کەچی ئێسـتە تۆ خراپترت کرد. بەخوا تازە دەنکت نادەینێ».

١٤٥. لە دێیەکی ئەو سەرشیوە ڕێوییەك فێر بووبوو ئەچوو جووجك و مریشکەکانیانی ئەخوارد و خەڵکەکەش بە هیچ جۆر چاریان نەئەکرد و بەر پلاریان نەئەکەوت. لە پاش ئەوە کە زیانێکی زۆری کرد، ڕۆژێك بەرپەل کەوت و گرتیان. هەموو ئەهلی ئاوایی لێی بەداخ بوون، تەنانەت فەقێکانیش مریشکێکیان هەبوو ئەویشی خواردبوو. هەموو لێی کۆ بوونەوە و هەریەکە وتی بە جۆری بیکوژین. یەکێ وتی: بە زیندوویی هەر چوار پەلی ببڕین؛ یەکێکی‌تر وتی: ناوەڵا بە زیندوویی پارچە پارچە گۆشتی لێ بکەینەوە و لە بەرچاوی خۆیەوە بیدەین بە سەگ؛ یەکێ لە فەقێکان وتی: «من چاری ئەمە ئەکەم. ئێستە کلك و گوێی ئەکەم و هەردوو چاوی هەڵئەکۆڵم با بۆ خۆی بەو سزایە بتۆپێ».

١٤٦. کابرایەك کچێکی دراوسێیان هەبوو ئەیویست بیهێنێ. هاوڕێیەکی هەبوو ناردی بۆ خوازبێنی بۆی. کابرا چوو، هاتەوە لووتوپووتی دابوو بە یەکا و وتی: ئیشەکە ڕێ نەکەوت؛ نەیائەدا بە شوو. وتی: چۆن نەیائەدا؟ خۆ ئێمە زووتر وردە قسەیەکمان کردبوو. وتی: «بەخوا و بە سەری تۆ نەیائەدا، من گەلێکم تەقەلا دا. لە پاشا تا بۆ خۆمم ساز کرد قیر سپی بوو!».

١٤٧. کابرایەك لەو وڵاتی «سوورسوور»ە لە قەراغ ئاواییەك تووشی گاوانێك بوو. گاڵەکەی بەرەڵڵا کردبوو خۆیشی دانیشتبوو. ئەمیش چوو لەلایەوە دانیشت و هەروا دەستیان کرد بە قسە کردن. پێی وت: «ماشەڵڵا گاگەلەکەت زۆرە؛ ئەبێ نانی چاکت بێ». وتی: «بەخوا کاکە ئەرکی زۆرم لە سەرە. لەم دێیە لە لایەکەوە گزیریانم، مەلایانم، گاوانیانم، لەگەڵ ئەمانەشا (دەستی برد زوڕنایەکی دەرهێنا و

دەستی کرد بە زوڕنا لێدان) گیانێکم بەم فیقە فیقەیە. ئەگەر ئەمە نەبێ لە برسانا ئەمرم».

**١٤٨.** بابەکری سەلیماغا قاقەزێکی نهێنی نووسیبوو بۆ مەندووبی سامی لە بەغدا. قاقەزەکەی دابوو بە دوو خزمەتکار کە بیبەن بۆ بەغدا و بیدەنێ، بەڵام نابێ بکەنە کارێ کە کەس پێیان بزانێ و نابێ بە هیچ جۆر دەست و پێوەندی حوکمەتی عێراق پێی بزانێ. کابراکان زۆر بە نهێنی و بێدەنگ سەرلەبەیانێك ئەگەنە بەغدا و ئەچن لە چایخانەکەی ژێر ئوتێل «وجنة الشّارع» دائەنیشن بۆ ئەوە نانێ چایێ، شتێك بخۆن و هەناو و بانیش گەرم ببێ ئەو وەختە بچن قاقەزەکە بگەیەنن.

لە بەغدادا کفتە و کوببە فرۆشی دەستگێڕ هەیە؛ لە وەختی نانخواردنا بە چایخانە و ئوتێلەکان ئەسووڕێنەوە. ئیتر بانگ ناکا کفتە، یا کوببە، چووە هەر شوێنێك بە دەنگی بەرز ئەڵێ: «کەریم، یا کەریم». مەردمەکە تێ ئەگەن. لەو کاتەدا ئەوان لە چایخانەکە دانیشتوون، کابرای کوببە فرۆش ئەچێتە ژوورەوە لەسەر ڕەوشتی خۆی چاوێك بە مەردمەکەدا ئەگێڕی و بانگ ئەکا «کەریم، یا کەریم!» کە ئەم، ئەم بانگە ئەکا تومەز یەکێ لەو دوو کابرایە ناوی کەریم ئەبێ، هەر سەر ئەنێتە بناگوێی هاوڕێکەیەوە ئەڵێ: «برا هەڵسە با بڕۆین؛ ئەڵێن بەغدا جاسووسی زۆرە، ڕاست ئەکەن. ئێمە هێشتا نەچووینەتە دەرەوە ئەوە کابرا ناسینی و بانگی منی کرد. بە قورئان حوکمەت پێمان بزانێ پەل پەلمان ئەکات». لووس و باریك هەڵئەستن و هەر لەوێوە ئەگەڕێنەوە و دێنەوە کارەساتەکە بۆ بابەکراغا ئەگێڕنەوە.

١٤٩. شێخ مەحموودی شێخ سەعید سەدوپەنجا سوارێکی لەگەڵ ئەبێ و لەو دۆڵی «گەلاڵ»ەدا ئەبێ بە میوانی «فەرحاناغای چوچانی». فەرحاناغا هەژدە سەر مەڕ سەر ئەبڕێ؛ دیارە ڕۆن و برنج و تفاقی ئەم میواندارییە تۆ بیڵێ کە چی تێچووە! لە ژێر دەواری هەژدە هەستوونیدا شێخ و پیاوەکانی دائەنیشن، فەرحاناغاش قسە و ڕووخۆشییەکەی لە میوانداریيەکەی گەلێ خۆشتر بووە.

شێخ مەحموو ئەم نان و خوان و پیاوەتییەی زۆر بە دڵ ئەبێ، لەگەڵ فەرحاناغا دەست ئەکەن بە قسە کردن. ڕوو ئەکاتە فەرحاناغا ئەڵێ: کە چوومەوە دوو گەماڵی زۆر نایابم هەیە بۆت ئەنێرم، بۆ پاسی مەڕومالاتی تۆ زۆر بە کەڵکن. فەرحاناغاش ئەڵێ: «یا شێخ! تۆ خۆش وی گەماڵم نەگەرەکە». شێخیش ئەڵێ: «فەرحاناغا من حەوت و هەشتم پێ ناکرێ». فەرحاناغا ئینجا ئەڵێ: «یا شێخ! من وە باوکیشمەوە ڕایمەم ناکەوێ قسەی وا بکەم؛ من ئێژم چی و تۆ ئێژی چی؟ هەی بێم وە دەورتا».

١٥٠. کاکە ڕەشید «صدقی» بۆی گێڕامەوە وتی: مەحمووپاشای جاف تووڕە ببوو لە خەلیفە محەمەدی دۆم؛ وتبووی ئەو دەویت باوکە لە هەرلایەك بێ، بیگرن و سنگی کەن. خەلیفە محەمەد هەڵدێ و ئەداتە کەژ. خۆی بۆ ناگیرێتەوە لەم هەوار بۆ ئەو هەوار لەم دێ بۆ ئەو دێ، هەر لایەك ئەچێ ملکی مەحمووپاشا ئەبێ و خۆی بۆ حەشار نادرێ. لە ئاخرا وەڕس ئەبێ، بە دزییەوە ئەچێتەوە، دوو بار کەشك و دوو بار دۆینە و دوو تانجی نایاب و چەند مریشکێك ئەخاتە ناو باری بارەکانەوە و ئەچێ پەنا ئەبا بۆ حەسەن بەگی قادربەگ کە تکای بۆ بکا لای پاشا و پاشا لێی خۆش بێ.

کە ئەچێ و حەسەن بەگ چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ: ها خەلیفە محەمەد! تا نەتنایە تەبەق، نەتوت سەدەق؛ جا ئێستا هاتگی و پەنات هاوردگە؟ خەلیفە ئەخاتە شوێن خۆی و بە شتومەکەکانەوە ئەیبا بۆلای پاشا.

کە ئەچن شێخی «حسام‌الدین» لەگەڵ پاشادا لە دیواخان دانیشتوون و قسە ئەکەن. بارەکان لەولاوە خراون و تانجییەکانیش لەملاوە لەبەر هەستوونی دەوارەکەدا کەوتوون، ئەوا شێخی حیسامەددینیش لەگەڵ پاشادا لە گەرمی قسەدایە، لەو وەختەدا لەملاوە تانجییەکان دەست ئەکەن بە مرەمر.

خەلیفە لە مرەی ئەمانە توورە ئەبێ و لا ئەکاتەوە بەلای تانجییەکانەوە و ئەڵێ: «بۆرەی نان و ورێنە. جارێ نۆرەی شێخە، نۆرەی ئێوە نییە لە مرەمر بکەون». پاشا و شێخ حسامەددین کە گوێیان لەم قسەیە ئەبێ دەست ئەکەن بە پێکەنین، ئینجا شێخیش تکای لێ‌خۆشبوونی لە پاشا بۆ ئەکا و پاشا لێی خۆش ئەبێ.

.١٥١ کابرایەك پارەی لای کابرایەکی‌تر بوو؛ نەیئەدایەوە و ئەیوت: لام نییە. ئەویش وتی: باوکم با بچین بۆلای مەلا بۆ شەرع، سوێندم بۆ بخۆ کە لات نییە، ئەو وەختە وازت لێ دێنم.

چوون بۆلای مەلا و کابرای داواکەر بە مەلای وت کە سوێندی ئەم کابرایەم بۆ بدە. مەلاش قورئانی هێنایە پێشەوە و هات بە چۆکا لە خزمەتی قورئانا و پێی وت: سوێندی بۆ بخۆ. کابرا دەستی هەڵبڕی و دای بە قورئانا و وتی: «بە هەقی ئەم قورئانە هیچی ئەم پیاوەم لا نییە!»

لە پاشا مەلا قورئانی هەڵگرتەوە و بە کابرای وت: باوکم بێنە کەفارەی

سوێن و قەسەمنامەکە بدە. کابرا وتی: «توخوا مامۆستا بێزەحمەت ئەگەر قورئانەکە نەهێنیتەوە». مەلا قورئانی هێنایەوە. ئینجا کابرا بە هەردوو دەست مالّی بە قورئانا و وتی: «بە هەقی ئەم قورئانە هیچی قەسەمنامەت لام نییە».

١٥٢. کابرایەکی پیری کورد بەو کەلی دەربەندیخانەدا بە پێیان سەرئەکەوت و زۆر ماندوو و پەرێشان بوو؛ نەیئەتوانی بڕوا. دەستی بەرز کردەوە بۆ عاسمان، دەستی کرد بە پاڕانەوە و وتی: «خوایە پیرم و بێهێز؛ بە گەورەیی خۆت لە خەزێنەی غەیبەوە گوێدرێژێ، ماینێ، شتێکم بۆ بنێرە با سواری بیم و لەو هەورازەوە سەرم خا».

ئەم لە نزا و پاڕانەوەیەدا بوو کوتوپڕ لە دوایەوە خڕەیەك هات. کە لای کردەوەوا کابرایەکە سواری ماینێك بووە و جوانوویەکی بە شوێنەوەیە. وتی: بەخوا باش بوو نزاکەم گیرا بوو، خوا ئەو جوانووەی بۆ ناردم ئێستا سواری ئەبم و ڕزگارم ئەبێ لەم سەرەو ژوورەیە. هەندێ چاوەڕێی کرد، سوارەکە گەیشتە جێ. سوارە لە کابرای خوڕی کورە کابرا تۆ چیت؟ وتی: بە قوربانت بم! پیاوێکی پیری ڕێبوارم و ئەوا تووشم بوو بە تووشی ئەم هەورازەوە. هەرچەند ئەکەم ناتوانم پیایا سەرکەوم. کابرا وتی: کاورا وا دیارە تۆیش سەرەوژوور ئەڕۆی، ئەم ماینەم ئێستە لەم بنارەدا زا و ئەو جوانووەی بووە. جوانووەکە کۆرپەیە و ناتوانی سەرکەوێ، بۆم بگرە بە کۆڵەوە تا لە هەورازەکە سەرئەکەوین!. کابرا وتی: کورە پیاوی چاك بە من خۆم ناتوانم بڕۆم، ئێستا چۆن ئەتوانم جوانوو هەڵبگرم؟ کابرای سوار دەستی دایە تفەنگ و وتی: «وە کەلام، دەویت باوك! هەڵیئەگری باشە ئەگینا وە تەنها فیشەکێ ساردت ئەکەمەوە».

کابرا لە تاو گیانی خۆی نیشت بە جوانووەوە و جوانووی هەڵگرت؛ نەیئەتوانی بڕوا و نەشی ئەوێرا نەڕوا. لەبەر خۆیەوە ئەیوت: «ئەری خوا وە قوروانت بم! تۆ کە لە دوعا تێ ناگەی بۆچ گیرای ئەکەی؟ من وتم وڵاغم بۆ بنێرە سواری بم، یا وتم سوارم ببێ؟!».

١٥٣. کابرایەك هەبوو مام نادری ناو بوو؛ زەردەواڵە پێی فێر بوو، زوو زوو پێوەی ئەدا. هەر وەختیش پێیوە دابوایە تا خۆی پیس نەکردایە ڕزگاری نەئەبوو. ڕۆژێك زەردەواڵەیەك پێوەی دا؛ هیچ دەوا و دەرمان و شەخسێك نەما بە دوایدا نەگەڕێن. مام نادر ئێستە و ئەوساش خۆی پیس نەکرد و ئاخری کوشتی. خزم و خوا و دەر و دراوسێ و عەشیرەت کۆ بوونەوە و ناشتیان و پاشان چوون سەرخۆشییان لە ماڵ و مناڵەکەی کرد و وتیان: «خوا ئیمانی باتێ! ئێمە هەموو هەر ئەبێ بمرین». کوڕێکی هەبوو وتی: «توخوا خزمینە! واز بێنن، ئیمانی چی؟ ئەوە خوا تۆزێ گووی نەداییێ، ئێستە ئیمانی لە کوێ ئەداتێ».

١٥٤. کەیخەسرەوبەگی مەحمووپاشا تووڕە ئەبێ لە پیاوێکی پشتماڵە و گاڵ ئەدا دەستێکی ببڕن. کابرا پەنا ئەباتە بەر حەسەنبەگی قادربەگ کە تکای بۆ بکا و کەیخەسرەوبەگ لێی خۆش ببێ. حەسەنبەگ ئەچێ و ڕوو ئەکاتە کەیخەسرەوبەگ ئەڵێ: «کەیخەسرەو بەگ، ئەو کابرای پشت ماڵە ـ کە وتووتە دەستێکی ببڕن ـ تکات لێ ئەکەم دەستەکەی مەبڕە هەر لەلەی بکە».

١٥٥. مەحمووپاشا هەندێ پارەی لای عەوڵابەگی شەرەفبەیانی بوو؛ پاشا بۆ کوێستان ئەچوو، پیاوێکی ناردە لای عەوڵابەگ

بۆ پارەکە. عەولا بەگیش بە پیاوەکەی وت: عەرزی پاشا بکە ئێستە پارەم لە دەستا نییە، بە خێر کە لە کوێستان گەڕایەوە و هاتەوە بنەی کانی چەقەڵ، ئەو وەختە خۆم پارەکە دێنمەوە بۆ خزمەتی.

کابرا چووەوە قسەکەی بۆ پاشا گێڕایەوە. پاشا تۆزێ تووڕە بوو، ڕووی کردە حەمەسەعی بەگ فەرمووی: تۆ بچۆ پارەکە بێنەوە؛ منیش لەم وەختەدا پارەم پێویستە. حەمەسەعی بەگیش لەبەر ئەوەکە لە خاڵوانەوە خزمایەتی لەگەڵ عەولا بەگا هەبوو، ئەیویست ئیشێکی وا بکا کە پاشا ئەمجارە وازبێنێ تا لە کوێستان ئەگەڕێتەوە. هەروا خەریك بوو قسەی بۆ پاشا ئەکرد، حەسەن بەگی قادربەگیش لە دیواخان بوو، کە گوێی لە قسەکانی حەمەسەعی بەگ بوو ڕووی تێکرد و وتی: «حەمەسەعی! تۆ چیت داوە لەم زرمە زلێیە؟ گوو وەڕیش باوکی تەرەفەینیان». پاشا سەیرێکی دانیشتووەکانی کرد و زەردەخەنەیەك گرتی و ئیتر هیچ دەنگی نەکرد.

١٥٦. والی هاتبووە سولەیمانی. لەبەر ئیشێکی زلی عەشایەری ناردبووی بەشوێن مەحمووپاشای جافدا کە بچێ بۆ سولەیمانی. پاشا، حەمەعەلی بەگ و حەسەن بەگ و چەند سوارێك لەگەڵ خۆی ئەبا و ئەچێ بۆ سولەیمانی و ئەچێتە لای والی. خۆی و حەمەعەلی بەگ و یەکێکی تر ئەچنە دیواخانی والی و پیاوەکانیش لە دەرەوە ئەبن.

لە حەوشەکەدا لەناو چیمەن و سەر حەوزەکەدا کورسی و سەندەڵی دانرابوو، والی لەوێ دانیشتبوو. مەحمووپاشا لە تەنیشت والییەوە لەوبەر حەوزەکەوە دائەنیشێ. حەمەعەلی بەگ و پیاوەکەی تریش لەم بەرەوە دائەنیشن. حەوزەکە زۆر پان نابێ، پیاوەکە گوێی لە قسەکانی والی

و مەحمووپاشا ئەبێ کە قسە ئەکەن لە بارەی کاروباری عەشیرەت و حوکمەتەوە؛ بەڵام لەبەر ئەوە بە تورکی قسەیان ئەکرد و ئەمیش تورکی نەئەزانی، ڕووی کردە حەمەعەلیبەگ وتی: «ئەوە والی و پاشا یێژن چی؟».

حەمەعەلیبەگیش قومارباز و زیرەك بوو، تورکیشی باش ئەزانی وتی: «وەڵڵا میرم بێژم چی؟ والی ئێژێ: ئاخۆ کێ هەیە بتوانێ باز بدا بەسەر ئەم حەوزەدا؟» پاشاش ئەفەرموێ: «جا ئەم حەوزە چییە، من پیاوی وام لەگەڵایە هەر لە جافا دوو ئەوەندەی ئەم حەوزەش باز ئەدا».

بەخوا کاکە بەگم بەگ ئەبێ، کە ئەمە ئەبینێ ڕاست ئەبێتەوە بەبێ هێڵ و گفت، تف لە شەیتان و دوور لە ڕەحمان چاکی ئەکا بە لادا و باز ئەدا بەسەر حەوزەکەدا و قوت لە بەردەمی والیدا ئەوەستێ و ئەڵێ: «ئەوە تۆ ئێژی چی؟ سا وە قەورەکەی حەمەپاشا ئەگەر لەبەر پاشا نەبوایە، بازم ئەگەیاندە ئەودیوی ئێوەشەوە؛ ئیتر تۆ چۆن ئێژی کوڕی وا نییە باز بدا وەسەر ئەم حەوزەدا؟» مەحمووپاشا و والی لەم کردەوەیە ئەکەونە عالەمێکیترەوە. پاشاش ئیتر هیچی پێ ناوترێ.

**١٥٧.** نازانم هەر ئەو جارە ئەبێ یا جارێکیکە، هەمان کۆڕ دائەنیشنەوە و والی و مەحمووپاشا قسەی عەشیرەت ئەکەن، هەمان پیاویش هەیە کە لێیان تێ ناگا. جووتێ کەوشی سووریشی لە پێیا ئەبێ، لە حەمەعەلیبەگ ئەپرسێ: ئەوە والی و پاشا ئێژن چی؟ ئەویش ئەڵێ: «والی بە پاشا ئەڵێ: ئاخۆ ئەو پیاوە ئەو کەوشە سوورانەی بە چەند کڕیوە؟ پاشاش ئەڵێ: نازانم». ئینجا پیاوەکە هەر لەمبەری حەوزەکەوە لەسەر سەندەڵییەکە دانیشتووە، هەردوو قاچی بەرز ئەکاتەوە و ئەیکاتە پاشا و والی ئەڵێ: «وە چوار قڕانم سەندگە، وە چوار قڕان».

**١٥٨.** فەقێ مەحمووی پیاوی حەسەن بەگی قادربەگ گێڕایەوە وتی: حەسەن بەگ لە «بێ سەڵمێن» خستبووی؛ منی ناردبوو بۆ سەر عەشیرەت و ئاواییەکان کە مڵکانە و دەرامەتەکەی بۆ کۆ بکەمەوە. وتی: چووم چوار هەزار قڕانم کۆ کردەوە و گەڕامەوە. لە ڕێگەدا تەماع سوارم بوو؛ هەرچەند جرەجرەم کرد کەڵکی نەبوو. وتی: ناچار هێنام نۆسەد قڕانم لە پارەکە هەڵگرت و لە بنە «تەرو»یێکدا شاردمەوە و ئەوی‌ترم بۆ بردەوە. وتی: زووتر لیستەیەکەم بۆ ناردبووەوە کە کوێخا نادر دووسەد قڕانی داوە، مارف پەنجا قڕانی داوە، بەم جۆرە لیستەی چوارهەزار قڕانەکەم بۆ ناردبوو؛ ئەوەی لا بوو. وتی: هاتم لە ڕێگەدا لیستەیەکی‌ترم دروست کرد کە کوێخا نادر مەسەلا سەدوپەنجا قڕان، مارف چل قڕان، بەم جۆرە سێ هەزار و سەد قڕانم پڕ کردەوە و لە ئاخری حسابەکەشەوە نووسیم سێ هەزار و سەد قڕان.

کە چوومەوە و دانیشتم وتی: «فەقێ مەحموو وە خێر بێیتەوە پارەکەت هاورد؟» وتم: بەڵێ قوربان. وتی: سەیرم کرد لیستەی چوار هەزار قڕانەکە ـکە بۆم ناردبووـ دەستی برد دەری هێنا و سەیری کرد وتی: کوێخا نادر دووسەد قڕان؛ بێنە دووسەد قڕان.

وتی: سەیرم کرد بەم جۆرە ئەو یەکە یەکە بیخوێنێتەوە و پارەکەم لێ وەربگرێ پارە دیارە کورت ئەهێنێ. وتی: هەروا سەیرێکم کرد وتم: ئەرێ میرم ئەوە تۆ ئێژی چی؟ کەی حەساو وا ئەوێ؟ وتی: هەر دەستم برد لیستەکەم لە دەستی هەڵپرووکان و دڕیم بەسەر یەکا و پارچە پارچەم کرد و دەستم برد لیستەکەی خۆمم دەرهێنا و دامە دەستی و وتم: میرم ئەمەیە حەساو. ئا تۆ داوا بکە و تا من پێتی بدەم. وتی: لیستەکەی گرت بە دەستەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی؛ وتی: کوێخا نادر

سەدوپەنجا قڕان؛ بێنە سەدوپەنجا قڕان. وتم: فەرموو. وتی: مارف چل قڕان؛ بێنە چل قڕان. وتم: فەرموو. وتی: بەم جۆرە حسابمان پڕ کردەوە و لە ئاخریشا پێم وت: میرم ئەوەسە لە ئاخریشا جەمعەکەی نووسیاگە سێ هەزار و سەد قڕان. بزانە پارەکەش سێ هەزار و سەد قڕانە؟

وتی: پارەی بژارد سێ هەزار و سەد قڕان بوو، وتی: «بەخوا فەقێ مەحموو حەساو ئەمەسە تۆ ئەیکەی. حەساوەکەت تەواوە و پارەکەش تەواوە». وتی: ئێستەو ئەوساش نەیوت خۆ حسابەکەی پێشوو وا نەبوو، وەیا ئەو لیستەت بۆچی دڕی؟. وتی: منیش بۆ خۆی شانم پیا کرد نۆسەد قڕانەکەم خوارد.

**١٥٩.** کابرایەك لەو سەرە ئەچێ بۆ بەغدا و کەڵەشێرێکی پێ ئەبێ. ئەگاتە سەر شەمەندەفەر، ئەو سەردەمە لە شەمەندەفەر پارەی کەڵەشێر وەرئەگیرا. کابرا بەم کەینوبەینەی نەئەزانی، هیچ شوێنێکی نەدۆزییەوە کەڵەشێرەکەی تێ خا و بیشارێتەوە دەرپێکەی نەبێ؛ کەڵەشێری خستە دەرپێکەیەوە و لە شەمەندەفەرا لێی دانیشت.

لەو کاتەدا ژنێك سەبەتەیە هەنجیری بەسەر سەرەوە بوو های هەنجیری ئەکرد. کابرا ژنەکەی بانگ کرد بۆ هەنجیر کڕین. ژنە لە سەبەتەکە هەنجیری بۆ ئەکێشا. کابرا کونێك لە دەرپێکەیا بوو، کەڵەشێرەکە لە کونی دەرپێکەیەوە سەری دەرئەهێنا، هەنجیرێکی لە سەبەتەکە هەڵئەگرت و ئەیخوارد. ژنە ئاگای لەمە نەبوو، تا ئەم هەنجیرەکەی کێشا سەیری کرد لەلایەکی‌تری سەبەتەکەوە کەلێن کەوتۆتە هەنجیرەکەوە. کە چاك سەیری کرد تەماشای کرد وا شتێك خێرا خێرا سەر دەردێنێ و هەنجیرێك ئەباتە ژوورەوە. کە چاك ورد بووەوە ئەمە کەڵەشێرێکە. لەمە زۆر واقی

وڕما وتی: «ئەیەڕۆ هیچ نەبێ تا ئێستا هەزار کێرم دیوە، کێری هەنجیرخۆرم قەت نەدیوە».

**١٦٠.** سالێك شتێك هەبوو پێیان ئەوت «حزبی دەستووری». ئەم حزبە بڕەبڕی بوو، هەندێك لە وڵاتی بەغداوە بە کش و فش چووبوون بۆ ئەو وڵاتی کوردەوارییە بۆ حزب گرتن (ئەمە لەسەر قافیەی دەرویش گرتن). ئەمانە گەیشتبوونە ئەو وڵاتی هەڵەبجەیە. لەوێ سوارگەلێکی زۆر بەملاوبەولای ڕێگەکەدا هەموو تفەنگ لە شان وەستابوون بۆ پێشوازیکردنی حزب گیرەکان. کە ئەمان بە ناویانا تێپەڕین، ئەوان لە چەپڵەیان دا بۆیان؛ ئایی لە چەپڵەیان دا.

خانەبەگ هەبوو؛ بە هاومالی مەلاحەسەنی ناوگردان چووبوون لە کۆڕا بوون. ئەحمەدی یەزدانبەخشیش هەر لەوێدا بوو. خانەبەگ سەیر ئەکا ئەحمەد چەپڵە لێ نادا. کە شایی دوایی دێ و سوار بڵاوەی لێ ئەکا، خانەبەگ ئەچێتە بن دەست ئەحمەدەوە ئەڵێ: [«ئەحمەد! ئەوە بۆ پیاوی وا گەورە تێت، تۆ چەپڵەی بۆ ناژەنی؟ ئەبێ شکاتت لێ بکەم».]

[ئەحمەدیش ئەڵێ:] «کوڕە خانەبەگ کوچکت لێ نەوارێ! شکاتی چێم لێ ئەکەی؟ تفەنگ وە دەستمەوەو فریا نەکەوتم بۆ چەپڵەکوتان. ئەم هەویرە چییە ئەیشێلی؟ پیاوی خاس بە واز بێنە». خانەبەگیش هەر ئەیوت: «وە کەلام ناوێ؛ ئەوێ هەر شکاتت لێ بکەم. پیاگی وا گەورە تێت تۆ چەپڵەی بۆ ناژەنی؟»».

ئەحمەد هەر خێرا تفەنگەکەی ئەکاتە ملی و لەو دەشتەدا هەر ئەڕوا و دەست ئەکا بە چەپڵەلێدان و ئەڵێ: «خانەبەگ! ها ئەوە ئەوەندە چەپڵە بینێرە ڕیش باوکی پیاگەکە تا لە لووتی تێتەوە، هێشتا دووزەلەکەیشی ماگە؛ ئێتر شکاتی چیم لێ ئەکەی بەردت لێ نەوارێ؟»».

١٦١. دەستە ژنێکی بلّباس ئەو ساڵە ئەچوون بۆ کوێستان؛ دانیشتبوون گلەیی و بناشتیان ئەکرد لە بەینی خۆیانا. یەك دوویەکیان لەگەڵ ئەوەش کە چەند ساڵ بوو خاوەن مێرد بوون، منالّیان نەبوو، بەمە زۆر دڵتەنگ بوون و بۆ ئەوانیتریان ئەگێڕایەوە کە ناشوکری نەبێ ماڵێ منالّی تیا نەبێ گەرمیان و کوێستانەکەشی بۆ ناکرێ. یەك دوویەکیشیان هەر مێردیان نەکردبوو، دیارە ئەوانیش هەم لە گەرمیان و کوێستان کردن بێبەش بوون. لەم ڕووەوە هەموویان پەژارە دایگرتبوون. یەکێکیان هەڵیدایە و وتی: وەڵا دایکم ئەوە قسەیە ئەنگۆ دەیکەن؟ چ بەمێردان نییە، بە خوڵای دانە! فاتیلەی حەمەدی وەتمانی چە مێردانیشی نەکردییە، ڕەوەیەکی لە دووە گەرمێن و کێستانی خۆیشی دەکاتن».

١٦٢. حەماغای کۆیە ڕایسپاردبوو بۆ پاسەوانێکی لێهاتوو، بە تایبەتی بۆ کوشك و گەلەخانەکەی خۆی. مام تەیموورێك هەبوو چوو وتی: قوربان! من ئیشم نییە و هاتوومەتە خزمەتت بۆ ئەوە پاسەوانییەکەم بدەیتێ. ئاغا وتی: «ڕۆڵە! من پاسەوانێکی چوارپەل قەوی تێك سمڕاوم ئەوێ؛ ئازا و نەترس بێ؛ شەڕە کوتەکی پێ خۆش بێ؛ تووشی هەرکە ببێ بیترسێنێ. شەڕ کردن و ئاو خواردنەوەی بە لاوە وەکوو یەك وا بێ. کە لەگەڵ شیرانی بە سەر یەکێکا هەموو گەڕەك بە ئاگا بێن و کابرایتر زراوی بچێ. ئەوەندەش مۆن بێ پیاو کە ئەوی دی بزانێ شەیتانی چاوپێکەوتووە. ئەگەر ئەمانە لە توا هەیە وەرە و چی شت ئەوێ ئەتدەمێ».

مام تەیموور وتی: «قوربان ئەمانەی جەنابت ئەفەرمووی، مەگەر هەر ژنەکەی من وا بێ. ئەوا ئەچم بۆت ئەنێرم» و لێی دا ڕۆیشت.

**١٦٣.** کوڕێـك هەبوو؛ دایکێکـی زۆر پیـری هەبـوو؛ واتـە لە هەشـتا تێپەڕیبوو. ڕۆژێك کوڕەکە وتی: دایە شەرعی خوا و پێغەمبەر فتوای داوە، مێرد کردن وەنەبێ شتێکی تێدا هەبێ. ئەڵێی چی مێردێکت لـە تەمەنـی خـۆتا بـۆ بدۆزمـەوە و مێـردی پـێ بکـەی و ئـەو چـوار ڕۆژە عومرەت کە ماوە، لەگەڵی ڕابوێری؟ دایکەکە زۆری پێخۆش بوو؛ وتی: ڕۆڵە، مادام ڕووم لێ ئەنێی بێدڵیت ناکەم؛ ئارەزووی خۆتە.

کـوڕە بەینێکـی زۆری پێچـوو هیـچ دەنگـی نەبوو. دایکەکـەی وتی: ئـەرێ ڕۆڵـە، تـۆ وەختـی خـۆی قسـەیەکی وات کـرد، کەچی ئێسـتا هیچ دەنگت نییە؟ قەزات بکەوێ لە دایکت! کوڕە وتی: وەڵڵا دایە هەرچەندە ئەگەڕێـم پیاوێکـی وا کە لە سێرەی تۆدا بێ دەسـت ناکەوێ. دایکەکە وتـی: «جـا ڕۆڵـە قەیدی چییە؟ مادام پیاوێکی وا دەست ناکەوێ، دوو پیـاوی چـل سـاڵم بـۆ بێنـە. ئـەوە بـە هەردووکیـان ئەکەنـە هەشـتا سـاڵ؛ ئەمەش هەر بۆ ئەوە کە قسەکەی تۆ نەشکێ».

**١٦٤.** دەستەیەکی ئەو سەردەمە ڕۆژێك ئەچنە دەرەوە بۆ ڕاوە «جوڕە» بە پەلەپیتکە. کوتوپڕ تفەنگێکی ساچمەزەن ئەدۆزنەوە؛ لێیان ئەبێ بە هەرا، نازانن چییە؟ ئەیهێننەوە بۆ ئاوایی و عەشیرەت و پیاوماقووڵی لێ کۆ ئەبێتەوە و ئەکەونە ڕاوێژکردن و هەڵهێنانی ئەم بەڵا گەورەیە کە خوا بە سەریا داون و نازانن چییە؟ یەکێ ئەڵێ: ئەمە حوشتری دەشتی عەرەبستانە و لـە کاروان بەجێ ماوە!؛ یەکـێ ئەڵێ: ئەمە بای غەزەوە و باڵی شکاوە. بە کورتی یەکێکی‌تر ئەیکا بە قاز و یەکێکی‌تریش بە باز.

لالـە تۆمـاس هەڵئەداتـێ ئەڵـێ: «ئێـوە هیچتـان ئەقڵتـان نییـە! ئەمە قەنەـەی خوایـە و لەوێـدا لێـی بەجێ مـاوە». هەموویـان ئەکەونە زڵپ

و بڵێ، ئەڵێن: ڕاست وایە. ئنجا ئەڵێ: «بۆ ڕاست و درۆیش کەڵە پشکۆیەکی لەسەر دانێن تا بۆتان تاقی کەمەوە، هەی بێ عەقڵینە!»

پشکۆی بۆ لەسەر ساچمە دائەنێن و دەم ئەنێ بە لوولەکەیەوە، نەفەسی لێ ئەدا. لەگەڵ نەفەس لێدانا تفەنگ ئەتەقێ و مێشکی ئەبا بە عاسمانا. لالە برزوویش هەڵئەداتێ ئەڵێ: «ئەوە دەردت وێ! بە قەننەی خوا سەویل ئەکێشی».

١٦٥. کابرایەك بووکێکی خۆی لەگەڵ بوو بۆ شار ئەهاتن. لەسەر کانی و ئاوێك لایان دا بۆ ئەوەی تۆزێ بحەسێنەوە. بووکەکە سکی پڕ بوو؛ لەشی گران بوو. لەو وەختەدا کە ویستی دانیشێ بایەکی لێ بەربوو، هەر زۆر زۆر تەریق بووەوە؛ لەوانە بوو ئیتر لە شەرمانا نە نانی پێ خورا نە ئاو.

خەزوورەکەی سەیری کرد ئەم کچە بەم جۆرە بکا بۆی ناگاتە شار؛ دەستی کرد بە دڵدانەوەی و وتی: کچم، قەینا کا شتێکی وا نەبووە. ئەوە ئیشەڵڵا کوڕت ئەبێ. بووکەکە تۆزێ هەناسەیەکی پیا هاتەوە و وتی: «کەواتە مامە با یەکێکی تریش بکەنم». خەزوورەکەی وتی: «کچم جارێ تۆ ئەوە گەورە کە، ئەو وەختە یەکێکی تر بکەنە».

١٦٦. کابرایەك پوورێکی خۆی ئەبێ ئەیبا بۆ لای مەلایەك ئەڵێ: لێم مارەکە. مەلاش ئەڵێ: باوکم پێت ناشێ، چۆن قسەی وا ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەی تۆ مەلای چەینێکی؟ بیشێنە». بە کورتی مەلا مارەی ناکا و کابرا ئەڕوا و بەبێ هێڵ و گفت ئەچێتە لای پووری خۆی.

لە پاش دوو سێ ساڵ کابرا، یەك دوو منداڵی لە پووری خۆی ئەبێ و منداڵەکان ئەداتە پێش خۆی و ئەچێتەوە بۆلای مەلاکە. پێی ئەڵێ:

«ها مەلا تۆ ئەتوت ناشیٔ. دەسا ڕووی کێمان ڕەش بوو؟ ئەم منالّانە هی کێیە؟».

**١٦٧.** جوولەکەیەك لە سولەیمانی هەبوو؛ حاتانی ناو بوو. ئەم حاتانە کڕیـن و فرۆشتنی زۆرتـر لەگـەڵ جافـەکانا بوو. حەمەپاشـای جافیش هەموو جار شتێکی پێویست بووایە ئەینارده لای و پسوولەیەکی بۆ ئەنووسی کە ئەوەندە پارەی کەوتۆتە سەر پاشا. حاتان بوو بە خاوەنی پسوولەیەکی زۆر و بـەڵام پولێکیشـی لـە پاشـا بـۆ وەرنەئەگیرایـەوە؛ کـە شکاتیشی بکردایە کەس شکاتی نەئەپرسی.

سـاڵێك حاکمێـك هاتـە سـولەیمانی و دەسـتی کـرد بـە توندوتیـژی و بەتایبەتی چوو بە ڕقا لەگەڵ بەگزادەکانی جافا. حاتان ئەمەی بە هەل زانی، چوو هەرچی سـەنەد و پسـوولەی هەبوو بردی بۆ حاکم و شکاتی پێوە کرد لە حەمەپاشا. زۆری پیٔ نەچوو کە حاکم هەموو هەقەکەی بۆ وەرگرێتەوە، کوتوپڕ لە بەختی حاتان، ئەو حاکمە لەویٔ نەما و دەور و دووکان وەکوو خۆی لیٔ هاتەوە. حاتان لە ترسـانا چوو هـەر سـەنەدێکی لە دەفتەری حوکمەتا هەبوو، هەمووی وەرگرتەوە.

لەم کاتەدا حەمەپاشا ناردی بە شوێن حاتانا وتی: هەچ سـەنەدێکی هەیە بیهێنیٔ تا پارەکەی پیٔ بدەمەوە. حاتان بە خۆشی خۆشی پسوولەکانی هەڵگرت و لیّی دا ڕۆیشت بۆلای پاشا. پاشا وتی: دەویت باوك! شکاتت لـیٔ کـردووم؟ دەسـا بـە گۆڕەکـەی زایەربـەگ هـەچ سـەنەدێکت هەیـە ئەبـیٔ ئێستە هەمـووی بخـۆی». هەرچەنـد حـاتان هاواری کرد کە پاشا هیـچ هەقێکـم ناویٔ و سـەنەدەکان ئەدڕم، کەڵکی نەبوو، بە زۆر هەموو سـەنەدەکانی پیٔ دەرخوارد دا و وەکوو کولێرەبەڕۆن ئەیجوی و قووتی ئەدا. وتی: «دەویت باوك! ئەوە دەردت ویٔ شکاتم لیٔ ئەکەی؟».

حاتان دەست لە گونان بەرەو ژێرتر گەڕایەوە بۆ سولەیمانی.
ماوەیەکی‌تری پێ نەچوو پاشا پارەی پێویست بوو، ناردیەوە بۆلای حاتان کە ئەوەندە پارەی بۆ بنێرێت و پارەکانی پێشوویشی ئەداتەوە، سەنەدێکیشی بۆ ئەنووسم. ئەوا ئەو وەختە ڕقم هەستابوو بۆیە وام کرد.

حاتانیش خۆ ناتوانێ ملەجیڕەیەك بکا، هەستا چوو بۆ لای و پارەکە و کولێرەیەکی لەگەڵ خۆی برد. پارەکەی دانا و وتی: پاشا سەنەدم ناوێ ئەوا پارەکەم هێناوە. پاشاش وتی: «نابێ وە قەورەکەی زایەربەگ سەنەد هەر ئەبێ بوێ لە بەینا». حاتان دەستی برد کولێرەکەی دەرهێنا و وتی: «کەواتە باشە لەسەر ئەم کولێرەیە بۆم بنووسە؛ دواجار بە حەزرەتی مووسا قاقەزم بۆ ناخورێ؛ بەڵام کولێرەکەم بۆ ئەخورێ». پاشا تەکبیر و قسەی جووەی بە لاوە سەیر بوو، لەسەر ئەمە پاشان هەچ پارەیەکی قەرزار بوو هەمووی پێدایەوە.

**١٦٨.** مەلایەك کابرایەکی شوانی فێری نوێژ و فاتیحە دەکرد. هەرچەندی لەگەڵ خەریك بوو، هیچ کەڵکی نەگرت و فێر نەبوو. هەر ڕەوانی ئەکرد و کەچی زۆری پێ نەئەچوو لە فیکری ئەچووەوە.

ڕۆژێك مەلا وتی: ئەمە وا نابێ؛ ڕووی کردە کابرا وتی: خۆ تۆ لە مەڕومالاَت زۆر چاك ئەزانی و ئەوانەت لە فیکر ناچێتەوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: کەواتە چەند مەڕێك بێنەرە پێشەوە تا بەهۆی ئەوانەوە هەر ئێستا فاتیحاکەت ڕەوان ئەکەی!.

کابرا چەند مەڕێکی لە ڕانەکە جیا کردەوە و مەلا چوو ملی مەڕێکی گرت وتی: باوکم! ئەمە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بێ. مەڕێکی‌تری هێنا وتی: ئەمە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾بێ. مەڕێکی‌تر وتی: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ

﴿ٱلدِّينِ﴾بێ. بەم جۆرە هەر ئایەتێکی کرد بە ناوی مەڕێك و کابرا زۆری نەخایاند سوورەی فاتیحای بە پوختی ڕەوان کرد. مەلا وتی: ئنجا بۆم بخوێنەوە بزانم چۆنی. بۆی خوێندەوە زۆر تەواو بوو.

لە پاش چەند ڕۆژێکی‌تر مەلا وتی: ئا وەرە فاتیحاکەم بۆ بخوێنەوە بزانم لە فیکرت نەچۆتەوە؟ وتی: بەڵێ. هات و دەستی پێ‌کرد: «﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ﴾، ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ آمین!».

مەلا وتی: ئەوە چی ئەڵێی تۆ؟ ئەی ئەوانی‌تری؟ وتی: مامۆستا ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ گورگ خواردی، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بەسەر بەرخەکەیەوە مرد، ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ کەوتە چاڵەوە، ﴿أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ خاوەنەکەی دای بە چەرچی، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ میوانمان هات خۆم سەرم بڕی، ئەمەش ئەوانی‌تری وا لەبەر دەستایە!.

**١٦٩.** کابرایەکی شاتری هەبوو «ئەحەجووجە»یان پێ ئەوت. چووە خزمەت مەحمووپاشا وتی: «پاشا قنگە زەوییەکەی گوێی چەمەکەی "دەڵێن"ـم پێ بدە ئەیکەم وە نێرکە کاهوو؛ تا لە کوێستان تینەوە گشتی قەف ئەکێشی، با ئیتر خۆمان نەوڕین وەسەر گۆرانە بێ فەڕەکانا. بۆ چڵێ کاهووە گوێی وی، ئێشی مردگی باوکیان دەرتێری».

مەحموو پاشاش ئەفەرموێ: ئەحە ئەو زەوییە کاهووی تیا نابێ؛ ئەوە چۆن بەکەڵك دێت؟ ئەحەش ئەڵێ: «پاشا! من کەرێك و تۆ کەرێك، وە قەورەکەی حەمە پاشا ئەوەندەی کوت بۆ تێرم لە لووتی باوکمان بێتەوە. کاهووی وا بێری نێرکی وایشت لە خەوا نەدیوێ». پاشا دەست ئەکا بە پێکەنین و ئیتر هیچ ناڵێ.

١٧٠. عەلی‌خانی ئەرکەوازی لە بەغدا ئەچێتە چێشتخانەیەك. لەگەڵ چێشتەکانا زەیتوونیشی بە چەتاڵێکەوە بۆ دائەنێن. بە چەتاڵ دێتە ویزەی زەیتوون، هەرچەند چەتاڵەکەی بۆ دائەهێنێتەوە زەیتوون وەکوو بەچکە کەروێشك لە ژێریا ڕائەکا و بەو ناوەدا خل ئەبێتەوە و بەر ناکەوێ. شاگردی چێشتخانەکە چاوی لەم بەزمە ئەبێ، هەر دێت و چەتاڵەکەی لێ وەرئەگرێ و یەکەوجار ئاڵقەی دەنکە زەیتوونی ئەکا و زەیتوون ئەبێ بەسەر چەتاڵەوە و ئەیدا بە دەست عەلی خانەوە؛ ئەڵێ: فەرموو. عەلی‌خانیش ئەڵێ: «کوڕە باوەحیز! ئەگەر من شەکەتم نەئەکردبا، تۆ ئاوا بهاتیایە و بتگرتایە، ئیتر تڕوفیزی چی ئەکەی؟».

١٧١. کابرایەکی ڕێبوار ڕێی کەوتە لای باخێکی هەنجیر و دڵی لێ چوو؛ لای دا و دەستی کرد بە هەنجیر خواردن. زۆری پێ نەچوو پیرێژنێکی لەولاوە لێ پەیدا بوو دەستی کرد بە جنێوپێدانی کە ئەو هەنجیرە بۆ ئەخۆی؟ کوڕە هیچ دەنگی نەکرد و هەر خەریکی هەنجیر خواردنی خۆی بوو. پیرێژن پێی لێ هەڵبڕی. کوڕە ئیتر ڕاگیر نەکرا وتی: پیرێژنە واز بێنە؛ ڕێبوارم چوار هەنجیر ئەخۆم و ئەڕۆم. پیرێژن هەر وازی نەهێنا، ئینجا کوڕە وتی: پیرێژن ئەوەندە درێژەی مەدەرێ دەسا شەرت بێ هەر لێت ڕاست ببمەوە چەن دان لە دەمتایە ئەوەندەت ئەگێم. دە وازم لێ بێنە، چوار هەنجیر ئەخۆم و ئەڕۆم.

پیرێژن ئەمجا زیاتر گەرم بوو. ناچار کوڕە هەستایە گیانی ئەوی پێی کرا لەگەڵی کرد و چووەوە گیان هەنجیر خواردنی. پیرێژن دیسان دەستی پێ کردەوە وتی: «تەماشاکە، تەماشاکە! هەنجیرانیش دەخوا درۆیانیش دەکا، خۆ تاقە ددانێکی‌تریشم لەو بنەوە ماوە».

١٧٢. ساڵێك لەو كوردەوارییە دەنگ وا بڵاو بوو بوەوە ئەستێرەیەك هەیە ئەكەوێتە خوارەوە و دنیا وێران ئەبێ و دوایی دێت.
مەلایەك هەبوو وتی: ئەم قسەیە ڕاستە؛ چونكە لە كتێبان دەفەرموێ: دنیا لەسەر شاخی گایە و گا لەسەر ماسییە و ماسی لەسەر ئاوە و ئاو لەسەر بایە؛ كە ئەستێرەكە كەوتە خوارەوە گایەكە هەڵیناگرێ و ئەڕوخێ.
وەستا ئەوڕەحمانێكی كۆیی هەبوو وتی: «بەخوا ماموٚستا ئەم ترەكەڵەكە سەر ناگرێ. بەو جۆرە تۆ ئەفەرمووی ئەستێرەكەش نەبێ هەر ئەڕووخێ».

١٧٣. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی «شێخەلی»یان پێ ئەوت ـ شەرع شەرمی بۆ نییە، پێیان ئەوت شێخەلیەپەڕۆ ـ؛ ئەم شێخەلییە لەم ئاخرەدا چاوی كوێر بووبوو، تەزبێحێكی دەنك گەورەی سەد دانەیی هەبوو، هەموو ئێوارەیەك پاش نوێژی شێوان لەسەر سەكۆی مزگەوتەكە تەزبێحێ «قل هو الله» و «فاتحە»ی ئەخوێند و خێرەكەی ئەنارد بۆ ئەو دۆست و ناسراوانەی كە لە وەختی خۆیا پێكەوە بوون و ئەیناسین. بە سەرە ناوەكانی هەڵئەدا و ئەگەیشتە سەر حاجی فلاّن لە بەینیا ئەیوت: «ئەو سەگبابە هەرچەندە زۆری عەزیەت كردم، بەڵام قەیناكا با ئەویشی تیا بێ». تۆزێكیتر ئەڕۆیشت و ئەگەیشتە سەر وەستا فلاّن؛ ئەوەستا و ئەیوت: «ئەو كەرانباوگاوە هەرچەندە هەموو جار كەواكەشی خراپ بۆ ئەدووریم، بەڵام قیروسیا با ئەویشی تیا بێ».
تۆزێكیتر ئەڕۆیشت و ئەگەیشتە مەلا فلاّن ئەیوت: «ئای ئای ئەو حیزبابە، هەموو جار لەناو خەڵكا پێ ئەوتم: تۆ مەلا نیت و ئەیشكانم؛ بەڵام وا ئەزانم سەگ خواردی با ئەویشی تیا بێ».
بەم جۆرە بە ناسراوەكانیا ئەهاتە خوارەوە؛ لە ئاخرا ئەیوت خێری

ئەم «قل هو الله» و «فاتحە»یەم بۆ ناردن. ئەمانەشی کە ئەوت بە جنێو و بە «قل هو الله» هەموو بە دەنگی بەرز ئەیوت، لەبەر ئەوە چاوی کوێر و گوێی کەڕ بوو لای وا بوو کەسی بە دەورەوە نییە؛ کەچی هەموو جارێکیش چوار پێنج کەسێکی هەر بە دەوریەوە بوو.

١٧٤. مەحموبەگی ڕەزابەگ گێڕایەوە وتی: لای ئێمە دەروێشێك هەبوو لەم ئاخرەدا کچێکی هێنابوو. دوو سێ شەو بوو چووبووە لای، نەبوو بە زاوا. شەوێك ئەوەندەمان زانی لە پاش نوێژی خەوتنان های و هووێ پەیدا بوو کە سەیرمان کرد ئەمە دەروێشەکەیە حاڵ گرتوویەتی و زیکر ئەکا و جەزبەی لێ هاتووە. زۆری پێ‌نەچوو هەر بەو حاڵەوە چووە ژوورەوە، بە دەوری ژنەدا هەڵئەسووڕا و ملی با ئەدا و ئەیوت: «یا شێخ ئەمە هی من نییە هی تۆیە؛ جا کەیفی خۆتە».

١٧٥. «مەحمووپاشای جاف» یەکێك بوو لە پیاوە هەرە گەورەکانی کورد. ئەو پیاوە بوو کە لەگەڵ وەسمان‌پاشای برایا دەستە جڵەوی عەشیرەتی جافیان گرتبووە دەست و هەڵیان‌ئەسووڕاند. ئەو عەشیرەتە کە خاوەنی چل هەزار خێوەت و لە شەکەل و شیروانەوە دایانگرتبوو تا «شاقەڵا» و «بس» و «مەولاناوا». ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی‌ترەوە ئەم مەحمووپاشایە وڵاتانی دیبوو؛ پیاوانی گەورە و کۆشکی والی و پادشاهانی دیبوو. لە هەرلایەك گوڵێکی چنیبوو، لە هەرشوێنێك ئەدەبێکی وەرگرتبوو، لە ئەنجاما خۆی بووبوو بە پیاوێکی ئەدەب‌پەروەری کورد. بەو زەکا و ئەدەبەوە سەرۆکی ئەو عەشرەتەی ئەکرد کە هەریەکە لە تەلێك لێیان ئەدا و هەریەکە جۆرە ئەقڵێکیان هەبوو.

بەڵێ، لە ڕەمەکی جافا گەلێ پیاوی ژیر و دانا، هەڵکەوتووە؛ ئەبێ

هەڵکەوێ؛ چونکە نەسیمی دەربەندان و هەوای دەشتان کە تێکەڵ بە جریوەی ئەستێرەی ئاسمان بوو، دیمەنەکەیان ئەکاتە کارێ کە لالغاوەی فیکر و هۆشی پیاوی هەوارگەڕی ئەو دیمەنە لێك بکشێنێتەوە و باوەڕی سافی وەکوو دوڕ دەربڕێ، وەکوو ئەمە ئەبێ.گەلێ پیاوی ساویلکەش لەو کۆڕەدا ئەکەوێتە مەیدانەوە کە ئاسوێ فیکری تەنها پڕی مێشکەکەیەتی و هیچی‌تر.

جا پیاوێك کە سەرۆکی عەشرەتێکی وا بگرێتە دەست، ئەبێ داناییەکەی و فراوانی دڵەکەی گەلێ گەورەتر بێ لە گەورەیی ئەو عەشرەتە؛ ئەگەر وا نەبێ عەشرەتداری پێ ناکرێ؛ ڕاستەیی ناکرێ چونکە: ئەزانێ ئەمانە بە دڵێکی سافەوە قسە ئەکەن و قسەکەشیان گەنجینەیەکی گەوهەرە بۆ زمانەکەیان. بۆیە مەحمووپاشا هەموو جار لەگەڵ هەرکەس لە پیاوی عەشرەتەکەدا بەپێی ئەقڵی ئەو قسەی لەگەڵ کردووە، لە پێکەنین بەولاوە هیچی‌تری نەداوە بە ڕوویا. هەر ئەم دڵ‌فراوانی و عەشرەتدارییەی بووە کە کردوویەتە کارێ نوکاتی ئەدەبی بە نرخی کوردی بۆ زمانی کوردی ماوەتەوە و بووە بە گوڵدەستەیەك بۆی. لە مانەش وەکوو ئەوە ئەڵێ:

جارێك کابرایەکی کورد کەرێکی ئەدزرێ و لای کابرایەکی‌تر بەسەری ئەکاتەوە و لێیان ئەبێتە مرومشت. لە ئاخرا ئەچن بۆلای مەحمووپاشا بۆ شکات. ئەمیان ئەڵێ: کەری منە و ئەویشیان ئەڵێ: هی ئەو نییە. لە ئاخرا کابرای خاوەن کەر ڕوو ئەکاتە مەحمووپاشا و ئەڵێ: «پاشا وە قەورەکەی حەمەپاشا چۆن تۆ ئەناسم ئاوا کەرەکەی خۆمیش ئەناسم؛ ئیتر بێژم چی ئەم کاورایە وا لێم چووگەسە چەقی لەعنەتەوە نامداتەوە».
کابرای‌تریش ئەڵێ: «دەسا پیاگی درۆزن ئەو قەنەی پاشایە وە قنگی!

دیارە تۆ پاشا ناناسی ئەگینا کەری خۆتت ئەناسیەوە».

پاشا بەم قسەیە دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: «برا برۆ کەرەکەی پێ بدەرەوە؛ کەری خۆیەسی، من خاس ئەناسێ».

**١٧٦.** کابرایەك لەو دەشتە جگەرەکێش ئەبێ، بەڵام هیچی پێ نییە. تووشی گۆرانێك ئەبێ و ئەڵێ: ئابرا کیسە تووتنەکەم پێ بدە؛ کیسەی ئەداتێ. ئەڵێ: ئابرا پەڕەیەکیشم پێ بدە؛ پەڕەیشی ئەداتێ. ئەڵێ: ئابرا توخوا قنگێکیشم پێ بدە (مەبەستی بە قنگ ئەغزەیە)؛ قنگیشی ئەداتێ. ئینجا ئەڵێ: ئابراکە کوچك و چەخماخەکەیشم پێ بدە؛ ئەویشی ئەداتێ. بە خێر بەم جۆرە جگەرەیەکی بۆ دروست ئەبێ و گۆرانەکەش لە ترسی ئەوە نەوەك کیسەکەی دەست نەکەوێتەوە ناوێرێ هیچ دەنگ بکا.



# هەندێك لە قارەمانی ژن

١٧٧. لەم ساڵانەدا لە بناری کۆیە کابرایەك هەڵکەوتبوو «خورشە کوێر»یان پێ ئەوت. خورشە لە پیاوخراپیدا وەکوو گورگی هاری لێ هاتبوو؛ بە جۆرێ ناوی دەرکردبوو منالّی ناو بێشکەیان بە ناوی ئەو ئەترسان و ژێر ئەبووەوە. خورشە چەتە بوو؛ دەستەیەکی پێکەوە نابوو ڕاووڕووت و پیاوخراپییان ئەکرد. وڵاتی کۆییانی هێنابووە زەلالەت. کاروانیان ڕووت ئەکردەوە، پیاویان ئەکوشت، سەرەڕای ئەمەش لە شوێنێکا ئەگەر تووشی ئافرەتێك ببوونایە، ئافرەت ئەگەر پەلی بە پەلی پێغەمبەرەوە بوایە، خورشە ئەبوایە لاقەی بکردایە.

ئیشی خورشە وای لێ هات حوکمەتیش لە دایەخی دەرنەئەهات. ناچار حوکمەت فەرمانێکی دەرکردبوو: کە هەرکەس خورشە بە زیندوێتی وە یا بە مردوێتی بهێنێ پێنجسەد ڕووپیەی ئەو دەورە بەخششی ئەدرێتێ. بەڵام خورشە دەست کێ ئەکەوت و کێ ئەیوێرا شان بدا لە شانی؟

لە دێی «شەوگێڕ» هەر لە بناری کۆیە، کچێك هەبوو «فاتە»ی ناو بوو. ئەم کچە بە فاتەقۆریتان بەناوبانگ بوو. فاتە کەسی نەبوو تەنها برایەك نەبێ؛ براکەی بە ڕۆژ ئەچوو بەلای کاسبی لادێییەوە و فاتەش بنەوانییەکەی ئەکرد. بۆ خۆیان کولانەیەکیان پێکەوە نابوو، بە ژیانێکی خۆش و سەربەرزی و داوێن پاکی پێکەوە ئەژیان.

بەڵام فاتە گوڵێك بوو لە گوڵی جوانی، کە خوا لە گوڵستانی وڵاتی

کۆیەدا بە تاقانە دروستی کردبوو؛ کەڵەگەتێکی باڵابەرز، ڕوومەتێکی پان و سوور و سپی، دوو چاوی گەورەی ڕەشکاری برژانگ درێژ، لووتێکی باریك بە بەینی دوو گۆنا سوورەکەیا هاتبووە خوارەوە. باسی گۆنایان جاران بە سێوی سەردەشت ئەکرد. مەمکی تازە سێبەری کردبوو. دوو باسکەکەی سەری پیاوی تێك دابوو: لەلایەکی ئەتبینی دوو باسکی زێوینە بە فاتەوەیە؛ کەچی لەلایەکیترەوە ئەتبینی دوو باسکی مەردانەی پاڵەوانییە بە فاتەوەیە.

شەوێك لە پێش مەلا بانگدانا «کاکی فاتە» فاتە خەبەر ئەکاتەوە بۆ ئەوە هەستێ. هەر سەرلەئێوارە هەویری کردووە بیکا بە نان و نان لەگەڵ خۆی بەرێ و بچێ بۆ سەر ئیشی. دنیا تاریك بوو. فاتە، کە هەڵئەستێ سەیر ئەکا داریان نییە نانەکەی پێ بکا، ئەچێتە دەرەوە بۆ بناری ئاوایی باوەشەدارێك بێنی خێرا نانەکەی پێ بکا و فریای کاکی بکەوێ.

لەبەر ئەوە دنیا تاریك بوو، لە نزیکی ئاوایی داری بەرچاو نەکەوت و تۆزێ دوور کەوتەوە، باوەشەداری کرد و لەو کاتەدا ئەیەوێ بگەڕێتەوە، خورشە بە خۆی و پیاوەکانیەوە لەسەر سەریەوە پەیدا ئەبن. لەو دەشتەدا و لەو تاریك و لێڵەدا فاتە دەنگی بەخوا نەبێ بە کەس ناگا.

خورشە دەورەی فاتە ئەدا و تەنگی پێ هەڵئەچنێ. فاتە ئەپاڕێتەوە، هیچ کەڵك ناگرێ. کەوش و پێڵاوی خورشە ماچ ئەکا، هیچ کەڵك ناگرێ. ئەڵێ: خورشە ئەوا وام لە بەردەستتا بمکوژە و ئیشی وام لەگەڵ مەکە و نامووسی خۆم و برام مەشکێنە؛ هیچ کەڵك ناگرێ. لە فاتە گریان و پاڕانەوە و لە خورشە دڵڕەقی و دڵپیسی. بە کورتی خورشە لاقەی فاتە ئەکا و پەردەی کچێنی لەو دەشتەدا و لەو تاریك و لێڵەدا هەڵئەگرێ و بەجێی دێڵن.

ئەوا دنیاش بەرە بەرە ڕوون بووەوە، فاتە دەستێکی ئەکەوێتە ئەملا و دەستێکی ئەکەوێتە ئەولا نازانێ چی بکا: ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و کارەسات بۆ برای ئەگێڕێتەوە، قورعانی کەعبە بکاتە ملی برا بڕوای پێ ناکا و ئەیکوژێ؛ ناگەڕێتەوە ڕوو بکاتە کوێ و بۆ کوێ بچێ؟ لەم دەریای فیکرەدا ئەمێنێ و دنیاش وا هەتا بێت ڕوونتر ئەبێتەوە. چار ناچار ئاخر فیکری خۆی دێنێتە سەر ئەوە کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و دەنگ نەکا تا بزانێ پاشەڕۆژ بە چی ئەگا.

باوەشە داری خۆی هەڵئەگرێ و دێتەوە. نان بۆ کاکی دروست ئەکا و برا ئەچێ بۆ سەر ئیشی خۆی. ئەمیش ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ پەژارە دایئەگرێ و نازانێ چی بکا؟ لە ئاخرا فیکری دێتە سەر ئەوە کە بە شەو بۆی دەرچێ و بچێ بە شوێن خورشەدا بگەڕێ، بەڵکوو لە شوێنێك تووشی ببێ و تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە و ناموسی خۆی و برای وەربگرێتەوە.

خورشەش ئیتر ئەوە عادەتی بوو کە ئێوارەی لێ ئەهات نزیکی ئاوەدانی ئەکەوتەوە و بە ڕۆژ لەگەڵ هاوڕێکانیا لەو شاخ و چیایانە خۆیان ئەشاردەوە. لە هەلێکا ڕاووڕووت و پیاوکوژەیەکیان ئەکرد و دیسان خۆیان ون ئەکردەوە.

فاتە ئێوارە کە برای لە کەژ دێتەوە نانی بۆ دروست ئەکا. نان ئەخۆن و ئەنوون. برا هیلاکی ڕۆژە، زوو خەوی لێ ئەکەوێ. فاتە کە دڵنیا بوو وا برای خەوی لێ کەوتووە، بە هێواشییەك لەناو جێگەکەی دێتە دەرەوە، تفەنگ و فیشەکدانی برای وا هەڵواسراوە، فیشەکدان لە پشت ئەبەستێ و تفەنگ ئەکاتە شانی و لە ماڵ دەرئەچێ و ڕوو ئەکاتە ئەو دەشتە. لەم شیو بۆ ئەو شیو، لەم کێو بۆ ئەو کێو تا بەری بەیان ئەسوورێتەوە تووشی هیچ نابێ. کە ئەزانێ وا ئیتر دەمەدەمی بەیانە ئەگەڕێتەوە بۆ

ماڵەوە تفەنگ و فیشەکدان ئەکاتەوە بە دارا و خۆی ئەکاتەوە بە ژێر جێگەکەیەوە.

فاتە بەم جۆرە دەست ئەکا بە شەو دەرچوون و بە شوێن خورشەدا گەڕان تا نزیکەی دە پانزە شەو، بۆ نەگبەتی ئەو تووشی هیچ نابێ و نیشانێکی لە خورشەوە دەست ناکەوێ؛ بەڵام هەر واز نایەنێ و ئەو ڕێگەی دەرچوونە کە گرتوویەتی بە شەو هەر ئەیگرێ.

شەوێك فاتە لەسەر ڕێوشوێنی خۆی ئەڕوا، کوڕەی برای لە نیوەشەوا کوتوپڕ خەبەری ئەبێتەوە بانگی فاتە ئەکا کە ئاوی بۆ بێنێ. تەماشا ئەکا دەنگ نییە؛ فاتە فاتە، هیچ دەنگ نییە. ئەڵێ: ئافرەتە چووەتە سەر پێشاو ئێستە دێتەوە؛ فاتە هەر نەهاتەوە. کوڕە دڵی کەوتە چەکەرە کردن و هەستا چووە دەرەوە و دەستی کرد بە گەڕان؛ سەیر ئەکا فاتە لە هیچ شوێنێ نییە. هەر بە تەواوی کەوتە گۆمێ پەژارەوە، کە هاتەوە ژوورەوە سەیری کرد تفەنگ و فیشەکدانەکەشی دیار نییە. ئیتر بە تەواوی سەری لێ تێکچوو، زانی فاتە بردوویەتی و نازانێ چ باسیشە؟

لەم گێژاوی خەیاڵەدا بوو کوتوپڕ گوێی لە خشەیەکی بە هێمنی دەرگاکە بوو. گورج خۆی کرد بە ژێر جێگەکەیەوە و خەوی لە خۆی خست. کە سەیری کرد وا فاتە بەبێ دەنگ و سەنگ و زۆر بە نەرمی هاتەوە ژوورەوە تفەنگ و فیشەکی وەکوو خۆی دانایەوە و خۆی کرد بە ژێر نوێنەکەوە. کوڕە لەم کارەساتە ئارامی لێ هەڵگیرا و هات دەنگ بکا، پاشان وتی: ئەم ئیشە ئیشی تاقە شەوێك نییە، چاك وایە دەنگ نەکەم سبەی شەوێ هەستم شوێنی کەوم بزانم چییە مەسەلە!

ئەو شەوە ڕۆژیان کردەوە و بەیانی کوڕە هەستا چوو بۆ سەر ئیش و کاری خۆی و ئێوارە گەڕایەوە و نوستن؛ بەڵام کوڕە هەر ئەوەبوو خۆی

کردە نوستوو، ئەگینە نەنوستبوو. شەوێ لە نیوەشەوا فاتە وەکوو جاران کە زانی برای خەوی لێ کەوتووە، هەڵسا تفەنگ و فیشەکی هەڵگرت و چووە دەرەوە. کوڕەی برایشی لە پاش تۆزێك ئەمیش هەستا و دوور و نزیك زۆر بەبێ هەستی، شوێنی کەوت. سەیر ئەکا فاتە لەم کێو بۆ ئەو کێو لەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ فیشەکی خستۆتە بەر لوولەی تفەنگ و بە دەستیەوەیە و ئەگەڕێ. لە پاش گەڕانێکی زۆر کوڕە ئیتر ئارامی لێ بڕا و چوو خۆی لێی ئاشکرا کرد و وتی: «فاتە چییە و چە کارەساتێکە؟ شێت بووم، تێم بگەیەنە».

فاتە، کە لەو دەشتەدا و لەو ناکاوەدا برای خۆی لە بەردەمیا چاوپێ کەوت، تەزوویێك هات هەموو لەشی تەنییەوە و وشك ڕاوەستا. لە پاش ئەوە کە تاوێکی کشوماتی پەردەی کێشا بە سەریانا، فاتە لە خەوی سەرسامی خەبەری بووەوە و هۆشێکی هاتەوە بە خۆیا وتی: کاکە! دانیشە لەم تۆی تاریکی شەوەدا و لەم دەشتی دوور لە ئاوەدانییەدا کە تەنها خوا و تاپۆی سامناکی تاریکی شەو نەبێ هیچی‌تر دیار نییە، دانیشە تا لە کارەساتی ڕۆژگار و لە چەواشەیی بەختی بەدکردارمت تێ بگەیەنم. برا دانیشت و خوشك لە بەردەمیا، ئەوی بە سەری هاتبوو لەو شەوەوە کە هەستا نان بکا بۆ برای و داریان نەبوو، لە پێش بەیانا ڕووی کردە دەشت بۆ دار و خورشە کوێر و هاوڕێکانی تووشی بوون و خورشە بە دەستی ستەمکاری هەرچەندە ئەم لێی پاڕایەوە کەڵکی نەبوو، پەردەی کچێنی هەڵگرت و ئەمەش چەند شەوە بەم جۆرە کە ئێستە ئەو ئەیبینێ عەودالی شوێن خورشەیە کە بەڵکوو تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە، تا ئێستە، بەم جۆرە تووشی بوو بە برا سەرسام و چۆڵگەردەکەیەوە بە شوێنیا. ئەمانەی هەموو بۆ گێڕایەوە.

فاتە ئەم قسانەی کرد و دەستی برد تفەنگ و فیشەکدانی لە ملی داماڵی و لە بەردەمی کاکیا داینا و وتی: «ئێستەش ئەوا شەوە و کەس دیار نییە؛ ئەگەر بڕوام پێ ئەکەی بەو خوایەی کە تەنها ئەو نەبێ کەسی‌تر لەم کاتەدا ئاگای لە ئێمە نییە! کارەسات بەو جۆرە بووە کە بۆت ئەگێڕمەوە. ئەگەر بڕواشم پێ ناکەی ئەوا فیشەك لەبەر لوولەی تفەنگایە؛ تفەنگێکم پێوە بنێ و بمکوژە بۆ ئەوە کە ئێمە تا ئێستە بە سەربەرزی و بە ڕووسووری ژیاوین. لە ئێستە بە دواوە لە ناوچەوانی منەوە تۆ لەکەدار نەبی و گیانی من ببێ بە گاوگەردوونی تاقە سەعاتێکی شەرەف و ناوبانگی تۆ. وە چۆڵیشە کەس نازانێ. ئەتوانی لەپاش کوشتنەکەم بچیتەوە ماڵی خۆت و بەیانی دەنگ وا بڵاو بکەیتەوە کە خوشکم دیار نییە و لە پاش گەڕان و پرسیار دیارە تەرمەکەم ئەدۆزرێتەوە و ئەنێژرێ و تۆیش گۆیا هەر لەملاوئەولا پرسیار ئەکەی بە شوێن ئەو کەسەدا کە خوشکتی کوشتووە. ئەمەش بۆ ئەوە با پاش منیش قسەی کوشتنی من نەدەنە پاڵ تۆ، تووشی هیچ نەبی. ئەگەر ئەمە ئەکەی بیکە، ئەگەر خۆ ناشیکەی تۆزێ پشووت ببێ، بێگومان خوا ئەم نهێنییە دەرئەخا. ئەو وەختە ئەگەر خوشکت ڕووسوور و بێ‌گوناح بوو، دەرئەکەوێ، ئەگەر خۆ وایش نەبوو فیشەکەکەی ئێستە هەر ئەمێنێ.

کوڕە کە گوێی لەم قسانە بوو لەم عالەمەوە کەوتە عالەمێکی‌تر و دەنگی درنگەی سەرسامی لە مێشکیا پەیتا پەیتا تەونی ئەتەنی. هەرچەند دنیا شەو بوو بەڵام ئەگەر ڕۆژیش بوایە ئەو دنیا لەو شەوە تاریکتر ئەبوو لە بەرچاوی. کەوتە گێژاوی ئەم هەرەسەوە، لە پاش لێکدانەوە و سێ و دوویەکی زۆر لە دڵی خۆیا، تفەنگ و فیشەکی هەڵگرت و وتی: فاتە هەستە با بچینەوە بزانین ئەم دنیایە لە بارەی ئێمەدا بە چە

کارەساتێکی‌تر ئاوسە و چە ڕووپەڕەیەکی‌ترمان بۆ دێنێتە پێشەوە؟.

سا زۆری پێ نەچوو هەروا بە دەم کشوماتی ڕۆیشتنەوە فاتە سەیری کرد لە کوێرەشیوێکی دوورا تارمایی دووکەڵێکی بەرچاو کەوت؛ وەستا و وتی: «کاکە! ئەوا لەو شیوەدا چاوم لە دووکەڵێکە؛ برایەتیم لەگەڵ بکە ئیزنم بدە با بچم بزانم چییە؟ ئێ، بەڵکوو ئەمە خوایە خورشە بێت تۆ لێرە ڕاوەستە بە فرکانێ ئەگەڕێمەوە لات». کاکی کە لای کردەوە، ڕاستە دووکەڵێکی بەرچاو کەوت. لایە زۆر و لایە خواهیشت ئیزنی دا و وتی: بچۆ.

فاتە، کە چوو تەماشای کرد، وا لە کوێرە شیوەکەدا خورشە و دوو زەلامی‌تر دانیشتوون چایان لێناوە، چا ئەخۆنەوە. بەبێ ئەوەی ئەوان هەستی پێ بکەن خێرا گەڕایەوە بۆلای براکەی. وتی: «کاکە! خوا هاتووە بە هانای داوێن‌پاکی و بێ‌گوناحی منەوە؛ ئەوا خورشە بە خۆی و دوو کەسی‌تر لە هاوڕێکانیەوە لەوێ دانیشتوون چا ئەخۆنەوە. ئێستە منیش ئافرەتم و چست و چالاکی پیاوم نییە بۆ ڕاکردن، لێرەشەوە تا کۆیە ڕێگەیەکی دوورە، لە تواناى منا نییە بەم دەم و دەستەیە. تفەنگ و فیشەکەکە بدە بە من، تۆ بچۆ بۆ کۆیە خەبەر بە مەفرەزە بدە با بێن پێنجسەد ڕووپیەکەش وەرئەگری. تا ئێوەش ئەگەنەوە ئەگەر من هێشتم ئەمانە دەرچن ئەو وەختە گوللەیەکم پێوە بنێ.

کوڕە لە پاش لێکدانەوە تفەنگی دا بە خوشکی و خۆی ڕووە و کۆیە بووەوە. ماوەی کۆیە و ئەو شوێنەش سێ سەعاتە ڕێگەی پێیان ئەبوو. لەولاوە کوڕە ڕۆیی و لەم‌لاشەوە فاتە تفەنگی گرت بە دەستەوە و وەکوو شێری برسی کە بە شوێن نەچیرا بگەڕێ و نەچیری خۆی دەست کەوتبێ، بەو جۆرە دەورەی خورشەی دا. تا گەیشتە ئەم پلەیە دنیا بەرە

بەرە ڕوون بوەوە.

ئەمیش لەسەر سەریانەوە کردوویە بەسەر «کڵاوە»یەکدا فیشەکی لەبەر لوولەی تفەنگایە و بۆیان چووەتە پارێزەوە، بەو نیازە یا تنۆکە خوێنە بە ناموس و پڕ لە ئازایییەکەی خۆی لەوێدا بڕێژێ، وەیا ئەگەر هەور پەلێکی ڕاکێشێ و خورشە بفڕێنێ، ئەم نەیەڵێ.

لەو سەردەمەدا کە دنیا وا هەر پەردەی تاریکی ئەداتە لاوە، یەکێ لە هاوڕێکانی خورشە هەڵئەستێ بۆ ئەوە ڕێ و بان تاقی بکاتەوە و ئیتر ئەو شوێنە بەجێ بێڵن و بڕۆن. کە هەڵئەستێ و سەیرێکی ئەملاوئەولا ئەکا تەماشا ئەکا وا لە تۆزێ دوورەوە یەکێك بە تفەنگەوە لەسەر سەریانەوە ڕاوەستاوە، خۆی ئەکێشێتە پەنا بەردێکەوە و ئەویش دەست ئەداتە تفەنگ و بانگی هاوڕێکانی ئەکا.

لەم کاتەدا فاتە دەستی لە کارا ئەبێ و تفەنگێکی تێ ئەگرێ. گوللە وەکوو ئاگری قودرەت ئەڕوا، تا کابرا دەست بە پێ تفەنگا دێنێ گوللە ئەنیشێتەوە بە ناوچاوانیەوە. لە نیوەی لووتی بەرەوژوور بە مێشکیەوە ئەیپرژێنێتەوە ئەو ناوە. هاوڕێ ڕاست ئەبنەوە و ئەبێ بە شەڕە تفەنگ. بە هەر لایەکدا سەر دەردێنن فاتە بە گوللە بەرەنگاریان ئەبێ. دیسان گوللەیەکی‌تر ئاوقەی ئەو هاوڕێییەکەی‌تری خورشە ئەکا ئەیدا لە شانی و برینداری ئەکات، برینداریێکی وا کە کەڵکی ئەوەی ئەبڕێ دەست بداتە تفەنگ. مایەوە سەر خورشە و فاتە. ئەم دووە وەکوو دوو شێری تووڕە بە گوللە هاویشتن و بە بەرەنگاری یەك‌کردن بەر ئەبنە یەك. دنیا تەنگی بە نیوەڕۆ هەڵچنی، ئەو دووە بەو جۆرە لە جەنگا بوون و فاتە نەیهێشت خورشە لە شوێنەکەی دوور کەوێتەوە.

لەو وەختەدا برا بە دەستە مەفرەزەی پۆلیسی حوکمەتەوە گەیشت

و دەورەی خورشەیان دا. تا ئەم وەختە ئەوی لە ئەستۆیا بوو کە بەرەڵا نەکردنی نەچیرەکەی بوو بەجێی هێنا. لە ڕاستیدا خورشەش مەردانە هاتە دەست، تا ئاخر فیشەکی پێ ما؛ کە فیشەکی پێ نەما تفەنگەکەی فڕێ دا و ئەو وەختە پۆلیسەکان چوون گرتیان و دایانە پێش بۆ کۆیە. هاوڕێکانی ئەوەبوو یەکێکیان کوژرا بوو، تەرمەکەیان خست بەسەر وڵاغێکا و ئەویکەشیان بە بریندراری لەگەڵ خۆیان برد. ئەم کارەساتە لە وڵاتی کۆیە دەنگێکی گەورەی دایەوە.

کە ئەمانە برانەوە کۆیە، کوژراوەکە نێژرا. بۆ خورشە و هاوڕێ بریندارەکەشی مەحکەمەی کوبڕا هەر لە شاری کۆیە دانرا. لە ئەندامەکانی مەحکەمە یەکێکیان «مەلا سەدیق»ـی نازەنینی بوو. چەند ڕۆژ ئەو موحاکمەیە درێژەی کێشا و باسوخواس ئاشکراش بوو. عالەمی کۆیە هەموو ئەچوون و تینووی بڕیاری مەحکەمە بوون، فاتەش بەبێ پسان هەموو ڕۆژێك لە سەرەتای موحاکەمەوە تا دوایی هاتنی ئەچوو لە گۆشەیەکی ژووری مەحکەمەوە دائەنیشت و گوێی لە کارەسات و پرسیار و وەڵامی ئەندامی مەحکەمە و خورشە ئەگرت. لە دوایی هاتنی مەحکەمەدا ئەندامی مەحکەمە بە دەنگی بەرز بڕیاری دادی بە سەر گوێگرانا بڵاو کردەوە بە پانزە ساڵ حەپس بۆ هاوڕێ بریندارەکەی خورشە، وە بە خنکاندنی خورشە تا مردن.

لەم کاتەدا فاتە ڕاست بووەوە و ڕووی کردە ئەندامی مەحکەمە وتی: ئایا دەستوورم ئەدەنێ تەنها تاقە قسەیەك لەم ژووری مەحکەمەیەدا لەگەڵ خورشەدا بکەم؟ مەحکەمە لە پاش پشکنینی فاتە ـ بۆ ئەوەی نەوەك چەکی پێ بێ ـ ئیزنی دا. ئینجا چووە بەردەمی خورشە و دوو سمێڵی زلی پێوە بوو، سمێڵەکانی گرت و دوو تفی کردە ناوچاوانی وتی:

«خورشە چەندت لێ پاڕامەوە ئەو شەوە کە دەستم لێ مەدە؟ چەند خوا و پێغەمبەرم کردە تکاکارت؟ چەندە خۆم خست بەسەر پێڵاوەکانتا کە خوا ڕەوای هەقی نییە تۆ وا لە من ئەکەی؟ ئا ئەمە ڕۆژەکەیە کە خوا هەقی بێگوناحان ئەستێنێ و ستەم، با درێژەش بکێشی هەر ئەبێ ستەمکار بە تۆڵەی خۆی بگاتەوە» و بەرەڵای کرد. خورشەش هەر ئەوەندە هاتە زمان وتی: «ڕاست ئەکەی و هەقتە». مەحکەمەش لەو شوێنەدا هەڵنەستا تا بڕیارێکی ڕەسمی بۆ فاتە دەرکرد کە بە شەرع و بە قانوون ئەم کچە بە کچ بناسرێ و هیچ گەردێکی لێ نەنیشتووە.

فاتە بە ڕوویەکی لە مانگ نوورانی‌تر و گەشتر لە ژووری مەحکەمە هاتە دەرەوە. کاکیشی پێنجسەد ڕووپیەی خۆی وەرگرت. هاوڕێی خورشەش خرایە بەندیخانەی پانزە ساڵی خۆیەوە. خورشەش نێردرایە هەولێر لەوێ سێدارەی بۆ هەڵخرا و ملی کرا بە تەنافەوە و خنکێنرا. لە بەیانیەوە تا ئێوارێ بە دارقەواخەکەوە مایەوە؛ وڵاتیش ڕزگاری بوو لە جانەوەریەتی ئەو جانەوەرە، بەهۆی باهۆی مەردانەی فاتەی قارەمانەوە.

**١٧٨.** لە وڵاتی «ئالان»، وڵاتی قارەمانان، کارەساتێکی زۆر سەیر لەو چەند ساڵانەی ڕابوردووەدا ڕووی دابوو. کارەساتە ترسێنەرەکەی «بەسێ» ئەو کارەساتە کە ئێستەش دەماودەم ئەیگێڕنەوە و جەرگە بێترس و داوێنە پاکەکەی بەسێ، وەکوو نموونە پیشان ئەدەن. توخوا حەیفە، خوێندەوارانی ئەم ڕشتەیە لەو زنجیرە قارەمانییەی بەسێیە با بێئاگا نەبن.

«بەسێ» کچێکی جوانکەلەی نازکۆڵە بوو؛ بە چەند ساڵێکی کەم لە براکەی بچووکتر بوو. مناڵێکیان لە ماڵ هەبوو، ئەویش هەر لە تەمەنی

ئەمانا بوو. ئەم مناڵە کوڕی پیاوێکی هەژاری دراوسێی ماڵی باوکی بەسێ بوو؛ باوکی ئەم کوڕە سەپانی ئەمان بوو. ئەم سێیە هۆگری یەك بووبوون؛ هۆگرێکی وەها کە کەس جیای نەئەکردەوە ئەو مناڵە برای بەسێ و براکەی نییە. شەو و ڕۆژ لە دەشت و ماڵا ئەمانە هەر پێکەوە بوون، هەر پێکیشەوە گەورە بوون.

«حەمەدێ» ـ برای بەسێ ـ بوو بە پیاوێك لەو ناوەدا ناوی دەرکرد. بەسێ لە حەمەدێ لە شۆخوشەنگیدا گەلێ زیاتر ناوی دەرکردبوو؛ وەکوو ئەیگێڕنەوە بەسێ ئەگەر مێوژە ڕەشکەی بخواردایە لە سای گەردنیەوە دیار بوو. کوڕەی، کوڕە سەپانیش ـ کە کوڕی ماڵ بوو ـ ئەویش گەورە بوو، بوو بە پیاوێك؛ تومەس لە دڵا دڵی چووە لە بەسێ و ناشوێرێ بیدرکێنێ.

ڕۆژگار هێنای و بردی، داواکەری بەسێ زۆر بوو. لە ئاخرا باوکی بەسێ لەگەڵ کوڕێکی «سپیارە»ییدا ڕێ‌کەوت و بە حەسب و ڕەزای بەسێ، بەسێ درا بەو کوڕە و شایی و زەماوەن کرا. بەسێ گوێزرایەوە بۆ کوڕە لە سپیارە.

کوڕەی کوڕی سەپان ئەوا بەسێ لێی دوور ئەکەوێتەوە نازانێ چی بکا. هێنای پیلانێکی وای خستە کار کە لەگەڵ بەسێ بچێ بۆ سپیارە. ماڵی باوکی بەسێ ئەم کوڕەیان هەر بە برای بەسێ داناوە؛ وەکوو بەسێ چۆن سەیری حەمەدێ برای کردووە هەر بەو جۆرەش سەیری ئەم کوڕەی کردووە. هەموویان قسەیان هاتە سەر ئەوە کە ئەم کوڕە لەگەڵ بەسێدا بڕوا و بەسێ ئەچێ بۆ وڵاتێکی غەریبی، با برایەکی خۆی لەگەڵ بێ، بەسێ دڵی پێ بکرێتەوە.

تەدارەکێکی گێڕا و سپیارەیی هاتن بووکی خۆیانیان گوێستەوە و باوکی بەسێ کوڕەی لەگەڵ بەسێدا بە ناوی برایەکیەوە نارد. بەسێ

لە ماڵی مێردا زۆر بە حورمەت و بە چاوێکی بەرزەوە سەیر ئەکرا. بەسێش لەگەڵ مێردی خۆیا بە تەواوی ڕێك کەوت. ماوەیەکی پێ چوو باوەخوون کرایەوە و گەڕانەوە ماڵی خۆیان. لەم ماوەیەشدا کوڕەی کوڕی سەپان لەو وڵاتی سپیارە هەموو کەس بە برای بەسێی ئەزانی و هیچ شەرم و شکۆفێك لە بەینا نەبوو.

ساڵێك بەسەر بووك و زاوادا تێپەڕی و بەسێ کوڕێکی بوو. لەم ماوەیەدا بەسێ جارجار هەر هاتوچۆی ماڵی باوکی ئەکردەوە. کە بوو بە خاوەن مناڵ لە لایەکەوە ئەرکی ماڵ و لە لایەکەوە ئەرکی مناڵ، ئیتر ئەوەندەی پێ نەئەکرا بچێتەوە بۆ ماڵی باوکی. بەسەر مناڵ بوونەکەشیا ساڵێك تێپەڕی و کوڕەکەی هەروا کەوتە گاگۆڵکێ و دەمەدەمێ و دارە دارە. کوڕی چی؟ کوڕ لە بەسێ بوو ئەتوت دەنکی هەنارە.

ماوەیەك بوو بەسێ نەچووبووەوە بۆ ماڵی باوکی؛ ئەڵهای زۆر ئەکرد. ماڵی خەزوورانیش لەبەر ئیش و کاری لادێ پێیان نەئەکرا لەگەڵ بەسێ بچن و بیبەنەوە بۆ سەردانی ماڵی باوکی. بە ئیمڕۆژ و سبەی چەند ڕۆژێك دوایان خست. پاشان وتیان: ئەمەی پێ ناوێ ئەوا برای خۆی لەگەڵە با ئەو بیباتەوە، چەند ڕۆژێك لە ماڵی باوکی ئەمێنێتەوە ئەو وەختە ئەگەر ئێمە پێمان کرا ئەچین ئەیهێنینەوە؛ ئەگەر پێشمان نەکرا ئەوا هەر کوڕە ئەیهێنێتەوە.

بەسێ تەدارەکی خۆی گرت و کۆرپەی خۆی گرتە باوەش و کوڕەیان خستە تەکی و لێیان دا ڕۆیشتن. بەسێ ئەو ڕێگەی چەن جار پیا هاتبوو شارەزابوو، بەو ڕێگەدا چوون. ماوەیەکی باش ڕۆیشتن کوڕەی کوڕەسەپان وتی: ئەو ڕێگەیە دوورە، من ڕێگەیەکی تر پێ ئەزانم با بەوێدا بچین. کچە وتی: باشە برام، بە کوێدا ئەڵێی با بچین. کچە

سەیر ئەکا ڕێگەکەیان هەر ڕووە و هەڵدێر و تووش ئەڕوا. وتی: برام وادیارە ئەم ڕێگەیە زۆر تووش و ناخۆشە بۆچ لێرەوە هاتین؟ کوڕەش ئەیوت: قەیدی نییە ئەم ڕێگەیە نزیکترە.

هەر ڕۆیشتن و نەگەینە شوێنێك؛ شەویان بەسەرا هات. بە شاخەکەدا سەرەوژوور ئەبوونەوە. دنیا زۆر تاریك بوو. تاریکێکی وەها پەردەیەکی بە سام کشابوو بەسەر ئەو شاخ و چیایەدا. دنیاش گیا ڕەشی بەهار بوو لە لایەکەوە؛ کشوماتی تەنها دەنگی نهێنی کردگار نەبێ هیچی‌تر نەئەگەیشتە ئەو شوێنە. کچە زۆر ئەترسا. کوڕەش دڵی ئەدایەوە.

شەو درەنگ کەوت و کەوتنە ناوەندی شاخەکە و ئەشکەوتێك لەوێدا بوو. کوڕە وتی: با ئێمشەو لەم ئەشکەوتەدا ستار بگرین، بەیانی ئەڕۆین. کچە وتی: باشە برام؛ ڕاستی منیش زۆر هیلاك بووم. چوونە ئەشکەوتەکەوە، بەسێ کۆرپەکەی بە باوەشەوەیە، خەوی لێ‌کەوتووە؛ بەڵام سامێکی‌تر خۆی دا بەسەر ئەشکەوتەکەدا. بەسێ لەوانە بوو زیرە بکا و هیچ دەرەتانێکیشی نییە، تەنها ئەوە نەبێ کە برایەکی خۆی لە لایە.

بەڵێ، ڕاستە برای باوك و دایکی نەبوو، بەڵام برایەك بوو کە لە بێشکەی منالییەوە پێکەوە گەورە بووبوون تا گەیشتبوونە ئەم کاتە؛ بەتایبەتی لەم وەختەدا و لەم شوێنە دوور لە ئاوەدانی و نزیك لە هەموو سامێك، بەسێ کوڕەی بە لاوەگەلێ لە حەمەدێ برای لە پێشتر ئەزانی بۆ خۆی.

کوڕەش لەو وەختەدا هەستا تۆزێ داری کۆ کردەوە و ئاگرێکی کردەوە و دانیشت و ڕووی کردە بەسێ وتی: بەسێ! دەمێ ساڵە بڵێسەی ئاگری ئەو ڕوومەتت کە ئێستە لەم ئاگرە زیاتر ئەدرەوشێتەوە لە دڵما کڵپەی سەندووە و نەمتوانیوە دەری‌بەرم. ئێستە ئەو وەختەیە کە ئەو ئاگرە بە

ئاوی دروستبوونت لەگەڵما بکوژێنمەوە و ئەبێ دڵی خۆتم بدەیتێ!.

بەسێ کە گوێی لەم قسەیە بوو، وردە تەزووێك لە تەوقە سەریەوە دەستی پێکرد تا گەیشتە کەڵەموستی پێی. وەکوو لەو سەر شاخە بەرزە فڕێی‌دەنە خوارەوە هەپروون بە هەپروون ببێ، وای بەسەر هات و تف لە دەمیا وشك بوو؛ زمانی بەسترا.

کوڕە دیسان هاتەوە قسە و وتی: بەسێ! وەختی بێ قسەیی نییە؛ ئاگری دڵی من لە بێ‌قسەیی تۆ گەلێ بەهێزترە. ئینجا بەسێ هاتە زمان و وتی: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ ئەوە تۆی قسە ئەکەی یا من خەوێکی شپرزەیە ئەبینم و گوێم لە قسەیەکی ناخۆشەوە ئەبێ لە برایەکی خۆمەوە؟.

کوڕ وتی: بەسێ وەختم لە دەست دەر مەکە؛ دەمێ ساڵە بە شوێن ئەم وەختەدا ئەسووڕێمەوە. لە ئاسمان بۆی ئەگەڕام ئەوە ئێستە لێرە بە ئاسانی دەستم کەوت. بەسێ وتی: برام لە ڕۆژێکەوە کە منالی دەر و دەشت بووین تا ئەم وەختە من تۆم بە برای خۆم زانیوە، نەوەك من، هەموو کەس تۆیان بە برای من زانیوە. ئێستە عاجباتییەکەم، هەر لەوەیە کە چۆن لە ڕووت هەڵدێ ئەم جۆرە قسانە ئەکەی؟ وە چۆن ئەو ناز و بەخێو کردنەی ماڵی باوکی منت لە فیکر چووەوە، کە ئێستە دەستی خیانەت بۆ ماڵی باوکی من درێژ ئەکەی؟ وە چۆن ئەتوانی خیانەت لە ئەمانەت بکەی؟ منیان داوەتە دەست تۆ بە ئەمانەت، خوا ڕەوای هەقی نییە، هۆشێ بێنەوە بە بەر خۆتا و بزانە بەدەم خەوەوە قسە ئەکەی؟ وەیا بە ئاگای؟ ئەگەر بەدەم خەوەوە قسە ئەکەی با خەبەرت بێنمەوە، ئەو وەختە بزانە ئەبی بە تنۆکێ ئاو و ئەچی بە عەرزەکەدا یان نە؟

کوڕە وتی: بەسێ ئەم قسانە بە گوێچکەی منا ئاشنا نابن و لەسەر ئەم قسانە مەڕۆ؛ دڵی خۆتم ئەدەیتێ باشە، نامدەیتێ، ئەوا خەنجەر

بە بەرۆکەوەیە و ( نەوی لە خەنجەرەکەی و ڕایکێشا) بەم خەنجەرە ئارەزووی دڵی خۆمت لێ وەرئەگرم.

بەسێ کە زانی وایە، دەستی کرد بە گریان و کەوتە پاڕانەوە؛ وتی: برام! سوێندت ئەدەم بەو خوایە کە لەم شوێنە چۆڵەدا من و تۆی بە جووتە گیرساندۆتەوە و سوێندت ئەدەم بەو نان و نمەکەی کە لە بەینی من و تۆ و باوکی منا هەیە! واز بێنە لەم فیکرە و ناموسی ئەم خوشکەی خۆت مەشکێنە و خوا ڕەوای هەقی نییە لە کەری شەیتان وەرە خوارەوە.

هەتیو کە زانی بەم جۆرە شتانە ئیشی بۆ ناچێتە سەر هەر پەلاماری دا کۆرپەکەی لە باوەشی بەسێ فڕاند و وتی: بەسێ، دڵی خۆتم ئەدەیتێ باشە، ئەگینە ئێستە لە بەرچاوتەوە ئەم کۆرپەیەت پارچە پارچە ئەکەم.

بەسێ کە زانی هەتیوە چاوی سوور بووە و خەنجەری ڕووتی بە دەستەوە گرتووە و بەو جۆرە کۆرپەکەشی لە باوەش فڕاند، وتی: هەی نمەك بە حەرامی خوا نەناسی بێ دەرفەتی بێ دەرەتان! بەوە ئەمترسێنی؟ بەو خوایەی کە ئێستە وا لەم شوێنە چۆڵەدا گوێی لە کەساسی منە! نەوەك منداڵ بەڵکوو خۆم و منداڵم پارچە پارچە کەی، دەس بۆ ناموسی من درێژ ناکەی.

هەتیوە، کە ئەمەی زانی شاخی هاری و شێتیەتی بە تەواوی لە سەر سەریەوە دەرچوو، بەبێ هێڵ و گفت پەلاماری ئەو کۆرپە نازدارەی دا ـ کە ئەتوت بەرخی ساوایە و نوستووە ـ خەنجەری نایە سەر ملی. تا بەسێ وتی: هەتیو چی ئەکەی، سەری ئەو منداڵە بێ تاوانەی لە بەرچاوی ئەو دایکە جەرگ سووتاوەی ڕۆژڕەشەوە لە لەشەکەی جیا کردەوە و وتی: بەسێ ئاوات لێ ئەکەم. بۆچ هەروا وازت لێ دێنم؟ کەواتە دڵی خۆتم بدەرێ با لەمە خراپتریش نەبینیت.

بەسێ وتی: چیت لە دەست هات کردت و پەردەی جەرگمت بڕی؛ ئیتر چی ئەکەی؟ قسە، یەکە و نەبووە بە دوو؛ تۆ توخنی نامووسی من ناکەوی. هەر لەم کاتەدا هەتیوە بەخەنجەر بەر بووە لەشی منالەکە و دەست و قاچیشی لێك کردەوە و ئینجا بەو خەنجەرە ڕووتە خوێناوییەوە پەلاماری بەسێی دا و وتی: بەسێ ئەوە خەیالە تۆ کردووتە؛ یا ئەبێ ئەم خەنجەرەم لێ وەربگری یا ئەبێ دڵی خۆتم بدەیتێ؛ ڕزگاربوونت نییە. ئەمەی وت و خەنجەری لە سەر سنگی بەسێ توند کرد. بەسێ ئیتر هیچ چارێکی نەما تەنها ئەو هەناسە هەڵکرووزاوەی نەبێ کە ڕووبەڕووی ئاسمانی کردەوە بۆ ئەوە دەستێکی نهێنی لەسەر پاراستنی نامووسی، ئیشێکی بۆ بکا. ئەم هەناسەیە ڕووبەڕووی ئاسمان کردەوە و پەلاماری مەچەکی هەتیوەی دا؛ مەچەکی هات بە دەستیەوە. هێزێکی نهێنی کاری کردە بەسێ، شێرانە و مەردانە خەنجەری لە مستی هەتیوە هەڵپڕووکان و لەسەر سنگی هەتیوەی دانا. تا هەتیو وتی: چی ئەکەی بەسێ، خەنجەری لە لەشی هەتیوەدا دیوەدەر کرد و دەری هێنایەوە و دیسان ئاقەی سەر دڵی کرد و خوێن فیچقەی کرد و هەتیو خاو بووەوە و لەوێ لاشەی پیسی بێگیان کەوت.

بەسێ هەستا چووەوە ئەولا دەست و قاچە بڕاوی کۆرپەکەی کۆ کردەوە و لە بەردەمی خۆیا داینا. لە لایەکەوە ئەم دیمەنە، لە لایەکەوە دیمەنی کوژراوی هەتیوەکە، لە لایەکیشەوە دنیای بەسامی ئەو ئەشکەوت و شاخ و داخە بەسێیان لەم عالەمەوە خستبووە عالەمێکیتر و کەوتە دەریای خەیاڵی ئەم ڕۆژە تاریکەوە کە بەسەری هات. بەسێ لەناو شەپۆلی ئەم دەریایەدا با بەوجۆرە نقوم بووە، نقوم بێ.

بەڵێ، هەرچەندە گیارەشی بەهارە، بەلام ئەوەتە خۆت ئەیزانی ئەو

وڵاتی کوردەوارییە بەتایبەتی وڵاتی ئاڵان کوێستانە و بەهاری شوێنیان لەوێ زستانە.

دنیا شەو بوو؛ پاش خێڵ خەوتنان کوڕ و کاڵ لە دیواخانی «مەمەنداغا»دا لە ئاوایی «گرگاشێ» دانیشتبوون. لە هەر بازاڕێك قسەیەك ئەکرا و لە هەر داستانێك زمانێك ئەگیرا. گرگر باس هاتە سەر باسی ئازایی و نەترسی؛ هەریەکە لە عاستی خۆی، خۆی بە شتێك ئەزانی. کەس نەیئەوت من هیچ نیم. لەم بازاڕەدا ئەم قسەیە گەرم بوو. هەریەکە دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی و خۆی پێوە هەڵئەکێشا. بەڕاستی ئەو ڕۆژەش ڕۆژی دەست و تفەنگ و دڵ و جەرگ بوو؛ نە دنیا وەکوو ئێستە گۆڕاو بوو، نە ئازایی وەکوو ئێستە بەدناو بووبوو. ئێستە شێر بە گوێی بیگرە، ئەگەر دراوت نەبوو پێت ئەڵێن ئەوە شێت بووە.

مەمەنداغا لە سەرو دیواخانەکەوە دانیشتبوو وتی: «کوڕینە! ئەمەی پێ ناوێ؛ کێتان لە ئێوە ئەتوانێ ئێستە بچێتە ئەشکەوتی «سەراشان» و بێتەوە، ئەمەیە پیاوەتی و ئازایی. بزانم کێ لە دەستی دێت؟».

پەردەیەکی بێدەنگی کشا بەسەر دیواخانەکەدا و کەس ورتەی لێوە نەهات. خەڵکەکە ئەم سەیری ئەوی ئەکرد و ئەو سەیری ئەم؛ کەسیان نەیانتوانی دوو لێوەیان بیزوننەوە.

مەمەنداغا هاتەوە قسە وتی: کوڕینە! جارێکی کە نەکەونە قسە کردن و خۆهەڵکێشان. ئەوا من لەسەر ئەوە گرەو ئەکەم؛ بە گۆڕە بابم! هەرکە ئێمشەو بچێتە ئەشکەوتی سەراشان ئەم دەستەسڕە لەوێ دانێت و بێتەوە (دەستی برد دەستە سڕەکەی لە بەرۆکی دەرهێنا و دای نا)، «ئەستێل»ی کچمی لێ مارە ئەکەم و ئەیکەم بە کوڕی خۆم. دەسا بزانم کێتان ئەم ئازاییە ئەکەن و ئەم گرەوە ئەبەنەوە؟

دیسان کەس نەهاتە زمان و کەسێك نەبوو بە خۆیا ڕاپەڕموێ. مەمەنداغا وتی: جارێکی کە کەس قسە نەکا و منیش بۆم دەرکەوت کە پیاوێکم نییە لە وەختی تەنگانەدا پشتی پێ ببەستم. کە ئاغا لە قسەکانی بووەوە، حەمەدێ هەستایە سەر پێ و وتی: «خوڵامی سەری ئاغەم» و چوو دەستی ماچ کرد. ئاغە دەستی برد دەستەسڕەکەی دایە و وتی: لەم دیواخانە هەڵناستین تا دێیتەوە.

حەمەدێ دەستەسڕی هەڵگرت و هاتە دەرەوە. کە سەیری کرد دنیایەکی تاریکە و چاو، چاو نابینێ، نمەنمەش باران دێتە خوارەوە. هەرچەندە بەهارە، بەڵام زۆر ساردیشە. لەوانەیە جانەوەر و پەلەوەر هەریەکە لە کولانە و هێلانەی خۆیانا لە ترسی سەرما و لە ترسی سامی ئەو شەوە جووتیان نەوێرن قسە لەگەڵ جووتیان بکەن. بە دڵێکی قایمتر لە دڵی شێر چاکی لێ بەلادا کرد و بەڕێ کەوت ڕووەو ئەشکەوتی سەراشان؛ ئەو ئەشکەوتە کە تاپۆیەکی سامناکی و دەردەدارییە و ئەم نە ئاگای لەوە، نە ئاگای لە کارەساتی ناهەنجامی ئەو شەوە شوومەیە.

بەڕێ کەوت؛ وەکوو بای سەرسەر ڕێگە هەڵدێر و تووشکەی ئەبڕی. ئەم لەملاوە ڕێگەی ئەبڕی، مەمەنداغا و دانیشتووانی دیواخانیش بە پەنچە کرچە کرچی سووڕانەوەی چەرخی فەلەکیان ئەبڕی و چاوەڕێی هاتنەوەی حەمەدێیان ئەکرد.

حەمەدێ شیوەکانی بڕی و دایە پێی شاخ؛ بەرەبەرە لووتکەکانیشی ئەبڕی هەتا نزیکتر ئەبووەوە لە ئەشکەوتی سەراشان دڵی زیاتر دەستی ئەکرد بە تەپ و کوت و لێدان. جارجاریش بە خۆی ئەوت: «دەك حەمەدێ هەناوت بڕێ! ئەوە ئەترسی؟»».

دنیا کە زۆر تاریك بوو، چاوی تەنها تاریکی نەبێ هیچی تری

نەئەبینی؛ نە دەنگێك لە دەنگدارەوە ئەهات، نە خشەیەك لە جانەوەری بەهارەوە. پەردەیەکی کشوماتی و سامناکی لووتی بەسەر شاخ و چیاکانا داژەندبوو. ئەوا ئەیزانی ڕووەو ئەشکەوتی سەراشان ئەڕوا، بەڵام لەبەر تاریکی نەیئەزانی کامە کونەکەیەتی. کاری شارەزایی ڕاست بێ! کە دەستی حەمەدێی ئەگرت و ڕووبەڕووی کونەکە ڕایئەکێشا.

حەمەدێ تەنگی بە ئەشکەوت هەڵچنی و وای لێهات کە لەوانەبوو تارمایی کونەکە بەدی بکا و بچێ دەستەسڕی مرادی لێ دانێ و بگەڕێتەوە، کوتوپڕ لە ناکاو لەناو ئەو شەپۆلی دنیای سامناکەدا ترپەیەك لە بەردەمیەوە هات و شتێکی بۆ هاوێژرا و دای لە لەشی. حەمەدێ بەندی جگەری کەوتە خوارەوە و هەر لە شوێنەکەی خۆی وشك بوو؛ تاسێك بردیەوە. ئەژنۆی هێزی تیا نەما؛ نە ئەمەتە بۆ پێشەوە بڕوا، نە ئەمەتە بتوانێ بەرەو دوا بگەڕێتەوە؛ هەر ئەوەندەی پێ کرا لە شوێنەکەی خۆی دابنیشێ.

لەو کاتەدا کە دانیشت دەستی کەوت لەو شتە کە بۆی هاوێژرا. کە هەڵیگرت و بە دەست تاقی کردەوە سەیری کرد ئەمە قۆڵی عینسانە و هی مناڵیشە. بە تەواوی ئەوەندەی‌تر ورەی بەر دا و ئەوی هێز بێ تیا نەما؛ تەنانەت زمانیشی لە گەڕان وەستا. ئەوی لە هەموو لەشیا بەئاگا بوو تەنها دڵی بوو، ئەویش کەوتە شەپۆلی خەیاڵەوە کە ئەمە چی بوو؟ چە کارەساتێ بوو بەسەریا هات و کەوتە چە شوێنێکەوە کە هاوڕاز لێرەدا تەنها سام و ترسە؟ بەم خەیاڵەوە تلایەوە و پاش تۆزێك ڕووی کردە خۆی وتی: «دەك حەمەدێ عەمرت نەمێنێ! خۆ تۆ ئیدیعای کەڵەمێردیت ئەکرد، ئەوە بۆچ وات لێ هات؟ کوا ئازایی و بڕەبڕەکەت؟ بۆچ نەتئەزانی دنیا هەموو کاتێکی شێنەیی و دیواخانەکەی مەمەنداغا

نییە؟ دە بیخۆ ئەوە دەردت بێ، هەی کەڵەمێردی سەری بالیفان».

کە لەم ڕازونیازە بووەوە سەیری کرد وا هێزێکی هاتەوە بە بەرا و وردە وردە سام و ترس ڕەوی کرد و هەستایەوە سەر پێ. دەستی لەسەر خەنجەرەکەی دانا و بە دڵێکی گەلێ لە هەوەڵ قایمتر دەستی کردەوە بە ڕۆیشتن هەر بۆ بەردەمی ئەشکەوتی سەراشان. چەند هەنگاوێکی‌تر ڕۆیشت، سەیری کرد شتێکی‌تری بۆ هاوێژرا و درا لەسەر سنگی. کە دانەوییەوە هەڵیگرت، دنیاش تاریکە و تاقی کردەوە. تەماشا ئەکا ئەمە قاچی منداڵێکی بڕاوە. دیسان زۆر سەری سڕ ما و بە تەواویش وا دیارە لە کونەکە نزیك بووەتەوە. ترسی نەما؛ لە حەمەدێدا ترس باری کرد. قاچەکەشی هەڵگرت و ئینجا بانگی کرد:

«ئەی ئەو کەسەی لەو ئەشکەوتەیت! دێوی، درنجی، چیت؟ دەنگ بکە. سەرێکە و هێناومە نایبەمەوە، یا ئەمەتە وەکوو خاوەنی ئەم دەست و قاچەم لێ دێ یا ئەمەتە تۆ وات لێ دێ؛ کەواتە مەردانە وەرە مەیدانەوە».

کە حەمەدێ ئەمەی ئەوت، دەنگەکەی لە توێی ئەو تاریکی شەوەدا لە بەینی شاخەکانەوە دەنگی ئەدایەوە. کوتوپڕ دەنگێکی نازکی بەسۆز لەناو ئەشکەوتەکەوە هاتەگوێی وتی: «ئای کاکەگیان! نە دێوە و نە درنجە؛ بەسێی خوشکی چارەڕەشی هەناسەساردتە وا لێرە کەوتووە. ئەوە تۆ فریشتەی ئاسمان بووی یا حەمەدێ برای بەسێ بووی لەم وەختەدا گەیشتی؟» و دەنگەکە ئیتر نەما.

قسەیەکی کوردی هەیە ئەڵێ: «هەتەر مەتەر، ئەم لەو بەتەر».حەمەدێ چی؟ بەسێی خوشکت، چی؟ ئەمە چییە؟ ئەمە چە کارەساتێکە؟ ئەمە خەوە حەمەدێ ئەیبینێ وەیا جادووە گوێچکەی ئەزرنگێنێتەوە؟ ئەو

بۆچی هاتووە و چی بەرگوێی ئەکەوێ؟ لە ڕاستیدا کەوتەوە ناو دەریای خەیاڵ و بەڵام ترس لە دڵی حەمەدێدا نەماوە، هەر ئەوەندە نەبێ کە ئەمە چ وردە شەپۆلێکە بەسەر پەردەی گوێچکەیا ئەڕوا.

تۆزێکی زۆر کەم وەستا و خەنجەرە ڕووتەکەی گرت بە دەستێکەوە و دەست و قاچە بڕاوەکەشی کرد بە بەر پشتێنەکەیا و بە حەپەساوی و سەراسیمەیی خۆی کرد بە کونی ئەشکەوتەکەدا و چووە ژوورەوە. سەرەتا چاوی بە ژیلەمۆی ئاگرێك کەوت کە هەندێ سەرە بزووتی بە سەرەوە ماوە و وردە وردە ئەسووتێ. بە تەنیشت ئاگرەکەوە ئافرەتێك بەبێ هۆش لەسەر لا کەوتووە. لە تەنیشت ئافرەتەکەشەوە لەشی منداڵێکی پارچە پارچە کراو تێکلاوی خۆڵەکە بووە، لەوبەری ئاگرەکەشەوە زەلامێك دوو خەنجەر لەسەر دڵی دراوە، کوژراوە و هێشتا خوێنی هەر لێ دێ و هەندێ لە دەماری لەشی ئەبزوێتەوە، وا دیارە ئاخر و ئۆخری گیان دەرچوونیەتی. ئەم دیمەنە ناهەموارە لەم شوێنە دوور لە ئاوەدانییەدا بە تەواوی حەمەدێی خستە عالەمێکی ترەوە؛ ئەمە چییە؟ ئەمە چە کارەساتێکە؟ وردە وردە چوو بەلای ئافرەتەکەوە بەهۆی ڕووناکی ئاگرەکەوە، کە جوان سەیری کرد تەماشا ئەکا ڕاستە ئەمە بەسێی خوشکیەتی و بەبێ هۆش کەوتووە.

چوو سەری بەرز کردەوە و لەسەر ڕانی خۆی داینا و دەستی هێنا بە ڕوومەتیا و قژە بزرکاو و خۆڵاوییەکەی لادا و بانگی کرد: بەسێ. بەسێ هیچ دەنگی نییە. هەندێکیتر شان و ملی شێلا و بانگی کرد بەسێ!

بەسێ چاوی بەرز کردەوە و یەکەم چاو، چاوی بە حەمەدێی برای کەوت دوو تنۆك فرمێسك لە چاوی هات و وتی: «کاکەگیان! ئەوە تۆیت وا سەری بەسێی خوشکی چارەڕەشت خستۆتە سەر ڕانت؟» ئەمەی وت و بێهۆش کەوتەوە.

حەمەدێ لەبەر خوشکی نایپەرژێ سەیری شتیتر بکا و بزانێ چییە؟ دیسان کەوتەوە تەقەلادان بۆ بەهۆش هێنانەوەی بەسێ. بە هەرجۆر بوو هێنایەوە هۆش خۆی و وتی بەسێ! تێم بگەیەنە چییە و چییە ئەم کارەساتە؟ شێت بووم، چی ئەکەی لەم شوێنە بەم وەختەدا و چییە ئەم تەرمانە و ئەم ڕۆژە چییە بەرچاوم ئەکەوێ؟ بەسێ تێم بگەیەنە بەسێ!

بەسێ، سەری بەرز کردەوە وتی: کاکە سەیری تەرمی ئەو زەلامە بکە بزانە ئەیناسی؟ حەمەدێ چوو لووتی شۆڕ کردەوە بەسەر تەرمەکەدا و بە تەواوی واقی وڕما و سەری پەنجەی شایەتیمان کردبوو بە دەمی خۆیا و بە سەرسامییەوە هەر زیاتر سەیری ئەکرد؟ پاشان وتی: بەسێ ئەمە کوڕی سەپانەکەی خۆمانە کە بە منالی پێکەوە گەورە بووبووین. ئای پشتی شکاوم ئەمە بۆ کوژراوە؟ بەسێ! من و تۆ برایەکمان لە دەست دەرچوو. ئەمەی وت و هەردوو چاوی پڕ بوو لە ئاو.

بەسێ وتی: کاکە مەگری؛ ئینجا وەرە تا بۆت بگێڕمەوە. دەستی پێ کرد لەو وەختەوە کە لە ئاوایی سپیارە دەرچوو بوون تا ئەم وەختە هەمووی بۆ گێڕایەوە و دەستی برد لەشی کوڕپە سەربڕاوە خوڵاوییەکەی هێنا و نووسانی بە سنگیەوە و دایە پڕمەی گریان.

حەمەدێ کە لە کارەسات و لە نمەك بە حەرامی هەتیوە تێگەیشت، هەر ئەوەی بۆ مایەوە بە تیلی چاوێکی پڕ لە خەشمەوە سەیرێکی تەرمی هەتیوەی کرد و دەستی دایە خەنجەرەکەی بەڵام پاشان کردیەوە بە کێلانەکەیا؛ چونکە هەتیوە کوژرا بوو تازە خەنجەری چی لێ بدا؟ ئینجا وتی: بەسێ لەمانە تێگەیشتم، تەنها ئەوە ماوە تێمبگەیەنی کە من نزیکی ئەشکەوتەکە بوومەوە ئەم دەست و قاچی مناڵە بڕاوە چی بوو بۆم ئەهات؟ بەسێ وتی: کاکە دنیا کە وەکوو ئەیزانی زۆر تاریك بوو،

منیش چاوەڕێی دەرووبەکی ڕەحمەت بووم کە لەم گێژاوی مەینەتە ڕزگارم ببێ. کوتوپڕ لە دوورەوە تارماییەکم بەرچاو کەوت کە ڕووبەڕووی ئەشکەوتەکە هات. هەر ئەوەندە بوو تارمایی بوو، ئەبزووتەوە؛ ئیتر نەمئەزانی چییە. وتم: بێ و نەبێ بەم نیوەی شەوەدا و لەم شوێنە چۆڵەدا ئەمە دڕندەیە بۆنی خوێنی کردووە و بە بۆنەکەوە دێت. منیش هیچم پێ نەما ئەوە نەبێ کە وتم با دەستێکی منداڵەکەی بۆ فڕێ دەم تا ئەوە ئەخوا و بەوەوە خەریک ئەبێ بەڵکوو خودا دەرووێك بکاتەوە. ئەوەبوو تارماییەکە پاش بەینێك دیسان دەستی کردەوە بە هاتن ئەمجا قاچێکی منداڵەکەم بۆ فڕێ دا بەڵام بە تەواوی دانی ژیانم کەند و ئیتر هیچ هیوایەکم نەما. پاش ئەوە، ئەوەبوو تۆ هاتیتە دەنگ، دەنگەکەتم ناسی و وەکوو فریشتەی ڕەحمەت گەیشتی بەسەرما. حەمەدێش وردە وردە بە ئەوپەڕی سەرسامییەوە گوێی بۆ ئەم قسانە ڕاگرتبوو. لە لایەکەوە لە چەرخی ڕۆژگار و لە لایەکەوە لە ئازایی ئەم خوشکە و قارەمانییەکەی هەروا تف لە دەمیا وشك بووبوو.

پاش ئەمانە ناوچەوانی خوشکی خۆی ماچ کرد و فرمێسکەکانی سڕییەوە و وتی: خوشکم با بڕۆین. وردە پارچەی تەرمی منداڵەکەیان کۆ کردەوە خستیانە چارۆکەیەکەوە. حەمەدێ دای بە شانیا و دەستەسڕەکەی لەوێ دانا و گەڕانەوە ڕووە و ئاوایی گرگاشێ.

حەمەدێ بەسێی خوشکی بردەوە بۆ ماڵەوە و خۆی چوو بۆ دیواخانی میر مەمەنداغا، تەماشای کرد دیواخان هێشتا تێك نەچووە و خەڵکەکە لە گەرمی قسە دان. یەکێ ئەڵێ: حەمەدێ سەری تیا چوو؛ یەکێ ئەڵێ: ئەشکەوتی سەراشان لە باوباپیرمان بیستووە خێوی هەیە، حەمەدێ دەستی خێو کاری تێکرد و تازە ئێمە چاومان بە حەمەدێی زیندوو

ناکەوێتەوە. ئەوا لە کەیەوە ها ڕۆیشتووە بۆچ دیار نەبوو ئەوا بەیانە! هەریەکە قسەیەك ئەکەن و مەمەنداغاش پەژارە دایگرتووە کە بوو بەهۆی تیاچوونی حەمەدێ. لەم کاتەدا حەمەدێ کردی بە ژوورا و وتی: «خولامی سەری ئاغەم» و چوو دەستی مەمەنداغای ماچ کرد.

خەڵکەکە چاویان بە حەمەدێ کەوتەوە بە جارێ گەشانەوە؛ بەڵام حەمەدێ ڕەنگ لە ڕوویا نەماوە. ئاغا لێی پرسی: حەمەدێ چ باسە؟ قسە بکە. حەمەدێ ئەوی چاوی پێ کەوت و بەسەر خۆی و خوشکی هاتبوو هەمووی گێڕایەوە. میر و ئەهلی دیواخان لەم کارەساتە ترسێنەرە و لەم ڕێکەوتە سەیرە هەموو بە جارێ کەوتنە دەریای سەرسامییەوە. بەیانی میر خۆی و چەند سوارێك چوونە ئەشکەوتەکە سەیریان کرد تەرمی هەتیوەکە لەوێ کەوتووە و دەستەسڕەکەش لەولاوە دانراوە. هاتنەوە پێش هەموو شتێك میر کچەکەی خۆی مارە کرد لە حەمەدێ و ئینجا بەسێی هێنا بە چاوێکی باوکانەوە سەری بەسێی ماچ کرد و تەرمی مناڵەکەیان ناشت و گەلێ دڵنەوایی بەسێی کرد و وتی: «کچم! مناڵ ئەبێتەوە؛ بەڵام ئەم قارەمانییە بە تایبەتی تۆ و سەری هەموو ئافرەتێکی بەرز کردەوە و لایەقی بە قارەمانی ئافرەتان!»

**١٧٩.** «محمد عبدالواحد» بۆی گێڕامەوە وتی: لە گوندی «لهێبان» لەو دەشتی دزەییە دنیا شەو بوو؛ خێوەتێکمان هەڵدابوو دانیشتبووین. پاش نوێژی خەوتنان بوو؛ پیاوێك هەبوو «سمایلەگۆج»یان پێ ئەوت، لە لامان دانیشتبوو. قسەی خۆش بوو، سەرگوزشتەی کۆنی بۆ ئەگێڕاینەوە.

بە دەم قسەوە کەوتینە وەختی خێڵ خەوتنان؛ کوتوپڕ کوڕێکی مێردمناڵ

هاتە ژوورەوە و دانیشت و سمایل پێی وت: هەتیم ئەوە لە کوێ بووی تا ئێستە؟ کوڕەش هیچ سێ و دووی نەکرد وتی: «وەڵڵا سمایل هەنووکە لای ژنێك بووم کە لەگەڵ مێردەکەی خۆیا ڕاکشابوو. منیش چوومە پاڵی».

محەمەد وتی: هەر ئەوەندم زانی سمایل دەستێکی هەڵهێنایەوە و شەپەزللەیەکی دا بە ناوچەوانی کوڕەدا. شەپەزللەیەکی وا کە ئاگر لە چاوی برووسکەی سەند. وتی: «هەتیم! ئەمە قسەیە تۆ دەیکەی؟»

محەمەد وتی: منیش وتم: خاڵە سمایل بۆچ لێی ئەدەی؟ مناڵ کەی قسەی بایەخی هەیە؟ سمایلیش وتی: ئەفەندی! دەسا من قسەیەکت لۆ دەگێڕمەوە ئەو وەختە دەزانی کە لە ژنا چ پاڵەوانێك هەیە؟ ئینجا دەستی کرد بە گێڕانەوە و وتی:

«ئەفەندی! ئا ئەم سمایلەگۆجە ـ کە لە بەردەمتا کەوتووە و پیر و کەنفت بووە ـ لە وەختی خۆیا کە ناوی سمایلەگۆجیان بهێنایە مناڵ لە بێشکەدا ژێر ئەبووەوە. دزێك بووم، مناڵم لە بەر مەمکی دایکی ئەدزی و خۆی بە خۆی نەئەزانی. لە هەموو ئەم وڵاتانەدا هەر ناو ناوی سمایلەگۆج بوو.

ساڵێك لەم دەشتی دزەییەدا نەهاتی و قاتوقڕی بوو. کاول بێ دەشتی دزەیی، ساڵێ کە بارانی نەبوو ئیتر خەڵکەکە هەموو ئەبێ بکەونە دەرۆزە کردن. سێ ساڵ کە باران نەبوو؛ جا ئەفەندی بزانە ئەبێ بە چی؟ ئەو ساڵە بەهارێکی زۆر زوو بوو. هەرچەندە هەر لە زستانەوە باران چاکی هێنابوو، بەڵام لەبەر زوویی هیچ پێ نەگەیشتبوو. دەرامەتی منیش هەر دزی بوو. دزییەکەش دەست نەئەکەوت؛ زۆر شڕ بووبووم. ناچار زەلامێکم هەڵگرت و لێم دا ڕۆیشتم. ڕێگەی ئەو کوێستانەمان گرتە بەر؛ لە تفەنگ و فیشەکیشا زۆر بە تەدارەك بووم. چەند ڕۆژێك هەر

ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەو کوێستانەی سەرەوە. پێی ناوێ، ڕەوەیەکی سی، چل سەری لە وڵاغی بەرزەمان هێنا و بە لاڕێگەدا گەڕاینەوە دواوە ڕووە و ماڵ. بە شەو ئەهاتین و بە ڕۆژ لە شیو و کەندەڵانی دوور لە ئاوەدانی ستارمان ئەگرت. شەو بوو هیچمان نەخواردبوو، بە تەواوی پەکمان کەوت.

شەوێك وا بە لارەلار لە پێش وڵاغەکانەوە بووم، ئەهاتین. لە دووررەوە و لە لاپاڵی کێوەکە تارمایی ڕەشماڵێکم بەدی کرد. بە هەتیوەکەی هاوڕێم وت: تۆ بەر وڵاغەکان بگرە من وا ئەچم بۆ ئەو ڕەشماڵە بەڵکوو نانێ، شتێکم دەست کەوێ بیهێنم. ئەمەم بەو وت و تفەنگەکەشم فیشەکی تێدا بوو، لە ملم کردەوە و گرتمە دەستمەوە و بەبێ هەست لێم دا ڕۆیشتم.

دنیا زۆر تاریکە؛ بەرچاوی خۆم نابینم. وەختی وەها بوو تەپوکوت ئەکەوتمە کەندەڵانەوە و هەڵئەستامەوە. چووم هەتا نزیکی ڕەشماڵەکە بوومەوە. وەستام گوێکم هەڵخست سەیر ئەکەم نە دەنگێ، نە خشەیێ، هیچ نییە؛ دنیا کش و ماتە. زۆر بەبێ چرپە خۆمم گەیاندە ڕەشماڵەکە. تماشام کرد دەوارێکی زۆر گەورەیە. هەناسە لەم دەوارەوە نایە، سەگ نییە، پشیلە نییە، چەند ڕەشەوڵاخێك لە دەری دەوارەکەیە و هیچیتر. زۆر بە وەستایانەوە بەبێ هەست جارێك بە دەورەی دەوارەکەدا سووڕامەوە. بە دەست دەستم ئەخشان لە دەوارەکە هەناسەی گیانلەبەرم شك نەبرد لە ناویا. جارێکیکەش گەڕام بە دەوریا و دەرگاکەیم دۆزیەوە. بۆ جاری سێهەم بەبێ خشە لە دەرگاکەوە چوومە ژوورەوە.

ئۆهـ ئەفەندی! هەر ئەوەندەم ئاگا لێ بوو پێم خستە ژوورەوە، ئیتر بە تەوقەسەرا کەوتم و تاوێرێك لەسەر سەرم سوار بوون؛ یەکێك بوو. تەنها ئەوەم بە خۆمەوە دی زرنگەیەك لە سەرمەوە هات و هەردوو پەلم

لە دواوە وەکوو بە دوو گوریس بەسترابێتەوە وا بوو. نە زانیم تفەنگ چی لێ هات، نە زانیم خەنجەر چی بەسەر هات. دەنگێکم هاتە بەرگوێ وتی: «هەی ناپیاو! ئەوە بە تەمای چیت؟».

ئاگردانێك لەناو دەوارەکەدا بوو، ئاگرێکی کزی تیابوو. من لە دەرەوە هەستم پێ‌نەکرد، دوو سێ سەرە بزووتی بە سەرەوە بوو. دەستێك بۆی کێشرا سەرە بزووتەکانی خۆش کرد و ئاگرەکە کڵپەی سەند.

تەماشام کرد ئەمە ئافرەتێکە وا بە سەرمەوە بەو جۆرە پەلوپۆی بڕیوم. بەڵام ئافرەتی چی؟ هەتا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت، بە دیمەن، هەر باسکێکی ئەڵێی توکمەی داڕژراوە، ڕوومەتێکی پان، چاو و برۆیەکی گەش، جووتێ گۆنای خڕی سوور، جلێکی ئاڵوواڵای جوانی لە بەرابوو. ئەفەندی بڕوام پێ بکە تا ئەو ڕۆژە وە لەو ڕۆژەشەوە تا ئیمڕۆژ ئافرەتی وا جوان و نازدارم نەدیوە. تەمەنی لە دەوری حەڤدە و هەژدەدا ئەبوو. تفەنگێکی کورتی خستبوە ژێر باڵی؛ پەنجەی بەسەر پێکەیەوە بوون، ڕیزێکیش فیشەك لە پشتیا بوو. بەم جۆرە لەسەر سنگم دانیشت و دیسان وتی: «هەی ناپیاو ئەوە بە تەمای چیت؟» منیش وتم: «خوشکم! خوا ئەیزانێ بە تەمای هیچ نیم و ڕێبوارم و ڕێم لێ تێکچووە و ئەم ڕەشماڵەم بەدی کرد و هاتوومەتە ئێرە».

وتی: «تۆ ڕێبواری یا پیاوخراپی؟ بۆچی من ئاگام لێ نییە کە تۆ چۆن هاتیت چۆن بە دەورەی دەوارەکەدا سێ جار سووڕایتەوە و پاشان بەبێ چرپە هاتیتە ژوورەوە؟ ئەمە هی پیاوی ڕێبوارە یا هی پیاوی خراپ؟».

لەم بەینەدا سەیرم کرد تفەنگ و خەنجەرەکەم وا لەولاوە کەوتوە، منیش هیچم پێ ناکرێ، تەنها پاڕانەوە و ئەوە نەبێ کە ڕێبوارم و لە برسا هاتووم. بە هەرجۆر بوو ژنەکە لەسەر سنگم هەستا و لەولاوە تفەنگ

و خەنجەرەکەی منی هەڵگرت و بردی لە سەرووی دەوارەکەوە داینا و هەر ئەشی وت: «ڕاستە تۆ ڕێبواری؛ هەی عافەرەم پیاوی ڕێبوار!» ئینجا ڕووی تێ کردم وتی: لەو شوێنە کە لێی دانیشتووی دانیشە؛ هەر بزویتەوە ئەتکوژم. کە ئەو ئەمەی وت، خۆ من هیچم پێ نەماوە تەنها «بەڵێ» نەبێ.

ئەمجارە هێنای تفەنگەکەی خۆی لە ژێر بنەنگڵی دەرهێنا و گرتی بە دەستێکیەوە. هەستا چوو لەولاوە قاوەیەکی هێنا خستیە سەر ئاگرەکە و ڕۆنیشی هێنا خستیە ناوی. چوو لەسەر هۆڕێك پێنج شەش هێلکەی هێنا شکاندیە ناو ڕۆنەکەوە و دروستی کرد. چوو هەر بە دەستە خاڵیەکەی دەستە بەرەیێ نانی هێنا لە بەردەمما داینا و تاوە هێلکەوڕۆنەکەی هێنایە لامەوە. چوو کاسەیە دۆیشی هێنا و وتی: دە بخۆ. خۆیشی لەولاوە لای ئاگرەکەوە دانیشت بە عاستەم لوولەی تفەنگەکەی تێ کردم، دەستیشی هەر لە پەلەپیتکەیەتی. من بە جارێ شپرزەی ئەوە بووبووم کە نەوەك دەستی بترازێ و بمکوژێ؛ لەمە زۆر ئەترسام، ژنە هەستی بەمە کردبوو، پێی وتم: مەترسە نانی خۆت بە ڕەحەت بخۆ.

زۆرم برسی بوو، دەستم کرد بە خواردن تا تەواو تێرم خوارد؛ لەم ماوەیەشدا هەرچەندە سەیر ئەکەم، لەم ژنە زیاتر کەسێکیتر لەم دەوروبەرەدا نییە؛ نە ژن نە پیاو، نە مناڵێك هەر هیچ.

نانەکەم خوارد و بە تەواوی تێرم خوارد. هات تاوەکەی هەڵگرت و بردی خستیەوە سەر ئاگرەکە. دیسان چوو ڕۆنێکی زۆری هێنا خستیەوە ناوی؛ ئەنجا چوو بە قیاسی پانزە شانزە هێلکەیتری هێنا و شکاندیە ناوی. چوو دەستەبەرەیەکی زل نانی هێنا، تاوەکەی قلپەوە کردەوە ناو نانەکان و پێچایەوە و هێنایە بەر دەستم وتی: «دە هەستە بڕۆ؛ ئەمەش بەرە بۆ

هاوڕێکانت». وتم: هاوڕێی چی؟ من هەر خۆمم. وتی: «هەستە، هەستە، پیاوی بێ هاوڕێ بەم شەوەدا و لەم وەختەدا ڕێی ناکەوێتە ئەم شوێنە. هەستە درێژەی مەدەرێ تۆ ڕێبوار نیت؛ پیاوخراپیت و هاوڕێشت هەیە. هەستە بڕۆ خوات لەگەڵ». وتم: ئەی تفەنگ و خەنجەرەکەم؟ سەیرێکی کردم و وتی تفەنگ و خەنجەرەکەشت ئەوەیتەوە پیاوە ڕێبوارەکە؟! چوو لەولاوە تفەنگەکەمی هەڵگرت و فیشەکەکەی لێ دەرهێنا و بۆی هێنام؛ لە بەردەستی دانام وتی: بیکەرە ملت.

تفەنگەکەم کردە ملم و چوو خەنجەرەکەشی هەڵگرت لە دوورەوە بۆی فڕێ دام وتی: ئەوەش خەنجەرەکەت، دە هەستە خوات لەگەڵ! ئەمجا خۆیشی بە تەواوی لوولەی تفەنگەکەی خۆی تێ کردم و وتی: «خەیاڵ نەکەی! هەر دەست بیزوێنیتەوە تەنها تاقە فیشەکێکت بۆ ئەنێرم».

منیش بە هێواشی خەنجەرەکەم هەڵگرت و کردم بە بەر پشتێنەکەما و نۆردووە نانەکەم هەڵگرت و هەڵسام. ڕووم تێ کرد و وتم: «شێرەژن! بەو خوایەی بان سەرە سوێندت ئەدەم تۆ چیت لێرە و چە کەسیت و من هەرچەندە لەم بەینەدا سەیرم کرد لە تۆ بەولاوە کەسیترم لەم چۆڵ و بیابانەدا نەدی. ئەوا من ئەڕۆم، بەڵام تێمبگەیەنە؟»

وتی: هەستە بڕۆ؛ ئەوە ئیتر ئیشی تۆ نییە. وتم: دەسا شەرت بێ یا ئەمەتە ئەمکوژی یا ئەمەتە پێم ئەڵێی. زەردەخەنەیەك گرتی و وتی: «زۆر حەز ئەکەی بیزانی؟ من ژنی کوڕێکی ئامۆزای خۆمم. مانگێك ئەبێ مێردم پێ کردووە. لەو وەختەوە مێردم پێ کردووە، بە تاقە ماڵە هاتوین لێرە دانیشتووین. تەنها هەردووکمان بووین؛ سێ چوار ڕۆژ لەمەوپێشتر ماینێکمان لە گوند دز بردوویەتی، ئەو هەستا چوو بە شوێن ماینەکەدا و من تەنها خۆم لێرەدا بە دیار ئەم مەڕومالاتەوە ماومەتەوە؛ ئەمەیە

سەمەرەی من».

منیش وتم: ژنەکە! من هەرشتێك هەم، هەم؛ بەڵام ئەوە بزانە بەلای خۆمەوە پیاوێکی ئازا و ناودار بووم. ئەوی تۆ بە منت کرد، وە ئەوی من لە تۆوە دیم تا ئێستە نە کەس پێی کردووم، وە نە لە کەسم دیوە. هەستام و ئیتر بەڕێ کەوتم. ئەویش دوور و نزیك لوولەی تفەنگەکەی ڕاست تێ‌کردبووم، هەتا لە چاو ون بووم. ئەوەندەم ئەزانی هەر دەستم ببردایە بۆ تفەنگەکەم بەبێ هێڵ و گفت ئەیکوشتم.

جا ئەفەندی، هەنووکە ئەم هەتیمە دەرێ: من شتی وام کردیە؛ چما هەموو ژنێك وەکوو یەك وایە؟! ژنی واش هەیە و ژنی واش هەیە، ئەوی من لەو حورمەیە چاوم پێ کەت، هەنووکەش هەر موچرکە بە لەشما دێتە خوارێ.

١٨٠. پیاوێـك هەبوو تا بڵێـی ژیـر و بـە ڕا و تەگبیـر بوو. سـەرەتای ژیانـی بـە هـەژاری و بێ‌نەوایـی تێ‌پەڕاندبوو. ژیرییەکـەی خۆی گەیاندی بە پایەیەکی بەرز. لەلای پادشای ئەو شارە بوو بە وەزیری دەستە ڕاستی و بوو بە یەکە پیاوی ئەو وڵاتە.

ئەوەنـدە هەیـە پیـاو لـە هەموو لایەکەوە بـۆی نایە؛ ئەم پیـاوە وای بۆ هاتبـووە پێشـەوە هـەر ژنێکی ئەهێنـا زۆری پێ نەئەچـوو ژنەکەی ئەبوو بە دۆستی پادشاکە، وەیا بە کوردیتر بڵێین پادشا پێی فیر ئەبوو. چارناچار ئەمیش لەبەر ئەوە ئەمەی پێ هەڵنەئەگیرا ئەوەی تەڵاق ئەدا و ئەچوو یەکێکی کـەی ئەهێنـا. بـەڵام لەبـەر ئـەوە بەخت چەواشـە بـوو، وەیا ژن بێ‌چارشێو بوو ئەویـش هەر وای لێ ئەهات.

کابـرا ئیتـر هاتـە سـەر ئـەوە وتـی: یا ئەمەتـە ژن ناهێنـم، یان ئەمەتـە

ئەبێ بچم بسووڕێمەوە ژنێك پەیدا کەم کە بان دەستی نەبێ لە ژێری و دانایـیدا؛ ئەمـەش بۆ ئـەوە بزانـم ئـایا هەمـوو ژنێـك هەمـوو نزمـی و بەرزییەکی زەمان هەڵئەخەڵەتێنی و گاڵتەی پێ ئەکا، یاخود ژن هەیە و ژنیش هەیە.

لێی دا ڕۆیشـت، گەلێ سووڕایەوە نەگەیشـت بە مراز. ڕۆژێك ملی ڕێـی گرتبـوو، دەستی لـە قۆڵی گێژاوی فیکـر کردبوو، هەنـگاو بە هەنگاو ڕێگەکـەی ئەبـڕێ. کوتوپـڕ تووشـی پیاوێکـی پیری کەنفتی بەساڵاچوو بوو، کـە ئەویـش وردە وردە خەریکـە ئـەو ڕێگەیە ئەبڕێ. وتـی: بەخوا باشـە ئەمـە بۆ هاودەنگیم پەیدا بوو، با لەگەڵی ببم بە هاوڕێ و پێکەوە لەگـەڵ ئـەو ڕێگەکـە ببڕێـن. چـوو سڵاو و ماندوونەبوونـی لـێ کـرد و لەگەڵی ڕێکەوت بۆ پێکەوە بە ڕێگەدا ڕۆیـشتن.

زۆر نەڕۆیشـتن بـە کابـرای وت: «خاڵە، ئەوا ئێمـە بە ڕێـگە ئەڕۆیـن با پـێ‌پلیکانەیـەك دروسـت بکەیـن». کابـرای پیرە لەم قسـەیە تووڕە بوو. ئەمیـش وتـی: خاڵـە بـۆ تـووڕە ئەبی؟ خـۆ شـتێکی خراپم نەوتـووە. وتی: ماڵ‌کاول، شـتی خـراپ چیـت نەوتووە! تۆ شـێت بـووی یا گاڵتە بە من ئەکـەی؟ پـێ پلیکانـەی چی؟ بۆچ دارتاشـم، وەسـتام، چیم؟ ئـەوا ئەگـەر دارتاش بووم لەم دەشتەدا من تەشوێ و هەڕە و دار و تەختەم لە کوێ بوو تا بێنم پێ‌پلیکانە لەگەڵ تۆ دروست بکەم.

ئەمیش ئیتر هیچ دەنگی نەکرد و لێیان دا ڕۆیشتن. لە پاش هەندێك، تووشی ڕووبارێك بوون. کابرا دیسان ڕووی کردەوە خاڵە پیرە وتی: «خاڵە با لەم سەر ڕووبارە پردێك دروست کەین». خاڵە ئەوەندەیتر شێت بوو؛ وتی: کابرا بەو سەی‌ساقە بێ و نەبێ تۆ شێت بووی، وەیا هەر ئەتەوێ تیتاڵـی بـە من بکـەی! چە ڕایەت ئەکەوێ بۆچ مـن گاڵتەچی تۆم؟ کابرا

وتی: خاڵە بۆچ تووڕە ئەبی؟ خۆ خراپم نەوتووە. وتی: مردووت مرێ چۆن خراپت نەوتووە؟ بۆچ من بەننام پردم پێ دروست ئەکەی؟ ئەوا بەنناش بووم، لەم دەشتەدا من بەرد و قسڵ و کەرەستەم لە کوێ بوو بێنم پرد بۆ تۆ دروست کەم؟ کابرا ئیتر هیچ دەنگی نەکرد.

هەندێکیتر ڕۆیشتن و گەیشتنە قەراخ ئاوایی؛ تووشی پەڵە گەنمێکی نایاب بوون. کابرا پیرە ڕووی کردە ئەمیتر وتی: ئەم پەڵە گەنمە هی منە. چاوت لێیە ماشەڵڵا چۆن هێناویە و چۆن گەڵی پڕ دانی هەیە؟ ئەمیش وتی: «بەڵێ، پەڵە گەنمێکی بە قەف و پڕ دانە ئەگەر بە سەوزی نەخورابێ». کابرا ئەمجارە ئیتر وەکوو فیشەکە شێتە چوو بە عاسمانا و هار بوو، وتی: کابرا بریا ملم بشکایە و لەگەڵ تۆ نەبوومایە بە هاوڕێ! خۆ تۆ لەم ڕێگەدا بە قسەی قۆڕ و بێ سەروبەر منت تووشی دیق و زیق کرد. وتی: خاڵە بۆچ تووڕە ئەبی؟ خۆ خراپم نەوتووە؟ وتی: جانەوەر چۆن خراپت نەوتووە، ئەی خراپ چۆنە؟ توخوا گەنم لەبەر چاوتە قەفی کردووە، دانی گرتووە، وشك بووە و زەرد هەڵگەڕاوە، چاوەڕێ دروێنەیە؛ کەچی تۆ ئەڵێی ئەگەر بە سەوزی نەخورابێ. ئاخر نازانی ئەگەر بخورایە چۆن خۆی ئەما؟ کابرا ئیتر هیچ دەنگی نەکرد؛ چوونە ئاواییەکەوە. خاڵە پیرە چووەوە بۆ ماڵی خۆی و ئەمیش چوو بۆ مزگەوت.

خاڵە پیرە زۆر ماندوو بوو. کە چووەوە ماڵەوە کچێکی تاقانەی هەبوو؛ کچەکەی هات بە پیریەوە بردی داینا. کچە سەیری کرد باوکی زیاد لە جاران ماندووترە پرسی: بابە ئیمڕۆ بۆچ وا ئەتبینم کە لە جاران زیاتر ماندووتری؟ وتی: کچم چووزانم. ئیمڕۆ کابرایەکی گێل و گەوجم تووش بوو؛ بووین بە هاوڕێ. بە قسەی هیچوپووچ من چەندە ماندوو بووم ئەوەندەیتر بەو قسانە بێ سحەتی کردم. ئەگەر بڕوا ئەکەی مێشکم

لای خۆم نەماوە.

وتی: بابە قسەی چی لەگەڵ ئەکردی؟ وتی: چووزانم بۆم ناگێڕییتەوە. لە پاش ئەوە کە هەندێك بە ڕێگەکەدا هاتین، پێم ئەڵێ: با پەیژە و پێپلیکانە دروست کەین. تۆزێکیتر هاتین گەیشتینە سەر ڕووبارێك؛ کەچی پێم ئەڵێ: با پردێك دروست کەین. تۆزێکیتر هاتین، گەیشتینە قەراخ ئاوایی تووشی گەنمەکەی خۆمان بووین؛ وەختی دروێنەی هاتبوو. من ئەڵێم: گەنمی چاکە، کەچی ئەو ئەڵێ: ئەگەر بە سەوزی نەخورابێ. ئەو گەنم لە بەرچاویەوە زەرد بووە؛ کەچی ئەو وا ئەڵێ، وە یا لەوانیتر لای وایە من دارتاش و بەننام قسەی وام لەگەڵ ئەکا. دەی ئیتر چۆن مێشکم لە سەرا ئەمێنێ؟

کچە وتی: جا باوە خۆ ئەو قسانە هەموو قسەی ژیر و دانایانە و تۆ ئەبوایە پێت خۆش بوایە؛ کەچی ئێستە ئەڵێی مێشکی بردووم. خاڵە پیرە وتی: چۆن کچم؟ نابێ ئەقڵی تۆیش بووبێ بە ئەقڵی ئەوەوە؟! کچە وتی: باوە کە پێی وتووی: وەرە با پێپلیکانە دروست بکەین، مەبەستی ئەوە بووە وەرە با پێکەوە قسە بکەین و بە قسە ڕێگەکە ببڕین. کە لەسەر ڕووبارەکە پێی وتبووی: وەرە با پرد دروست کەین، مەبەستی ئەوە بووە وەرە با پێکەوە قۆڵ بکەین بە قۆڵی یەکا لە ئاوەکە بدەین؛ چونکە ئەگەر دوو کەس بووین، بەهێزتر ئەبین، ئاوەکە نامانبا. کە لە ڕۆخی گەنمەکەی خۆمان پێی وتبووی: ئەگەر بە سەوزی نەخورابێ، مەبەستی ئەوە بووە کە ئەگەر بە سەلەمت نەدابێ و هەر زوو سەرت تیا نەبردبێ. باوە ئەبوا تۆ بە هاوڕێیەتی پیاوی وا بارەشارت بهاتایەتەوە، نەوەك بەو جۆرە خۆتی لێ زیز کەی. ئێستە ئەو کابرایە چی لێ هات و بۆ کوێ چوو؟

خاڵەپیرە ـکە گوێی لە قسەی کچەکەی بوو ـ چووە دڵیەوە کە ئەو

پیاوە پیاوێکی دانا بووە و ئەم لە خۆڕایی دڵی ڕەنجاندووە. وتی: وەڵڵا کچم چووە مزگەوتەکەوە. وتی: کەواتە هەستە بچۆ بیهێنەرەماڵەوە و دڵنەوایی بکە. خاڵەی ڕیش‌سپی هەستا چوو بۆ مزگەوت و پیاوەکەی دیەوە و گەلێ لە خۆی بوردەوە و دڵنەوایی کرد و هێنایەوە بۆ ماڵەوە.

لە ڕێگەدا کابرا پێی وت: خاڵە! ئاخۆ کێ لەم قسانەی منی تێگەیاندی؟ وتی: کەسی خاڵی! ئەوی ڕاستی بێ، کچێکم هەیە ئەویش دەردی تۆ سەری لەم قسە بەتوێکڵانە ئەخورێ و گیرم خواردووە بە دەستیەوە. کابرا لە دڵی خۆیا تۆزێ فیکری کردەوە و وتی: تۆ بڵێ ئەوی من بە شوێنیا ئەسووڕێمەوە ئەمە بێ؟

لێیان دا چوونە ماڵەوە. ئافرەتێك لە ماڵەکە بوو؛ خۆی داپۆشیبوو؛ هەندێ گوڵ و گیاش لەناو حەوشەکەدا بوو. کابرا ڕووی کردە خاڵی ڕیش‌سپی و پێی وت: «وا دیارە گوڵی ئەم ماڵە بێ بێن و تاڵە». خاڵە دیسان لەم قسەیە ـ وەکوو قسەکانی‌تر ـ تووڕە بوو؛ خێرا کچەکە لەولاوە سەرپۆشەکەی خۆی لادا و وتی:

**گوڵی ئەم ماڵە گوڵەباخی ئاڵە    بە ڕەنگ و بۆیا ئاوی زەلاڵە**

کابرا کە تەماشای کرد ئەبینێ دووکانچەی جوانی ئەم کچە لەگەڵ باخچەی هۆش و بیرەکەیدا وەکوو دوو تای تەرازووی زێڕینی ئاڵتوونکێش وایە، کە هیچیان بەسەر هیچیانا نییە و موو لە موو جیا ئەکەنەوە. نازانێ پابەندی بازاڕی جوانی بێ، یا گیرۆدەی ژیری بێ!

ئەو شەوە مایەوە و بەیانی خوازبێنی کچەکەی لە باوکی کچە کرد. چارەنووسی ئاسمانی، لە ئاوێنەی زیندەگانی ئەو دوو دانەدا بە قەڵەمی نهێنی و بە مەرەکەبی خۆشبەختی و بە نگینی سولەیمانی کاڵای یەك بڕین. خورشیدی خەرامان بوو بە هاوسەری پەلك سەوزی داستان.

خەرمانی ژیری و دانایی بوو بە هاوڕازی نوکتەبێژی دەریای زانایی.

کابرا پەلی کچەی گرت و هێنایەوە بۆ وڵاتی خۆی و لە سەراو کۆشکی خۆیا داینا؛ ئینجا دەرگای ڕازی نهانی خۆی بۆ کچە کردەوە کە چۆن تا ئێستە هەر ژنێکی هێناوە پادشای ئەو شارە دەستی خەیانەتی لەگەڵ کردۆتەوە و چۆن ئەو ژیانە ناچاری کردووە کە ئیتر واز لە ژیانی ژن و مێردایەتی بێنێ و چۆڵ و بیابان بگرێتە بەر بۆ ژنێك کە نە لا، لە عەنعەناتی دنیا بکاتەوە، نە دەستی ستەمکاران بتوانێ بیشەکێنێتەوە؛ تا تووشی بوو بە تووشی ئەمەوە.

لە پاش ماوەیەکی کەم پادشا بیستی کە ئەم پیاوە ژنێکی‌تری هێناوە؛ ژنێکی وا کە نە پەری ئەیگاتێ نە ئادەمی. پادشا کەوتەوە سەر هەوەسڕانییەکەی جارانی؛ ناردی بەشوێن کابرادا و بانگی کرد. لە پاش قسەوباسێکی زۆر، بە چەپەری ناردی بۆ وڵاتێکی دوور؛ کابراش خۆی ئەزانێ چە باسە. هاتەوە بۆ ماڵەوە و کەینوبەینی لە ژنەکەی گەیاند. ژنە وتی: بچۆ بە شوێن ئیشی خۆتەوە و بەبێ وەی دێیتەوە. کابرا لێی دا ڕۆیشت.

پادشا کەوتە شەوێ پاش نوێژی خەوتنان وەڵامی نارد بۆ ماڵی کابرا کە بە میوانی دێت بۆ ئەوێ. ژنەکە بیستی پادشا ئەبێ بە میوانیان، هەستا ماڵی ڕێك خست و خۆی لە دنیای جوانیدا زۆر جوان بوو، سەرەڕای ئەوە هێنای ئەوەندەی‌تر خۆی جوان کرد و خۆی کرد بە پەیکەرێك گەلێ لە خەرامانی چین جوانتر.

زۆری پێ نەچوو پادشا هات و بە دەستووری شەونشینی نەوەك بە دەستووری پادشاهی چوو دانیشت. کە چاوی بە ژنە کەوت، پرشەی کارەبای ژنە خستیە عالەمێکی‌ترەوە. ژنەش دەمێ بە ناز و دەمێ بە نیاز

بە بەردەمیا دێت و ئەڕوا و ئەوەندەی‌تر دەردی کاری ئەکا. پادشا ئارامی لێ هەڵگیرا و کەوتە دەستدرێژی نامەردی. ژنەش هیچ خۆی تێك نەدا و بە عیشوەیەکەوە ئەیوت: بێ‌نەوایەك کە ببێ بە بەشی پادشایەك ئەمە ئەوپەڕی خۆشبەختییە بۆ ئەو بێ‌نەوایە. چە پەلەیەکتە ئیمشەو ـنەوەك هەر ئیمشەو بگرە هەموو شەوـ بە دڵی خۆت میوە لە باخی جوانیم ئەچنیت. ئێستە نانم بۆ دروست کردووی، پێکەوە نان ئەخۆین و پاش ئەوە ئەکەینە سەز سەرینی بەزم و سەفا.

ژنە هەر لە پێشەوە چەند هێلکەیەکی کوڵاندبوو؛ هەر هێلکەیەکی بە ڕەنگێ ڕەنگ کردبوو؛ یەکێ سەوز و یەکێ سوور و یەکێ شین و یەکێ زەرد و هەریەکە بە جۆرێ هێلکەکانی نایە ناو سینییەك و سەرپۆشێکی دا بە سەریا و لەگەڵ نانا داینا بۆ پادشا و خۆیشی لەولاوە دانیشت. پادشا سەرپۆشی لادا و هێلکەی ڕەنگاوڕەنگ دەرکەوت؛ هێلکەش پاك نەکرابوو. ژنە دەستی برد یەکێ لە هێلکەکانی بۆ پاك کرد و لە بەردەستیا داینا و وتی: فەرموو. پادشا ئەوەی خوارد و ئینجا دانەیەکی‌تری بۆ پاك کرد و بۆی دانا. بەو جۆرە چەند هێلکە هەبوو هەمووی بۆ پاك کرد و بۆی دانا و پادشا لە هێلکەی سەوز و سوور توند بوو.

پاش تێربوون کەوتەوە گڕوگاڵ. ئینجا ژنە وتی: پادشاهم ئێستە تۆ چیت خوارد؟ وتی: دیارە هێلکە. وتی: ئەم هێلکانە ئەوە بوو لە دیوی دەرەوە هەریەکە ڕەنگێکیان هەبوو، ئایا لە ناوەوە هیچ جیاوازییەك هەبوو لە بەینیانا؟ وتی: نەء؛ هەمووی هێلکە و یەك تام و لەزەتی هەبوو. وتی: پادشاهم ژنیش هەمووی هەر وایە؛ با لە ڕواڵەتا زرقوبرقێك لە بەینیانا ببێ، لە ئەسڵی ژنیەتییا هەموو هەر یەکن. ئەمە و دیسان تۆ پادشایت؛ پادشا بۆ میللەت وەکوو باوك وایە، ئایا باوك دەست بۆ نامووسی کچ و

کوڕی خۆی درێژ ئەکا؟ ئەم مێردەی من کوڕێکی جگەرسۆزەی تۆیە؛ چاوت لێیە چۆن بەدەم هەموو ئێش و کارێکەوە بە سەر ئەڕوا نەوەك بە پێ؟ ئێستە چۆن تۆ ویژدانت ئەوە هەڵئەگرێ کە دەستی گزی و خەیانەت بۆ ماڵی ئەو درێژ بکەی؟

پادشا کە ئەم قسانەی بیست وەکوو جامێ ئاوی سارد بکەن بە سەریا بەو جۆرەی لێ هات. لە شوێنەکەی خۆی ڕاست بووەوە وتی: «کچم، لە سەر دەستی تۆدا ئەوا مەرجم کرد تا ماوم باوکێکی میهرەبان بم بۆ هەموو کەس و لێی دا ڕۆیشت».

پاش ماوەیەك مێردی ژنە هاتەوە، بەڵام لە کردەوەی پێشینی پادشا ئەمجارەش هەروا ئەچووە دڵیەوە. هاتەوە بۆ ماڵەوە و هەستی کرد کە پادشا هاتووە بۆ ئەوێ. سەری خستە سەر ژنەکەی و ژنەش چی ڕووی دابوو هەمووی بۆ گێڕایەوە. ئیتر لە پاش ئەوە بەهۆی ژیری ئەم ژنەوە هەم مێردەکە کەوتە دنیایەکی ترەوە، هەم پادشایش کەوتە عالەمێکی ترەوە.



# قسەی تەنك

١٨١. وەستا گورroونی بەرگدروو هەبوو لە سولەیمانی دووکانەکەی لە قەیسەری وەسمان‌پاشادا بوو. شاگردێکی هەبوو خولەی ناو بوو؛ هەموو ڕۆژێ خولە ئەچووە سەر کونەبەڕۆچکەی قەیسەرییەکە بانگی ئەکرد: «وەستا بچم بۆ سەرچنار؟» ئەویش ئەیوت: «بچۆ گیانی وەستای».

لە پاشا پێیان وت: ئەوە بۆچ ئیزنی ئەدەی؟ ئەویش وتی: «ئیزنی چی نەدەم؟ ئەو چاکی لێ کردووە بە لادا، توێشووی لێ بەستۆتە پشتی و دارەدەستەکەی گرتووە بە دەستەوە. ئیزنی بدەم و نەدەم هەر ئەچێ. نەوەڵڵا بۆ ئەم پرسە گورگانەیە نە خۆم پیاوخراپ ئەکەم، وە نە قسەکەشم ئەشکێنم».

١٨٢. مەلا «عبدالرّحیم چروستانی» مەلای حوسێن‌بەگی جاف ئەبێ لە ئاوایی «فەقێ‌جنە». حوسێن‌بەگ هەموو حەفتەیە مووچەیەکی بۆ فەقیەکان بڕیبووەوە. حەفتەیەکیان لە ناردنەکەی دواکەوتبوو؛ فەقیەکانیش بە مەلا ئەڵێن. مەلا ئەچێتە سەر حوسێن‌بەگ و پێی ئەڵێ: «حوسێن‌بەگ! ئەگەر پیاوی، وەکوو پاشا بە؛ ئەگەر ژنی، وەکوو خانم بە؛ ئەگەر نە پیاوی و نە ژنی، نە مەدرەسە ڕاگرە و نە فەقێش دەسخەڕۆکە». حوسێن‌بەگیش ئەڵێ: مامۆستا، تا تۆ ئەگەڕێیتەوە ئەگەر مووچەکەم بۆ نەناردن بزانە نە پیاوم نە ژن».

مەبەستی بە پاشا: مەحمووپاشای جاف و بە خانم: عادیلەخانمی وەسمان‌پاشا بووە.

١٨٣. لە بەغدا بووم. شێخ «نجم‌الدّین»ی شەرعیە لە سولەیمانییەوە ساڵێك بۆی نووسیم: «هەنگوین، گەزۆ، گوێز، چیت ئەوێ، بێ‌منەت بڵێ، تا بۆت بێنم». منیش بۆم نووسییەوە: «لە هەنگوین، گەزۆ، گوێز چیم بۆ دێنیت، بێ‌منەت بە، بیهێنە».

١٨٤. مەلا حەمەمینی باراماوایی هەبوو، ئیجازەی وەرگرت و چووەوە بۆ ماڵی خۆیان. زۆری پێ‌نەچوو گەڕایەوە بۆ ناو فەقیان. لێیان پرسی: مەلا حەمەمین بۆچی هاتیەوە؟ وتی: «کوڕە من چووم مێزەرێکم لەسەر نا و عەبایەکم لەبەر کرد، دانیشتم لە دێیەکەی خۆمانا بەو نیازە کە ببم بە قازی؛ کەچی ئەگەر یەکێك بهاتایە پرسیارێکی لێ کردمایە، «ئامە»ی دایکم و «خەجە»ی خوشکم لەولاوە هەریەکە بۆ خۆیان قازییەك بوون؛ بەر منیان نەئەخست کە وەڵامەکە بدەمەوە. ناچار دەرم نەبرد و دەرپەڕیم».

١٨٥. کابرایەکی کورد مناڵێکی پێ ئەبێ، ئەچنە ماڵە گۆرانێك لەو شارباژێرە. کابرا گۆرانە هۆرێك مێوژی دانابوو، مناڵە چاوی بە مێوژ کەوت دەستی پێ کرد: «باوە مێوژ ئەخۆم، باوە مێوژ ئەخۆم» هەر نەیبڕیەوە. باوکەکەیشی چەپۆکێکی ماڵی بە سەریا وتی: «هەتیو! وس بە، پیاگەکە خۆی ئەقڵی هەس بۆت دەرتێری».

١٨٦. کابرایەکی کورد لە دەشتێکا تووشی گۆرانێك ئەبێ بەرد و ئەستێیەکی پێ ئەبێ؛ ئەڵێ: «کاورا ئەو کوچك و چەخماخەت

نادەی وە من؟» گۆرانەش ئەڵێ: ئەی خۆم چی بکەم؟ ئەویش ئەڵێ: «بیورەوە، بیورەوە تۆ گۆرانی؛ قەیچی دەمێ بۆ خۆت پەیدا ئەکەی».

١٨٧. لە (١٩٥٠)دا حزبی دەستووری ـ کە هی نووری سەعید بوو ـ باوێکی سەیری هەبوو لە عێراقدا؛ بەتایبەتی لە کوردەواری. خەلیل کەنە، وەزیری مەعارف و عەلی کەمال نائیبی سولەیمانی بە ناوی ئەو حزبەوە لە بەغداوە چووبوون بۆ کوردەواری، لە کەرکووك، لە ماڵی شێخێکی تاڵەبانی بانگێشتن کرابوون. یەکێ لە بانگکراوەکان شێخ قادری سیامەنسووری تاڵەبانی بوو. عەلی کەمال لێی ئەپرسێ: «ها شێخ قادر! کەسابەت و حاسڵاتی ئیمساڵ چۆنە؟» ئەویش ئەڵێ: «عەلی کەمال! ئەگەر کار و کاسبی و حاسڵات ببوایە من لێرە چیم ئەکرد؟!».

١٨٨. کابرایەك لە سولەیمانی کەرێکی لێ ون ئەبێ. لە حەمەی پیرۆز ئەپرسێ: ئەرێ کەرێکی ئاوا و ئاوات نەدیوە؟ ئەویش ئەڵێ: «برا! بۆچی ئەمە حەو رۆژە رەشەبا هێشتوویەتی من چاو بکەمەوە تا کەری تۆم بەرچاو کەوێ؟!».

١٨٩. ئەحمەدبەگی رێشێن هەبوو، ئەیوت: «باش بوو من بووم بە کوڕی رێشێن، نەبووم بە کوڕی گونە». (گونە و سەرا و دوو دێن لە شارەزوور و رێشێنیش گوندێکە لە بناری هەڵەبجە).

١٩٠. کابرایەکی شاربازێڕی گوێدرێژێکی بار کردبوو لە کەرە و سیرێژ، ئەچوو بۆ سولەیمانی. دوو کابرای هەورامی تووشی بوون لێیان پرسی: کابرا بارەکەت چییە؟ ئەویش وتی: «کەلوپەلە». کابراکان بارەکەیان لێ سەند و کردیانەوە، سەیریان کرد شتێکی شل

و نەرمە، لەوانەیە بخورێت. دەستیان کرد بە کەرە و سیرێژ خواردن و بە لایانەوە زۆر خۆشیش بوو؛ هەر ئەیانخوارد و ئەیانوت: «های فێڵبازی شارباژێڕی! ئەزانی کەل بە پەلەوە خۆشە، بۆیە ئەڵێی بارەکەم کەل و پەلە».

١٩١. کابرایەکی کورد نوێژی نیوەڕۆ بوو، چووە مزگەوتێکەوە نوێژی دابەست؛ وتی: «نیەتمە هەشت ڕکات نوێژی ئەم نیوەڕۆیە ئەکەم بۆ خوا». مەلای مزگەوتەکە لەوێ بوو؛ گوێی لێ بوو. دەنگی نەکرد هەتا کابرا نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان پێی وت: باوکم نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕەکاتە تۆ بۆچی ئەڵێی هەشت ڕکات؟ هەستە نوێژەکەت بکەوە. کابراش ئەڵێ: «مامۆستا وا مەزانە ئەیکەمەوە، من هەشت ڕکاتم کردووە، خوا تێ کەوێ چواری خاسی لێ هەڵبژێرێ بۆ خۆی و چوارە خراوەکە بداتەوە سەر خۆما».

١٩٢. لە شەڕی(١٩١٤ ـ ١٩١٨) خەڵکێکی زۆریان نارد بۆ شەڕ؛ لەمانە گەلێکیان کورد بوون. لە «شوعەیبە» شکا بوون؛ گەڕابوونەوە بەغدا. یەکێ لە کوردەکان ماینەکەی کوژرابوو، بە پێ ئەڕۆی بەڕێدا؛ لە بەر خۆیەوە هەر ئەیوت: «دە خوا بتگرێ سوڵتان ڕەشاد! تۆ کە بەغدات هەیە ئیتر بەسرەت بۆ چییە وا شەڕی لەسەر ئەکەی و ئەم عالەمە بە کوشت ئەدەی؟»).

١٩٣. هەر لەو شەڕەدا هەندێ کوردیان بە ناوی غەزاوە تەفرە دابوو، ناردبوونیان بۆ شەڕ. یەکێکیان هەر ئەپاڕایەوە خوا سا تۆ ئەم جارە مەمکوژە هەتا ئەچمەوە ماڵ. لێیان پرسی: بۆچی؟ وتی: «شەرت بێ بەم خەنجەرە مەلا کوت کوت کەم. دەویست باوکە هەر ئەیوت:

هەرکەس بچێ بۆ غەزا، "هۆری" ئەدەنێ. منی نارد بۆ کوشتن، نەیناردم بۆ هۆری. ئەگەر ڕاستی ئەکرد هەرکەس غەزا بکا هۆری ئەدەنێ ،خۆی بۆچی نەهات؟ من هۆریم ناوێ "خاتە"ی خۆم بە دەمی باوکیشم زیادە».

١٩٤. مەلایەك لەسەر کانییەك دانیشتبوو، کابرایەکی کورد لە قرچەی نیوەڕۆدا لە ڕێوە هات لەگەڵ گەیشتە سەر کانی، لەسەر لەپ لێ ڕاکشا و دەمی خستە کانییەکەوە تێروپڕ ئاوی خواردەوە. مەلا وتی: ڕۆڵە! جارێکی کە بەم تەرحە دەم مەخەرە ئاوەوە، خراپە. وتی: قوربان بۆچی خراپە؟ مەلا وتی: بۆ ئەقڵ زیانی هەیە. وتی: مامۆستا ئەقڵ چییە؟ مامۆستا وتی: «ڕۆڵە! لەگەڵ تۆم نییە ئەوە جارجار لەبەر خۆمەوە وڕێنە ئەکەم؛ ئەگینە بە تۆم نەوت».

١٩٥. هەتیوێك لە دێی «پیران» بوو؛ ناوی «مەولە» بوو. زۆر بێدەسەڵات و دەستەپاچە بوو؛ هەرکەس هەڵئەستا لێی ئەدا و تێی‌هەڵئەدا. تازە ئینگلیز هاتبووە وڵاتەوە «مەولە» ڕۆژێك لەگەڵ هەتیوێکی‌کە ـکە ناوی «ئەحەهوژە» بوو- شەڕیان بووبوو. ئەحەهوژە مەولەی نابووە ژێر خۆی. هەرچەن لەقەی ئەدا بە کەلەکەیا، مەولە وەکوو داڵ ئەیشیڕان؛ کەچی پیرێژنەکەی دایکی هاواری ئەکرد: «خەڵکینە! بۆ خاتری خوا مەولە بگرن با یەکێ نەکوژێ دەور دەوری ماژۆڕە».

١٩٦. کابرایەکی کورد منداڵێکی هەبوو. شەوێك لەسەر پشت ڕاکشابوو تەماشای ئاسمانی ئەکرد لە باوکی پرسی: باوە ئەو خەتە سپییە چییە بە ئاسمانەوە؟ باوکیشی وتی: ڕۆڵە! ئەوە ڕێی

کاکێشانە. کوتوپڕ کوڕە لە پڕ ڕاست بووە وتی: «ئای بەخوا بابە! پووشێك لە کایەکەی ئاسمان کەوتە خوارەوە چووە چاومەوە» و دەستی کرد بەگریان.

١٩٧. کابرایەك هەبوو «حاجی سەفەر»ی ناو بوو. چووبوو بۆ حەج و هاتەوە؛ لێیان پرسی: حاجی مەککە خۆشە؟ وتی: «ناوەڵڵا! یاخوا هەرچێ موسڵمانە ڕێی تێنەکەوێ. ئەگەر باوەڕتان هەیە، جەحەننەم لە مەککە گەلێ خۆشترە».

١٩٨. مەحوی، «سۆفی مەحموو» ناوێکی بۆ مجەوری خانەقا گرتبوو. دوانزە ساڵ بوو مجەور بوو. مەگەر شێخ زۆری درۆ لێ بیستبوو، شەوێکی زستان لە دوای نوێژی خەوتنان، شێخ ئەڕواتەوە بۆ ماڵەوە؛ لە هەیوانی خانەقا لە تاریکیدا تووشی زەلامێك ئەبێ ئەپرسێ: کوڕە کێیە؟ کابرا ئەڵێ: «منم». شێخ دیسان ئەپرسێ: تۆ کێیت و ناوت چییە؟ ئەڵێ: قوربان! سۆفی مەحمووی مجەورم. مەحوی قۆڵی ئەگرێ و ئەیباتە ژووری خانەقا و بانگ ئەکا: «ئەرێ خەڵکینە! ئێوە و خواتان ئەم پیاوە کێیە کە دەستی بە دەستمەوەیە؟» خەڵکەکە هەموو ئەڵێن: «قوربان! سۆفی مەحمووی مجەورە». ئینجا شێخ ئەڵێ: «ئافەرین سۆفی مەحموو! ڕەحمەت لە بابت!» خەڵکەکە ئەڵێن یا شێخ ئەوە مەبەست چییە؟ ئەڵێ: «(خەڵکینە! خۆتان ئەزانن ئەم پیاوە دوانزە ساڵە لە لامەوە لەم خانەقایە مجەورە. لەم دوانزە ساڵەدا ئیمشەو ئەم ڕاستییەم لێ بیست کە وتی: من سۆفی مەحموومم».

١٩٩. لە دەوری مەحمووپاشادا قازییەك نێررایە هەڵەبجە؛ مەلا ئەحمەدی ناو بوو. ڕەمەزان لە سەرا هات، ئەو ساڵە بیست‌ونۆ

ڕۆژ بوو. ساڵی دوایی ڕەمەزان لە هەوەڵەوە ڕۆژێکی لێ خورابوو لە ئاخریش بە بیست‌ونۆ ڕۆژی قازی فتوای جەژنی دەرکرد. ڕەمەزانی ئەو ساڵەش بۆ بە بیست‌وهەشت ڕۆژ. ئینجا مەحمووپاشا ناردی مەزبەتەیەکیان کردەوە و ناردی خۆیشی مۆری بکا. قازی پرسی: پاشا ئەمە چییە؟ وتی: قازی ئەفەنی مەزبەتەیە کردوومەتەوە و ئەینێرم بۆ «عەبدولحەمید» لە ئەستەمبۆڵ. وتی: بۆچی؟ وتی: «بۆ ئەوە تا بیست‌وهەشت ساڵی‌تر تۆ لێرە بمێنیتەوە ڕەمەزانمان بە تەواوی لە کۆڵ ئەخەی؛ چی لەمە چاکترە؟!».

٢٠٠. کابرایەك ساڵێك لە نەخۆشییەوە شێت بووبوو، بردبوویانە ماڵی «شێخ بابەعەلی سووسە» دوعای بۆ بکات. ماڵی شێخ بابە عەلی باڵەخانەیەکیان هەبوو شێتەکە لەوێدا بوو. منداڵە وردە کە لە کۆڵانەوە فیکەیان ئەکرد، کابرا ئەوەندەی‌تر شێت بووبوو؛ هەڵئەپەڕی و جنێوی ئەدا. بابەعەلیش دەستی دایە دارێك و منداڵە وردەکانی لێ دوور خستەوە. تۆزێکی پێ‌چوو شێتە سەری نابووە پەنجەرەکەوە بانگی ئەکرد: «منداڵگەلە بێنەوە، بێنەوە». بابە عەلی وتی: خزمە بە هەزار حاڵ دوورم خستوونەتەوە، کەچی ئێستە تۆ خۆت بانگیان ئەکەی؟ کابرای شێتە وتی: «توخوا واز بێنە، بەخودا دنیا بەبێ قنگە گەمە ناخۆشە».

٢٠١. کابرایەکی کورد ژنیان بۆ هێنا و زەماوەندیان بۆ کرد، چێشت و گۆشت ئەخورا. لەبەر ئەوە خەڵکەکە زۆر بوو نەیانپەرژایە سەر زاوا نانی بۆ دانێن. لە پاشا کە کەوتە شەوێ هاتن، پێیان وت: فەرموو بچۆرە پەردە. ئەویش وتی: «لاچن دەویت باوکینە! کێ پڵاوی خواردگە ئەوە بچێتە پەردە».

٢٠٢. کابرایەکی مەرگەیی مەسینەیەکی هەبوو ئەیبرد بۆسەر ئاودەست. مەسینەکە کونی تیابوو تا ئەو میزەکەی ئەکرد مەسینەکە هیچ ئاوی تێدا نەئەما. هەموو جار لەسەر عابخانەکە هاواری لێ بەرز ئەبووەوە بۆ ئاو. لە پاش بەینێك خەڵکی سەیریان کرد کابرا وەکوو جاران هاوار هاواری نەماوە، لێیان پرسی: ئەوە ئافتاوەکەت چاك کردۆتەوە؟ وتی: «ناوەڵڵا! بەڵام فێڵم لێ کردووە». وتیان: چۆن؟ وتی: «لە پێشا تارەتەکەم ئەگرم، ئینجا میزەکەم ئەکەم. دایەلیی دەگێیم، چما دێڵم هەروا بە حاسانی لە دەستم دەرچێ؟!».

٢٠٣. ژنێك ئیشی خراپەی لێ ڕوودابوو، لەسەر ئەوە سواری کەریان کردبوو شاربەدەریان ئەکرد. بە بازاڕا هێنایانە خوارەوە، خەڵکی بەردیان بۆ ئەهاویشت و تفیان لێ ئەکرد. لەو وەختەدا بە یاساوڵەکانی ئەوت: «تکاتان لێ ئەکەم قایم دەست بە قۆڵمەوە بگرن، نەوەك لە کەرەکە بکەومە خوارەوە و ئابڕووم بچێ!».

٢٠٤. کابرایەکی کورد جارێك ڕێی ئەکەوێتە بەغدا. گەرما ئەبێ. کابرایەکی عەرەب هەر بانگ ئەکا «مای بارد». کابرای کورد ئەڵێ: «ها برا تێکە لەو مای باردە بایی دو قڕان». تێر ئەخواتەوە و سەیر ئەکا ئەمە هەر ئاوە و هیچی‌تر. ئەگەڕێتەوە بۆ وڵات کوڕوکاڵ باسی بەغدا دێننە پێشەوە ئەویش ئەڵێ: «کوڕینە! ئەگەر چوونە بەغدا و کابرا بانگی کرد: مای بارد، نەکەن بیخۆنەوە، هەر ئاوە پەتییەکەی لای خۆمانە».

٢٠٥. خاڵە مەحموو ناوێك لە سووسەی سەیدان هەبوو، کچێکی بوو کابرایەکی خزمی داوای کرد، نەیدایە؛ دای بە پیاوێکی‌کە.

کابرای خزمی شەو چووبوو ئاگری بە کەپرەکەی خاڵە مەحمووەوە نابوو؛ پەیژەکەشی لێ لابردبوو، هەموو نوێن و شتومەکەکەی سووتابوو. ئینجا بەیانی لە مزگەوت خاڵە مەحموو حەکایەتی خۆی گێڕایەوە بۆ شێخ بابە عەلی سووسە. ئەویش وتی: «خاڵە مەحموو، هەرچێ کەس بووە حەواڵەی خوای بکە». خاڵە مەحموویش بە تووڕەییەوە وتی: «وس بە خزمە! یاخوا هەرچی شەهادەی بە شانی محەمەد هێناوە نەکەوێتە خوا! خوا تا ئێستە هەقی کێی سەندووە هەقی منیش بسێنێ؟»».

٤٠٦. کابرایەك لە دێی «کانی میران» ناوی قارەمان بوو. ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێکی باسی خواردنی خۆش ئەکەن، قارەمان ئەڵێ: خورماوڕۆن زۆر خۆشە. ئەوی‌تر لێی ئەپرسێ: بۆچی تۆ خواردووتە؟ ئەڵێ: «ناوەڵڵا نەمخواردووە؛ بەڵام ڕۆژێك ئاگام لێ بوو ئەورەحماناغا زۆر بەلەزەت ئەیخوارد؛ منیش بەوەدا ئەزانم کە زۆر خۆشە».

٤٠٧. دوو کابرای کورد هەبوون یەکێکیان خەلیلی ناو بوو، یەکێکیان جەلیل. بە ڕێبواری بە دەشتێکا ئەڕۆیشتن؛ سەریان لێ تێکچوو. لە دوورەوە ڕەشماڵێکی عەرەبیان بەرچاو کەوت. خەلیل بە جەلیلی وت: تۆ لێرە ڕاوەستە تا من بچم بزانم چییە؟ لێی دا ڕۆیشت. لەو کاتەدا کە سەری کرد بە دەوارەکەدا، کابرای عەرەبی خانەخوێ دەورییەکی «قاوت»ـی لە بەردەما بوو، لەگەڵ ژنەکەیا ئەیانخوارد. کە چاوی بەم کابرای میوانە کەوت بە ژنەکەی وت: «خَلّي جَوّه»؛ یانی بیبەرە ژوورەوە (واتە بیشارەوە). خەلیل کە گوێی لەم قسەیە بوو، ئاوڕی دایەوە دەستی لە هاوڕێکەی هەڵتەکان و بانگی کرد: «هۆ، جەلیل، جەلیل! پیاوەکە ئێژێ: خەلیل بێژە بە جەلیلیش با بێت؛ دەسا بێ، بێ».

٢٠٨. کابرایەکی شێت لە سولەیمانی هەبوو «قولە»ی ناو بوو. ڕۆژێك بەردێك ئەدا لە پیاوێك و ئەیکوژێ. پیاوە ئەبەن ئەینێژن. لە پاشا شەوجمعانەی بۆ ئەکەن و حەڵوای بۆ ئەبەخشنەوە. قولە ئەچێ و هیچی بەش نادەن و دەریئەکەن؛ ئەویش ئەیکا بە هەرا و هاوار ئەڵێ: «سەیر کەن، من خۆم کوشتوومە و حەڵواشم بەش نادەن».

٢٠٩. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی دووکانی بازرگانی هەبوو لە خانی حاجی ئاغافەتحوڵڵا؛ دووکانی حاجی فەقێش بەرامبەر دووکانەکەی ئەو بوو. لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەسەر ئەو دووکانە دائەنیشت هەر برنووتی هەڵئەمژی. سەرەڕای ئەوەش، مشتەرییەکانی حاجی ئێقیان ئەدایەوە ئەچوون لەسەر دووکانەکەی ئەو دائەنیشتن. جا لێیان پرسی: ها خاڵە! دنیا لە چییایە؟ ئەویش ئەیوت: «لە چییایە؟ سبەینێ خوا هەر خۆی ئەمێنێ و حاجی فەقێ».

٢١٠. هەر ئەم پیاوە ماڵەکەی لە تەنیشت ماڵی حاجی‌برایم‌ئاغای خەفافەوە بوو. خانووەکەی حاجی‌برایم‌ئاغا بەرزتر بوو لە هی ئەم. کوڕوکاڵ ئەچوون لە پانزە و شانزەی مانگا لێیان ئەپرسی: «خاڵە چەنی مانگە؟» ئەویش ئەیوت: «برا بۆچ حاجی‌برایم‌ئاغا دێڵێ من مانگ ببینم؟ چووزانم چەنیەتی؛ بچن لەو بپرسن».

٢١١. حاجی برایم‌ئاغا بانگێشتنێکی کردبوو؛ گەلێ کەس لە خەڵکی سولەیمانی بانگ کردبوو. پیاوێك هەبوو لەگەڵ ئەوە کە دراوسێیەکی زۆر نزیکی بوو، بانگی نەکردبوو. لێیان پرسی: خاڵە ئەوە چۆن حاجی برایم‌ئاغا تۆی بانگ نەکردووە؟ ئەویش ئەڵێ: «برا، چووزانم؟ حاجی برایم‌ئاغا ڕەنگبێ وا بزانێ من نازانم پڵاو بخۆم».

٢١٢. مەلا مەحمووی بانەیی کوێرێکی چەتەوڵی لووت زلی کونجی ناشیرینی چاو بە قووڵاچوو بوو؛ ڕیشێکی تەڵەتەڵە سپی پێوە بوو، کڵاوێکی قووچی لە سەرا بوو، مێزەرێکی سپی لە چڵکا داوەشاوی ئەبەست بە دەوریەوە، داردەستێکی گرێگرێیاوی بە دەستەوە (باقڵێکم «پەڵك» بوو). جا ئەم مەلا مەحمووە شای ئێران ـناسرەدین شاـ ساڵێ چوارده تمەنی بۆ بڕیبووەوە. ئەبوایە لە بانە بچوایە بۆ تاران بۆ وەرگرتنی ئەم ساڵانەیە. ئەیوت: تا ئەچووم و ئەهاتمەوە هەشت مانگم پێ ئەچوو. ڕاستیشی ئەکرد؛ چونکە ئەو سەردەمە وەترو و شتە نەبوو.

وتی: «جارێکیان کە گەیشتمە ناو شاری تاران، بەناو بازاڕا تێ ئەپەڕیم، بۆ ماڵی پاشا ئەچووم. سەیرم کرد لەسەر دووکانەکانەوە هەموو وتیان: «عومەری، عومەری». هیچ دەنگم نەکرد؛ خێر، پێیان لێ هەڵبڕی دەستیان کرد بە جنێودان بە حەزرەتی عومەر. وتی: زۆرم پێ ناخۆش بوو، خۆمم نەگرت، دەستم کرد بە جنێودان بەوان. تەماشام کرد ئەوان جنێو ئەدەن، منیش بەم جنێوانە کە ئەیاندەم، هیچ دڵم ئاو ناخواتەوە؛ چارم نەما. وتی: منیش دەستم کرد بە جنێودان بە حەزرەتی عەلی. بەمە تۆزێ کوڵی دڵم دامرد؛ بەڵام هەر ئەوەندە خۆش بوو جنێو لە دەمم هاتە دەرەوە؛ بۆم داپەڕینە خوارەوە لەسەر دووکانەکان. هەر ئەوەندەیان تێ هەڵدام کڵاو و مێزەر و پشتێنەکەم ئێستەش نازانم کەوتنە کوێوە. بە دەم تێهەڵدانەوە بە هەر پەلەپرووزەیەك بوو، سەرم کرد بە کونی ماڵی پاشادا (مەبەستی بەم قسانە بارەگای پادشاهی بوو). وتی: لەوێ کوردی پیاوماقووڵی سنەیی هەبوون، ئەگەر ئەوان ڕزگاریان نەکردمایە، جارێکی تر ئێوە ئەم مەلا مەحمووەتان نەئەدیەوە».

**٢١٣.** کابرایەکی کورد لە ڕۆژی جومعەی مانگی ڕەمەزاندا لە بەر مەزاری کاك ئەحمەدی سولەیمانی لە مزگەوتی گەورە، کاسەیە ماستاوی دانابوو، لە بەرچاوی خەڵکەکەوە نان و ماستاوی ئەخوارد. مەلایەك بە تەنیشتیا تێپەڕی پێی وت: کابرا تۆ شەرم ناتگرێ بەم مانگی ڕەمەزانە لە بەرچاوی ئەم خەڵکەوە شت ئەخۆی؟ کابراش ئەڵێ: «خەڵکینە! سەیری ئەقڵی ئەم مەلایە کەن، ئەڵێ: تۆ بەم مانگی ڕەمەزانە موبارەکە لەم ڕۆژی جومعەی پیرۆزە لە بەر مەرقەدی کاك ئەحمەددا بەم گەرمای مانگی تەمووزە ئەم نان و ماستاوە ساردە مەخۆ!».

**٢١٤.** مامە حەمە پیاوێکی پیری شاتری بوو لە «شانەدەر»ی شارەزوور دائەنیشت. ڕۆژێك باسی پیاوچاکان ئەکرا، ئەویش وتی: ناشوکری نەبێ، پیاوی خاس و وەلی کەی هەبووە؟ لەم ناوەدا کاك ئەحمەدی سولەیمانی و من و شێخ عومەری بیارە هەبووین؛ ئەوان ڕۆیشتن و ناشوکری نەبێ هەر من ماومەتەوە.

**٢١٥.** عەزیزئاغای چاوقووڵی حەکایەتخوان، زۆر قسە خۆش بوو؛ لە قاوەخانەی مارفی قاوەچی لە سولەیمانی حەکایەتی ئەکرد. شەوێ سەد کەسی لێ کۆ ئەبووەوە. بەڵام عەزیزئاغا نەئەچووەماڵی کوڕەکانی؛ بە شەو لە قاوەخانەکە ئەنوست و نان و چێشتی بازاڕیشی ئەخوارد.

شەوێك حاجی ساڵحی سابوونچی ـ کە زاوای بوو ـ هات وتی: «مردووت مرێ! تۆ ئەمە چییە هەموو دەمێ سەروپێی بازاڕ ئەخۆی؟ بۆچی نایەیتە ماڵەکەی من دانیشی، پارووێك نان هەر هەیە بیخوێن». لەسەر ئەم قسەیە عەزیزئاغا بڵێسە ئەستێنێ و ئەڵێ: «کوڕە تۆ ماڵت لە کوێ بوو؟

گووم کردە ماڵت. خۆ ماڵەکەت وەکوو نێرگەڵەکەی سەیدئەحمەدی بابەڕەسووڵ وایە؛ هەر سەعاتێ بەدەست هەتیوێکەوەیە».

٢١٦. جارێکیان لەو کوردەوارییە لە دێیەك نوێژی جومعە ئەکەن. سەیر ئەکەن یەکێکیان ناتەواوە؛ چۆنکە بەلای شافیعییەوە ئەبێ چل کەس بن. گەلێ پیاو چاوەڕێی ئەکەن کەسیتر پەیدا نابێ. هەتا لە دەمەدەمی عەسرا ئەبینن کابرایەکی کەپەنك بەشان لە دوورەوە رووی کردە ئاوایی.

ئەچن بە پێشوازیەوە و پێی ئەڵێن: ئیشێکی خێر هەیە و لەسەر تۆ پەکی کەوتووە؛ تۆیش ئەبێ ئەم ئیشە بکەی بۆ خوا. ئەپرسێ: چییە؟ ئەڵێن: نوێژی جومعەیە و بە تۆ تەواو ئەبێ. ئەڵێ: تۆزێ لێم ڕاوەستن. کەوشەکانی دائەکەنێ ئەیداتە بن دەستی و کەپەنکەکەی لوول ئەکا و ئەیخاتە سەر شانی، دوو پێی ئەبێ، دوویتری بۆ قەرز ئەکا و بۆی دەردەچێ. ئەڵێن: کوڕە ئەوە تۆ چیت کرد؟ بۆ کوێ ئەچی؟ ئەڵێ: «کوڕە بڕۆن، من تا ئێستە هەزار ئیشم بووە بەخوا یەکێکی بۆ پێك نەهێنام؛ ئێستە ئەو ئەم ئیشەی کەوتۆتە من، خۆ شێت نەبووم بۆی جێبەجێ کەم».

٢١٧. لەو کوردەوارییە مەلایەکی چاك لە دێیەك بوو. ڕۆژێك کۆلکە مەلایەك چووە دێیەکە و وتی: خەڵکینە من مەلایەکی چاکم و ئەبم بە مەلاتان. ئەوانیش وتیان: مەلای خۆمان چاکە و مەلامان ناوێ. ئەویش وتی: مەلاکەی ئێوە هەر مەلا نییە لە چاو منا. مەلای گوندەکەش لەوێ بوو؛ لەم قسەیە تووڕە بوو، وتی: تۆ چۆن ئەڵێی بە من مەلایەکی چاك نیم. ئەمیش وتی: بابە ئەمەی پێ ناوێ، وەرن تاقیمان بکەنەوە. ئێمە ئێستە هەردووکمان «مار» ئەنووسین، هەرکامێکمان چاکمان نووسی،

ئەوە ئەوەمان مەلایەکی چاکە. مەلا چاکەکەش وتی: باشە.

هێنای لەسەر کاغەزێك وشەی «مار»ی نووسی. کۆلکە مەلاکەش خەتێکی پێچەڵپلووچی نووسی. ڕووی کردە خەڵکەکە وتی: خەڵکینە! وەرن، ئێوە و خواتان سەیر کەن بزانن ئەمانە کامیان مارن؟

خەڵکەکەش کە سەیریان کرد وتیان: وەڵڵا بابە مار ئەوەتە تۆ نووسیوتە؛ دیارە ئەم مەلایەی ئێمە تا ئێستە دەستی ئێمەی بڕیوە و هیچ مەلا نییە. مەلای هەناسەساردیش هەرچەند هاواری کرد کە مار ئەوەیە من نوسیوومە، کەڵکێکی نەدایە و دەریانپەڕاند.

٢١٨. کابرایەکی کورد کوڕێکی بوو نابوویە بەر خوێندن. ڕۆژێك لێی ئەپرسن: خاڵە سەمین! لە قولەنیسکە بووەسەوە و تەنگی وە تەوەت هەڵنیگە؟.

٢١٩. لە قسەی کوردانەیە ئەڵێ: لە شارێك کە خەڵکەکەی بوتپەرست بوون، ڕۆژێك جەژنیان بوو، گوێدرێژکیان بە کورتانی قەیفە و سەر کەللەی ئاوریشم و زەنگۆڵەی زیو ڕازاندبووەوە، بوتەکەیان سوار کردبوو بەناو شارا ئەیانگێڕا. خەڵکی هەرچی تووشی ئەبوو، کڕنوشی بۆ بوتەکە ئەبرد و بە لەنگەری و سەبەتە نوقڵ و نەباتیان بۆ کەرەکە ئەهێنا. ئینجا گوێدرێژەکە خۆی لەو پایەیەدا دی، خۆی لێ گۆڕا، گازی لە خەڵکی ئەگرت و جووتەی هەڵئەدا. کابرایەکی کورد لەو شارە بووچوو سەری نایە بناگوێی و پێی وت: «ماڵ کاول! بۆچی خۆتت لێ گۆڕاوە؟ ئەم ئیحترام و کڕنوشە بۆ بوتەکەیە، لەبەر تۆ نییە. تۆزێکی‌تر کە بوتەکەت لەسەر لاچوو ئەبیتەوە بە کەرەکەی جاران بارت لێ ئەنێن و بە نەقیزە تێت بەرئەبن».

٢٢٠. ساڵێك فەتاحی بارامی هەمەوەن ڕاووڕووتی ئەكرد. ڕۆژێك لە دەوری قەرەداخ جوولەكەیەك ڕووت ئەكاتەوە. جووە ماڵی عەتاری زۆری پێ ئەبێ و سابوونی بۆنخۆشیش لەناو شتومەكەكانیا ئەبێ. وتیان: فەتاحی بارام ڕۆیشت؛ لە دوای چارەكە سەعاتێ بە غار هاتەوە بانگی جوولەكەی كرد وتی: «جووە! منداڵی وردم هەیە؛ وە كەلام بەو بۆنە خۆشە منداڵێكم شتێكی لێ بێ بە ڕەچەڵەكتا ئەچمە خوارەوە». جووەكەش ئەیوت: «قوربان بە حەزرەتی مووسا و موحەممەد! هیچ زیانی نابێ، مەترسە».

٢٢١. كابرایەك هەبوو لەو دەشتی دزەییە، «ڕەسوول»ـی ناو بوو. ژنێكی كەڕی هەبوو ناوی بەسێ بوو. ڕۆژێك سێ چوار سوار ئەبن بە میوانیان. كابرا ئەچێتە ژوورەوە ئەڵێ: «بەسێ، مریشكێكیان سەر بڕە لەگەڵ برنج بۆیان لێ نێ». بەسێش ئەڵێ: «وەڵڵا ڕەسوول تۆ وەخت و ناوەخت نازانی؛ كەی ئێستە وەختی ئەوەیە؟» ئەمە ئەڵێ و دەرپێكەی دائەكەنێ.

٢٢٢. مەلایەك جارێك لە خێڵە كوردێكا ئامۆژگاری خەڵكەكەی ئەكرد كە پیاو نابێ توخنی دایك و خوشك و پوور و كچی خۆی بكەوێ؛ حەرامە. كابرایەك لەولاوە ڕاست بووەوە وتی: «سا بەخوا مامۆستا! من دوێنێ هەر بە گەمەوە میمكی خۆمم گا و هیچ حەرامیش نەبوو».

٢٢٣. كابرایەك لە دێی «سۆكتە» شوان بوو. لە پڕێكا وازی لە شوانی هێنا و ڕۆیی. لە دوای سێ چوار ساڵ پیاوێكی سۆكتەیی ئەچێ بۆ ئەستەمبوڵ لەوێ چاوی پێ ئەكەوێ ئەوا كەوایەكی شیرداخی

سوور و سەڵتەیەکی چۆغەی لەبەرایە. ئەڵێ: دیارە شوکر ئەحواڵت خۆشە؟ موبارەك بێ! جلی جوانت لەبەردایە. کابرا ئەڵێ: «برا! یاخوا بە میراتی کەوێ! من کەوای سوور و سەڵتەی جوانم بۆ سەر بان و سەرانوێلکی سۆکتە ئەویست».

٢٢٤. کابرایەکی «بەرکێو»ی کوڕێکی بوو خلەی ناو بوو؛ نەخۆش بوو. لێیان پرسی: کوڕەکەت چاکە شوکر؟ وتی: «ناوەڵڵا! ئەمرۆ لە هەموو ڕۆژان خراپترە؛ تەنانەت سێ تەحامانم لۆ دانایە لە هیچیانی نەخوارد». وتیان: تەحامەکان چی بوو؟ وتی: «بەڕوو بە کاڵی، بەڕوو بە کوڵاوی، بەڕوو بە برژاوی. ئینجا خلە بێ و بەڕووان نەخوا». یەکێ لەولاوە وتی: ها ئەم کوڵوە شەکرۆکەی بۆ بەرە بەڵکوو بیخوا. کابرا وتی: «من ئەڵێم بەڕووان ناخوا ئینجا نۆرەی شەکرانە».

٢٢٥. سەعدی شاعیری شیراز، حەکایەتێك ئەگێڕێتەوە، ئەڵێن: کارەساتەکە لە کوردەواری بووە. ئەڵێ: «کوڕە دەوڵەمەندێك و کوڕە هەژارێك چوونە سەر قەبران بۆسەر گۆڕی باوکیان؛ گۆڕەکانیان نزیکی یەك بوون. گۆڕی دەوڵەمەندەکە بە بەرد و بە خشت و گەچ هەڵبەسترا بوو، جوان ڕازێنرابووەوە؛ هی هەژارەکە لەگەڵ ئەرزەکە یەك بوو. کوڕەکان ئەکەونە قسە کردن، ئاخری کوڕە دەوڵەمەند وتی: «تەماشاکە گۆڕی باوکم چەن جوان هەڵبەستراوە! گۆڕی باوکی تۆ خۆڵیشی بە سەرەوە نەماوە». کوڕە هەژارەکەش وتی: «قوڕبەسەر خۆت و ئەقڵت! کاتێ کە پێیان وتن هەستن بچن بۆ بەهەشت، هەتا لە ژێر ئەو هەموو بەرد و خشتە بە نیخەنیخ بێتە دەرەوە باوکم چوار کۆشك لە بەهەشتا بۆ خۆی داگیر ئەکا».

٢٢٦. کوڕە دەوڵەمەندێکی نازیرەك لەگەڵ «لەلە»کەی چوونە ماڵێك، دوو سێویان بۆ هێنان؛ بۆیان دانان. کوڕە سێوی خۆی هەڵگرت و دەستی کرد بە قەپاڵ لێدانی. هەرچەن لەلەکەی چاوی لێ هەڵتەکان کە نەیخوا کەڵکی نەبوو؛ کوڕە تێ نەگەیشت. کە هاتنە دەرەوە لەلە وتی: «ئەوە بۆچی تۆ ئەو مێوەیەت خوارد؟ کە جارێکیتر شتی وا جوانیان بۆ هێنای یەك دوو جار بۆنی بکە و بیخەرە باخەڵتەوە». کوڕە وتی باشە.

جارێکیتر چوونە ماڵێکیکە، بە ڕێکەوت «کفتە»یان هەبوو. لەسەر دەوری دوو کفتەیان هێنا، یەکێ بۆ لەلە و یەکێ بۆ کوڕە ئاغا. کوڕە ئاغە هەر دەستی دایە کفتەکەی خۆی دووجار بۆنی کرد و نایە باخەڵیەوە. ئیتر لەلە هەڵسا و هاتە دەرەوە وتی: ڕۆڵە! ئەوە بۆچی ئەو کفتەیەت خستە باخەڵتەوە؟ وتی: ئەی تۆ نەتفەرموو. وتی: «باوکم من کاڵم پێ وتی بۆنی بکە و بیخەرە باخەڵتەوە، یان کوڵاو؟».

٢٢٧. دوو کابرای کورد دەستەبرا بوون؛ یەکتریان زۆر خۆش ئەویست. ڕۆژێك پێکەوە چوون بۆ حەمام. یەکێکیان زوو هاتە دەرەوە، تەماشای کرد دەفتەرێکی بچووکی باخەڵی هاوڕێکەی داکەوتووە، هەڵیگرت. کەچی لاپەڕەیەکی لێ کەوت، سەیری کرد نووسرابوو: ئەو شتانە کە بۆ فلانی هاوڕێم خەرج کردووە: فلان ڕۆژ بانگێشتنم بۆ کرد دە قران، فلان ڕۆژ سەعاتێکم بە یادگار بۆ نارد چل قران، فلان ڕۆژ بۆ کوڕەکەی دەستێ جلم کرد پەنجا قران، بەم جۆرە سیاهەیەکی زۆری گرتبوو. کابرا دەفتەری لێك نا و پەڕەکەی تێخستەوە و ڕۆیی.

هاوڕێکەی کە لە حەمام هاتە دەرەوە پرسی: فلانکەس چی لێ هات؟ وتیان: ڕۆیشت. زۆری بە لاوە سەیر بوو؛ چونکە تا ئەو وەختە یەکتریان

بەجێنەهێشتبوو. خەیاڵی کرد نەوەکوو نەخۆش بووبێ. بە پەلە چووە ماڵەکەیان تەماشای کرد لە ماڵەوە دانیشتووە، بەڵام زۆر مات و دلگیرە و وەکوو جارانیش بە پیریەوە نەهات. لێی پرسی: براکەم ئەوە بۆچی لە حەمام بەجێت هێشتم؟ بە عاجزیەوە وتی: ئیشم هەبوو. پرسی: توخوا بۆچی عاجزی؟ وتی: عاجزی لە دڵی خۆمایە. ئاخری سوێندی دا کە پێی بڵێ. ئینجا وتی: «ڕەفیق! من و تۆ ئیتر برایەتیمان نەما، چونکە تۆ لەو ڕۆژەوە کە بووین بە دەستەبرا، ئەگەر جگەرەکەت دابێ بە من، پارەکەت لە سەرم نووسیوە، وابزانم تۆ داوای پارەی ئەو شتانە ـ کە دەفتەرت گرتووە ـ لێم بکەی».

هاوڕێکەی پێکەنی وتی: ئەزانم چاوت بە دەفتەرەکەی باخەڵم کەوتووە، لەوە دلگران بووی. گیانەکەم! ئەو دەفتەرە بۆ ئەوە نەگیراوە کە ـ خوانەخواستە ـ داوات لێ بکەم؛ بۆیە گرتوومە ئەگەر ڕۆژێك لەسەر شتێکی هیچوپووچ دڵم بڕەنجێ، تەماشای دەفتەرەکە بکەم و بڵێم هەی های من ئەوەندە و ئەوەندە پارەم لەم دۆستەی خۆما خەرج کردووە، ئێستە لەسەر ئیشێکی وەها واز لەم هەموو برایەتییە بێنم؟!. مەبەستەکە ئەوەیە، نەوەك پارەکە. ئیتر هاوڕێکەی ئەمەی بیست دڵی چاك بووەوە و دۆستایەتییان لە جاران زیاتر بووەوە.

**٢٢٨.** ساڵێك مەحمووپاشای جاف لەگەڵ باوکی جەمیل بەگی بابان دوژمنایەتییان هەبوو. مەحمووپاشا ناردی هەر تایەفەیە چل سواری کۆ کردەوە؛ شەو و ڕۆژێکی تەواو قسەی لەگەڵ کردن و ئینجا ناردنی کە بچن لە کفری [لەگەڵ] دوژمن شەڕ کەن. ڕۆیشتن لە دوای سێ ڕۆژ لەشکرەکە گەڕانەوە، پرسی: چیتان کرد؟ وتیان: «قوربان! پێر

گەیشتینە قەراخ شاری کفری. تەگبیرمان ئەکرد کە چۆن بچین دوژمن بکوژێن و لەو وەختەدا یەکێك جارێك پشمی ـ واتە سەبری هێنا ـ ئیتر ئێمەش گەڕاینەوە بە دواوە».

٢٢٩. بازرگانێکی دەوڵەمەن هەتیوێکی ڕەشی زۆر ناشیرینی هەبوو. ڕۆژێك بە هەتیوەکەی وت: تۆ لە حوجرە دانیشە من ئەڕۆم هەتا نیوەڕۆ ئیشم هەیە. ئەگەر یەکێك هات بۆ کووتاڵ کڕین، بفرۆشە؛ بەڵام ئاگات لێ بێ من چلۆنم فرۆشتووە تۆش وای بفرۆشە؛ بە هەرزان لە دەستت دەرنەیەنن. هەتیوەکە وتی: بەسەرچاو. کابرای بازرگان چوو بەشوێن ئیشەکەی خۆیەوە. یەکێك هات چیت بکڕێ، ئەو چیتە گەزێ بە چوار قڕان بوو، هەتیوە دای بە دوو قڕان. کە خەڵکەکە زانییان ئاوایە لە هەتیوە کۆبوونەوە بە نیوە قیمەت و چواریەکە قیمەت گەلێ کووتاڵیان لێ کڕی.

وەختی عەسر بازرگانەکە هاتەوە بۆ دووکان تەماشای کرد لایەکی دووکانەکەی چۆڵ بووە. پرسی: هەتیوە کوا ئەم کووتاڵە چی لێ هاتووە؟ هەتیوە وتی: ئاغەم هەمووم فرۆشت و ئەوە پارەکەیەتی. ئاغە تەماشای کرد هەتیوە هەمووی بە تالان داوە. هەر هەڵسا کوتەکێکی گرت بە دەستەوە گەلێکی لە هەتیوە ڕەشەکە دا. ئینجا هەندێك تەماشای دەفتەری کرد و دوایی سەری هەڵبڕی ڕووی کردە هەتیوە، چاوی پێ کەوت وا ئەگری، فرمێسکی چاوی و چڵمی لووتی و لیکی دەمی تێکڵاو بوون؛ زۆر ناشیرین هاتە بەر چاوی. بە دەست خۆی نەبوو بەم دیمەنە ناشیرینە پێکەنی. هەتیوە وتی: «ئا، ئاغەم ئێستا کە لە قازانجی خۆی تێگەیشتووە ئینجا لە خۆشیانا پێ ئەکەنی».

٢٣٠. کابرایەکی دەوڵەمەند ئێوارەیەك هاتەوەماڵەوە ژنەکەی نانی بۆ دروست کردبوو ویستی تێ‌کا، کابرا چووە حەوشەوە. لە پاشان ڕووی کردە تەوێڵەکە، زۆری پێ‌چوو هەر نەهاتەوە. ژنەکە دڵی کەوتە مەراقەوە. هەڵسا لە درزی دەرگای تەوێڵەکەوە تەماشای کرد؛ ماکەرێکی سپییان هەبوو، ئەوا مێردەکەی بە ماکەرە سپییەوە نیشتووە. ژنەکە زۆرزان بوو، دەنگی نەکرد گەڕایەوە جێی خۆی. بەیانی مێردەکەی هەڵسا بچێ بۆ دووکان بە ژنەکەی وت: بۆ ئێوارە فلان چێشت و فلان چێشتم بۆ بکە. ئەویش دەستی نایە سەر چاوی.

ئێوارە کە هاتەوە تەماشای کرد ژنەکە لەناو لێفە و دۆشەکا کەوتووە و ئەناڵێنێ. لێی پرسی: ئەوە چە خێرتە؟ وتی: پیاوەکە لە بەیانییەوە لەرزم هاتوتێ؛ زۆر بێ‌حاڵم. کابرا وتی: بۆ ئێوارێ کەوابێ هیچ نییە بخۆم؟ ژنە وتی: بەڵێ، بۆت کراوە، ئەوەتە لە ژوورەوە لەسەر سینی داپۆشراوە.

کابرا چووە ژوورەوە تەماشای کرد ئەوا سێ دەوری لەسەر سینی سەرپۆشی بە سەرەوەیە. سەرپۆشێکی لابرد «جۆ» بوو؛ ئەوی‌تریان «گنرە»گیا بوو؛ سێهەمیان «کا» بوو. کە ئەمەی دی جنێوێکی زۆری دا بە ژنەکەی وتی: بۆچی من گوێدرێژم ئەمانەت بۆ داناوم؟ ژنەکە وتی: «مێردەکە! بۆچی جنێوم پێ ئەدەی؟ من ئەمڕۆ نەخۆش بووم هەوێکەم کە دوێنێ ئێوارە لە تەوێڵەکە دەستت لە ملیا بوو، هات خواردنی بۆ دروست کردی. ئیتر خەتای من چییە؟». کە ئەمەی بیست ئینجا زانی کە ژنەکە بە کردەوەی دوێنێی زانیوە زۆر شەرمەزار بوو.

٢٣١. شێخ بابەعەلی تەکیەیی و مەلاحوسێنی پیسکەندی و مەلا عەزیزی موفتی‌سولەیمانی ئەچنە کەرکووك، بۆ دیدەنی «سەید

ئەحمەدی خانەقا». نزیکەی حەفتەیەك لەلای سەید ئەمێننەوە؛ سەید خزمەتێکی باشیان ئەکا. ئەو ڕۆژە کە ئەیانەوێ بگەڕێنەوە، سەید تەمێی خزمەتکارەکەی ئەکا ئەڵێ: بۆ قاوەڵتی کە نان دروست کرا لە پێشەوە تەنها چێشتێ بێنن و ئیتر دەست لە هیچ مەدەن؛ هەروەخت پێم وتن، ئەو وەختە نانی تەواو دانێن.

ئەکەوێتە قاوەڵتی نان دێت؛ بەڵام هەر تاقە چێشتێکە، ئەویش کوولەکەیە. بابە عەلی گەلێ چاوەڕێ ئەکا هیچیتر دیار نییە؛ ئەوا دیواخانیش پڕە. ڕوو ئەکاتە مەلا حوسێن ئەڵێ: «مەلا حوسێن! سەید تا ئێرە باشی هێنابوو، بەڵام لێرەدا گووی تێکرد». سەید ئەحمەد و مەجلیس هەموو دەست ئەکەن بە پێکەنین و ئینجا نانی تەواو دائەنێن.

٢٣٢. شێخ مەحمووی شێخ سەعید ـ ئەو شێخ مەحمووە کە بێگومان لەم چەرخەدا گەورەتر پیاوێکی کورد و بەناوبانگتر ناودارێکی کورد بوو، لەو ڕۆژەوە کە لە «بێشکە دار»ا بوو تا ئەو ڕۆژە چووە «بێشکەی خاك »ەوە، واتە ماوەی ٧٨ ساڵ ژیانی، بە شۆڕش و هەرا و بە پێشکەوتنی کوردەوە خەریك کرد. ماوەی ژیانی ئەو، مێژوویەکی ڕووناکی سیاسی کورد بووە. گەلێ لاپەڕەی هەڵدایەوە، گەلێ ڕۆژگارانی ئاژاوەی چاوپێکەوت. هەر بۆ ئەوە کورد لە کۆڵێتی بێنەواییەوە بکەوێتە کۆشکی ئازادی. لەم ڕێگەیەدا گەلێ چەوسانەوە و کارەساتی بەسەرا هات. ئێران و توووران و هندستان نەما نەچێ و نەیبەن؛ جارێك دەستی بە تفەنگەوە، جارێك دەستی بە دەسبەنەوە، جارێك بە ناوی «مەلیکی»یەوە، جارێك بە ناوی «دیلی»یەوە.

لە ئەنجامی ئەم کارەساتانەدا شێخ مەحموو گەیشتە شوێنێك کە ناو ئەبرا بە «مَلِك» و پێی ئەوترا مەلیکی کوردستان. هەم خۆی ناوی

وەرگرت هەم کوردستان. دیارە ئەمە لاپەڕەیەکی زێڕین بوو هەم بۆ خۆی، هەم بۆ کوردستان. بۆ خۆی، چونکە ڕەنگە تا ئەم دەورەیە کوردستان بەم ناوەوە ئەو ناوەی بە خۆیەوە نەدیبێ. لەگەڵ ئەمانەشا شێخ مەحموو نەوەك تەنها هەوای مەلیکی و بەرزی مادی لە سەرا بووبێ، بەڵکوو هەوای ڕۆحیات و مەعنەویاتی گەلێ زیاتر بوو لە هەوای پێشووی.

لێرەدا لەسەر پێ و شوێنی پادشا بەرزەکانی کۆن ئەچوو بەڕێوە. دیواخان ڕابواردنی لەگەڵ ئاشنایانی ئەدەب و زانستیدا بۆ باری ئەدەب و شیعر و قسەی جوان و پڕ مەعنا، کەمتر نەبووە لە دیواخانی ئەو پادشایانە کە ئێستە بە سەدها کتێب لەسەر قسە و نوکاتیان نووسراوەتەوە. بەڵام داخی گرانم چونکە زمانی کوردی ـ لەبەر هەر شتێك بووبێت ـ بێناز بووە، خۆی و پیاوی و قسەی جوانی هەموو بوون بە ژێر لێوەوە و وەکوو خۆیان بێناز ڕۆیشتوون. داخی گرانم ئەگەر نووسراوی کوردی بە زمانی کوردی ببوایە، ئەبێ لەو بڕوایەدا بین کە ئێستە کتێبخانەی نووسراوی کوردی کەمتر نەئەبوو لە کتێبخانەی ئەو قەومانە کە شانازی بە نووسراو و زمانی خۆیانەوە ئەکەن.

توخوا با ڕۆژگار لا پەڕەی ژیانی شێخ مەحمووی مەلیکیش بشارێتەوە وەکوو لاپەڕەی ژیانی هەزاران پیاوی ناوداری کوردی شاردۆتەوە ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾.

جارێك ئەم شێخ مەحمووی مەلیکە بە دیلی برابووە بەغدا، لەوێ بە سەربەست ئەسووڕایەوە و دیواخانی ئەگەڕا. پیاوماقووڵ و گەورەکانی بەغدا هاتوچۆیان ئەکرد و دۆستایەتییان لەگەڵا پەیدا کردبوو؛ وەکوو ئەوان ئەچوون، کوردەکانیش لە هەموو لایەکەوە وەکوو پوورەی هەنگ لێی کۆ ئەبوونەوە. شێخ مەحموو وەکوو ڕەوشتە چاکەکانی تری، پیاوێکی

ڕووخۆش و بەڕێز بوو؛ بۆ هەموو کەسێك، زیاتر بۆ کوردەکان. کە کوردێك ئەچووە لای، وەیا لە هەموو دەورێکیا کوردێکی چاو پێ ئەکەوت وەکوو خونچە بە دەمیەوە ئەپشکووتەوە.

جا لەو کاروانەیا ڕۆژێك لە دیواخانەکەی خۆیا لەگەڵ چەند کەسێك لەو پیاوە گەورانەی بەغدا دائەنیشن. یەکێك لەو پیاوانە زۆرتر وەختی لەگەڵ شێخا ڕائەبوارد. هەموو جار سەیری ئەکرد کە کوردێك دەرئەکەوت ـ بە تایبەتی ئەگەر ڕووتەڵەش بوایە ـ شێخ مەحموو زۆر بە سۆز پێشوازی ئەکرد و قسەی خۆشی لەگەڵ ئەکرد.

ئەو ڕۆژە هەندێك بە ڕانکوچۆخەی شڕەوە ئەچن بۆلای شێخ مەحموو و ئەویش ـ بە تایبەتی کە ئەو بێگانانە دانیشتوون ـ زیاد لە ئەندازە پێشوازییان ئەکا و بە دەوریانا دێت. هەمان پیاو ئیتر پێی هەڵناگیرێ ئەڵێ: «یا شێخ! ئەمە چییە وا تۆ ئەوەندە بە شانوباڵ و دەوروبەری ئەم ڕووتەڵانەدا دیت؟ پایە و شوێنی تۆ ـ کە پایەی مەلیکە ـ گەلێ دوورە لە شوێن و پایەی ئەمانەوە. کەواتە پێ ناوێ وا بەو جۆرە بچی بە دەمیانەوە!».

ئەویش تەنها بەم قسەیە وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ: «برام! ئەگەر ئەمانە ـ کە ئێستە تۆ ئەڵێی ڕووتەڵن ـ نەبن من مەلیك نیم؛ کەواتە ئیتر چۆن پێشوازییان نەکەم؟» کابرا و دانیشتووانی دیواخانەکە لەم وەڵامە بە جارێ ئەکەونە گۆمی فیکرەوە!.

**٢٣٣.** کابرایەکی کورد جارێك چێشتی برنج ئەخوا. چێشتەکە زۆر گەرم ئەبێ هەموو دەم و دانی ئەسووتێنێ و ئیتر جارێکیتر ناوێرێ توخنی برنج بکەوێ. ڕۆژێك تووشی کابرایەك ئەبێ گوێدرێژێکی بە بارەوە لە پێشەوەیە، لێی ئەپرسێ: برا باری گوێدرێژەکەت چییە؟ ئەڵێ: برنجە. ئەڵێ: «ئای بە قوربانە! لێی بکەوە، ئەگینا هەر ئێستە

پشتی کەرەکە ئەسووتێنێ».

٢٣٤. کابرایەك هەبوو کوڕێکی بێ گوێ و لاساری هەبوو؛ هەرچی ئەو ئەیوت کوڕە پێچەوانەی ئەکرد. بیوتایە بچۆ بۆ جووت، نەئەچوو. بیوتایە مەچۆ بۆ ئاش، ئەچوو. بیوتایە نان بخۆ، ئەوە نەیئەخوارد؛ بە کورتی هەرچی بوتایە ئەو وای نەئەکرد. بەم جۆرە کوناوەجەرگی کردبوو.

ڕۆژێك بارێ ئاردیان نابوو لە گوێدرێژێك و لە ئاش هاتبوونەوە، گەیشتنە ناو ئاوەکەی «بوارەپان». بارەکە لار بووبووەوە، وەختبوو بکەوێتە ئاوەکە. باوکەکە تۆزێ دوور بوو لە بارەکەوە ڕۆحی چوو: ئەگەر ئێستە ئەڵێم بەم هەتیوە بارەکە ڕاست کەوە با نەکەوێتە ئاوەکەوە، ئەترسم بچێ بیخاتە ئاوەکەوە. لە دوورەوە بانگی کرد: «ئا ڕۆڵە! پاڵێ بەو بارەوە بنێ با بە تەواوی لار ببێتەوە و بکەوێتە ناو ئاوەکەوە».

کوڕە وتی: «بابە بەخوا تا ئێستە گەلێ بێقسەییم کردوویت، ئیتر خوا غەزەبم لێ ئەگرێ، وەڵڵا ئەمجارە بەگوێت ئەکەم و لە قسەت دەرناچم». پاڵێکی نا بە بارەکەوە تا باوکی وتی: کورە نەکەی، هەتیو بارە ئاردی خستە ئاوەکەوە.

٢٣٥. کابرایەك کوڕێکی هەبوو؛ ڕۆژێك کوڕەکەی لەگەڵ چەن منداڵێکیترا ئەچن بۆ سەیران. ئێوارە کە دێتەوە باوکەکەی لێی ئەپرسێ: ڕۆڵە چیتان کرد لەو دەشتە؟ ئەڵێ: «وەڵڵا بابە بە هەموومانەوە منمان گا!».

٢٣٦. حەمەعەلیعەجەم ئەیوت کابرایەکی کورد دایکی سوار گایەك کردبوو لە گاکەی ئەخوڕی و ئەیوت: «وەحە! لە سەربارەکەت بەم».

**٢٣٧.** وەستا «بَشیر مُشیر» ساڵێك لە بەغدا ئەچێ بۆ سولەیمانی، دوو لە کوڕەکانی لەگەڵ ئەبێ. فایەق بێکەس لێی ئەپرسێ: مامۆستا ئەم کوڕانەت ناویان چییە؟ ئەڵێ: هوشیار و شاهۆ. ئەڵێ: بڕوا ئەکەی لە بەغدا پێیان ئەڵێن: «هشام و شامل». ئەڵێ: «ئاخر لەوێ وایان پێ ئەڵێن، بەڵام لێرە ناوم ناونەتە هوشیار و شاهۆ». ئەڵێ: «کەواتە کە چویتە کەرکووك ناویان بنێ زەینەڵ».

**٢٣٨.** کابرایەکی کورد ژنێکی هەبوو، هەموو جار بە دارێکەوە بەر ئەبووە سەروگوێلاکی و دایئەپڵۆسی و کابراش هیچ دەرەتانێکی نەبوو. فیکری کردەوە بچێتە لای مەلا شکات لەم ژنەی بکا.

مەلایەك لە گوندەکەیانا بوو، چوو بۆلای. کە گەیشتە بەر قاپی ماڵی مەلا، سەیری کرد لە ژوورەوە زرم و کوتە و مەلا هاتە دەرەوە و دەستی گرتووە بە سەریەوە. کە چاك تەماشای کرد تومەز مەلاژن بە قاپقاپێکەوە هاتووتە ویزەی مەلا و هەموو سەروبەچکی شکاندووە. کابرا کە ئەمەی دی لووس و باریك بە شوێنەکەی خۆیا گەڕایەوە.

لەو کاتەدا مەلا چاوی پێکەوت، بانگی کرد: وەرە برام بزانم ئیشت چییە؟ ئەویش وتی: «قوربان! دوعای سەری تۆ! هیچ ئیشم نەبوو». وتی: نا، بێ‌ئیش نیت کە هاتوویت. وتی: وەڵڵا ئەوی ڕاستی بێ حاڵم شڕ بوو بە دەست ژنەکەمەوە؛ هەموو جار بە داردەستەکێ تێروپڕم لێ ئەدا. وتم با بچمە لای مەلا شکاتی لێ بکەم. سەیرم کرد مامۆستا ئەمە حاڵیەتی، وتم کەواتە با بگەڕێمەوە». مەلا وتی: «بچۆ پێ بڵێ بەو کاولیە حەقی نییە بە داردەستەك لێت بدا، شەرع ئەفەرموێ: هەر هەقی قاپقاپیان هەیە و هیچی‌تر». کابرا وتی: کەواتە دەك موبارەك نەبێ.

٢٣٩. کابرایەکی کورد ئەچێتە ئەو «ئالان»ـە بۆ مێوژ کڕین. ڕێی ئەکەوێتە ماڵێك، ماڵەکە پیاویان لە ماڵەوە نابێ هەر ژنەکە ئەبێ. لێی ئەپرسێ: مێوژتان هەیە؟ ژنەش ئەڵێ: هەیە. پیاوەکە ئەچێ دائەنیشێ و ژنە نانی بۆ دائەنێ. لەو کاتەدا ژنەکە بایەکی لێ بەر ئەبێتەوە زۆر تەریق ئەبێتەوە. کابرا نان ئەخوا و لە پاشا ئەڵێ: مێوژەکە لە کوێیە بمدەرێ. ژنەش ئەڵێ: ئەوەتە لەو کەنووەدا، خۆت بچۆ هۆڕەکەتی لێ پڕ کە.

کابرا ئەچێ ئەنیشێ بە بەر کەنووەوە، مێوژەکەش تۆزێ شێی هەڵهێنابوو. کابرا بە ئارەزووی خۆی هۆڕ دائەگرێ و دارکوتی ئەکا، ژنەش لە تەریقی تڕەکە هیچ دەنگ ناکا و وا ورگیشی لە داخی بێ ئینسافی کابرا ئاوساوە؛ کابرا ئەوەندە بە سمڕسمڕ و بێویژدانانە هۆڕەکە دائەگرێ، کوتوپڕ ئەویش تڕێك ئەکەنێ. ژنە لە شوێنەکەی خۆی ڕائەپەڕێ و ئەچێ لە پشتەوە ئەنەوێ لە یەخەی کابرا و ئەیکێشێتە دواوە: «برام هەڵسە. تڕ بە تڕ، مێوژ نافرۆشم خۆ تۆ دیقت بە من کرد».

٢٤٠. لە خانەقی لە کۆڕێکا دانیشتبووین قسە لەوەوە ئەکرا کە خوا هەر وەعدێکی دا، بەجێی دێنێ؟ لەمەوە قسە چووە سەر ئەوە ئەو کەسانە کە کافرن و ئیشی خزمەتی ئینسانییان کردووە، ئایا ئەبێ بچنە جەحەنەم؟ وەکوو ئەو کەسە کە کارەبای داهێناوە بەم خزمەتەی تۆ بڵێی خوا لێی خۆش ببێ؟

مەلا عارفی مەلا یەحیا لە سەرەی قسەدا وتی: «فڵانی ئەگەر خوا پرس بە من بکا بۆ لێخۆشبوونیان، من فتوا ئەدەم کە لێیان خۆش ببێ».
منیش وتم: «کەواتە من پێی ئەڵێم پرست پێ بکا».

٢٤١. مەلا مەحمووی حاجی عەلی هەبوو لە سولەیمانی، ڕۆژێك بە بازاڕا ئەڕوا سەیر ئەکا وا منالێکی شارباژێری دوو بار داری داوەتە پێش خۆی و ئەیفرۆشێ. مەلایش لێی نزیك ئەبێتەوە پێ ئەڵێ: «یا وەلەدی! ئەو دوو حەملە حەتەبە بەو دوو حیمارە ئەسوەدەوە کە بەو دوو حەبلە ئەسوەدە شەد کراوە بە چەند قرووشی خالسەی مەسکووکە قەناعەتت حاسڵ ئەبێ؟ تا سەمەنەکەیت تەسلیم کەم». کوڕەش ئەڵێ: «مامە حاجی نازانم چی ئەڵێی؟» مەلا فەرمووی: «اسکُت یا ولد! حاجی رافزیـە».

٢٤٢. مەلا سـەعید لە سولەیمانی تووشـی هەڵامەت بووبوو. لێیان پرسـی: مـەلا ئەفەنـدی هەڵامەتەکەت چۆنـە؟ ئەویـش وتی: «قەتعی ڕەئسم بووە، وەلاکین سەیلانی ئەنفم هەر جارییە».

٢٤٣. کابرایەك هەبوو فێر بووبوو ئەچووە هەر حەمامێك کە ئەهاتە دەرەوە ئەیـوت شتێکیان لـێ دزیـوم، بـەم بیانـووەوە پارەی حەمامەکەی نەئەدا. ڕۆژێك ئەچێتە حەمامێك، تا دێتە دەرەوە کابرای حەمامچی هەچ جلوبەرگێکی هەبوو هەمووی لێ دزی تەنها پشتێنەکەی بۆ هێشتەوە.

کابرا هاتە دەرەوە سەیری کرد هیچی نەماوە پشتێنەکەی نەبێ. هێنای پشتێنەکەی لە سەر گۆشت لە پشت بەست و هەموو خەڵکی حەمامەکەی بانـگ کـرد و کـۆی کردنـەوە و چـووە بەردەمیان وتـی: «خەڵکینە! ئێوە و خواتان من بەم جۆرە هاتووم بۆ حەمام؟».

٢٤٤. کابرایـەك لـە میحرابی مزگەوتێکا خەریك بوو کەرێکی ئەگا. لەو کاتەدا کابرایەکی‌تر چوو بە سەریا تفێکی لێ کرد و وتی:

هیچ شوورەیی ناکەی لە ماڵی خودادا ئیشی وا ئەکەی؟ کابرای کەرگێش وتی: «ئا تۆ سەبرم لێ بکە تا لەم ئیشە خێرە ئەبمەوە، با هەروا تۆ تفت کردبێ لە ماڵی خوا».

**٢٤٥.** فەقێیەك لە شوێنێك ئەبێ، فەقیەکانی‌تر نایانەوێ ئەو فەقێیە لەوێ بمێنێ؛ بە هەرجۆرە جوابکردن جوابی ئەکەن ناڕوا. ڕۆژێك فەقێکە ئەچێ بۆ دەستنوێژ، تا دێتەوە بوخچەکەی بۆ ئەپێچنەوە و لە بەر قاپییەکە دایئەنێن. کە دێتەوە و چاوی بە بوخچەکەی ئەکەوێ، لەوێ هەڵیئەگرێتەوە و ئەیهێنێتەوە ژوورەوە و ئەڵێ: «ئەمە چییە؟ ئەم جۆرە گاڵتانە لەگەڵ پیاو ئەکەن؟».

**٢٤٦.** ئەحەی جاو هەبوو لە سولەیمانی حەلوای ئەفرۆشت. ڕۆژێك بە تەبەقە حەلواکەیەوە ئەچێتە سەر حەوزەکەی مزگەوتی شێخ باباعەلی بۆ دەس و دەموچاو شتن. شێخ بابەعەلیش لە بەردەمی حوجرەکەی خۆیا دانیشتبوو، ژن و مێردێك هاتبوونە لای ئەیانویست جیا ببنەوە. بابەعەلیش گەلێك لەگەڵیان خەریك بوو بۆ ئەوە ڕێ کەونەوە، هیچ کەڵکی نەبوو. ئینجا ئەحەی جاو لە دوورەوە هەڵیدایە بە دەنگە نەرمەکەی و لە سەرخۆ وتی: «مامە شێخ بابە عەلی! ئەوە بۆچی سەری خۆت ییئشێنی؟ ئەمانە وا دیارە نانی هارییان گرتووە بە دەمەوە، بۆیە ڕێ ناکەونەوە». ڕووی کردە ژن و مێردەکەش وتی: چەتیو و چەتیوینە! ڕێ ئەکەونەوە ڕێ بکەونەوە، ڕێ ناکەونەوە بە کێری مامە شێخ بابەعەلیمەوە. وەڵڵا بابەعەلی و ژن و مێرد دەستیان کرد بە پێکەنین. ئەم پێکەنینە بوو بەهۆی ڕێکەوتنەوەی کابرا و ژنەکەی و لێیان دا ڕۆیشتن.

**٢٤٧.** هۆبەیەکی کورد بە دەم لەوەڕی بەهارەوە تازە گەیشتبوونە کوێستانی شاقەڵا و لەوێ خستبوویان. پیاوێك لە خۆیان ئەنێرن بۆ مەولاناوا بۆ ماڵی شێخ حەسەن کە سبەینێ عەشرەت دێن بۆ زیارەتی شێخ. کابرا وەختی نیوەڕۆ ئەبێ، ئەگاتە سەر حەوز و بەردەنوێژەکانی مەولاناوا. ئەبینێ ئەوە زەلامێکی زۆر بە دەوروبەری حەوزەکەدا دانیشتبوون دەست و دەموچاویان ئەشۆن و هەریەکە شتێکی درێژکەلەیان بە دەستەوەیە دانیان ڕیچ ئەکەنەوە و ئەیکەن بە دەمیانا و دانیانی پێ تێژ ئەکەنەوە.

کابرا کە ئەمە ئەبینێ هەروا ئەحەپەسێ، ئیتر بەبێ چرپە و بەبێ قسە ئەگەڕێتەوە بەرەو دوا بۆ ناو عەشرەت؛ جارجاریش لا ئەکاتەوە نەوەك بێن بە شوێنیا. خێڵ دەوری لێ ئەدەن و ئەڵێن: عەرزی شێخت کرد وە فیدای بین؟ ئەڵێ: «عەشرەت! شێخی چی و شتی چی؟ شێخ بیستگیە کە ئێمە هاتگین و ئەچین بۆ زیارەت ڕوحم وە قوروانی وێ!- ناردگیەسی پڕ ئەو دەشتە زرتە بۆز، زرتە بۆزیش بەڵمە برنجی هاوردگە هەریەکە هەسانە فیقنەیەکی داگە وە دەستیانەوە لەسەر حەوزەکە گشتیان دگانیان ڕیچ کردگەسەوە وە هەسانە فیقنەکە دگانیان تیژ ئەکردەوە بۆ ئەوە کە ئێمە چوویـن وە جارێ گشتمان بخۆن و قەڵاچۆی عەشرەتی میروەیسی بوورنەوە. گووی نەنکیان ئەخۆن، وە سەری ئەو شێخە ئێمە وێ و پێمان ناچێتە ئەو ئاواییە».

ئەمە ئەم کابرایە بەم جۆرە گێڕایەوە بۆ عەشرەت کەچی تومەز ئەمە سۆفی و مرید بوون لەسەر حەوزەکە دەستنوێژیان شۆردووە و سیواکیان بە دەستەوە بووە سیواکیان کردووە.

٢٤٨. کابرایەکی کورد هەموو جارێ گوێی لێ ئەبوو کە مەلا لە وەعزەکەیا ئەیوت: هەرکە ڕۆژی عەرەفەی جەژنی قوربان بەڕۆژوو بێ، وەکوو ئەوە وایە کە ساڵێك بەڕۆژوو بێ. ڕۆژێك عەرەفە هێنای بە ڕۆژوو بوو تا نیوەڕۆ، پاشان شکانی. وتیان بۆچ شکانت؟ وتی: «برا شەش مانگم بەسە».

٢٤٩. کابرایەك هەبوو هەموو جارێ کە باسی مەلای پێنجوێن ئەکرا کە پیاوێکی عالم و شاعیرە، تووڕە ئەبوو ئەیوت: بۆچ هەر ئەو شاعیرە ؟ دەسا شەرت بێ ئەبێ من بچم بۆڕی بدەم؛ لێی دا چوو. مەلای پێنجوێن لە کۆڕێکا دانیشتبوو، وتی: مەلا من هاتووم شەڕە شیعرت لەگەڵ بکەم یا بۆڕم ئەدەی یا بۆڕت ئەدەم. مەلاش فەرمووی: فەرموو بڵێ. کابرا وتی:

**مەلاوڕەحمان مەلاوڕەحمان مەلاوڕەحمان پێنجوێن ڕا**

**زەڕ بەر سەر فولاد نەهی نەرم شەوەد ڕا**

مەلا فەرمووی برا بڕۆ.

٢٥٠. مامە حەمە هەبوو لەو شارەزوورە پیاوێکی بە دین و لە خوا ترس بوو. ڕۆژێك لە مزگەوتا نوێژی ئەکرد، خەڵکەکەش لە گۆی‌ئاگردانەکە دانیشتبوون هەروا باسی ئەوەیان ئەکرد مامە حەمە نوێژ قایمە. ئەویش نوێژەکەی بڕی و وتی: «لەگەڵ ئەوەدا بەڕۆژووشم».

٢٥١. مەلا مەحمووی حاجی‌عەلی لە سولەیمانی ڕۆژێك لە کۆڵانێکا ئەکەوێتە چاڵێکەوە ناتوانێ بێتە دەرەوە، ناچار هاوار ئەکا. وا ڕێ ئەکەوێ لەو وەختەدا حەماڵێك بەوێدا ئەڕوا. حەماڵەکە گوێی لە دەنگەکە ئەبێ، سەر ئەکێشێتە چاڵەکەوە مەلا مەحمووی چاو پێ‌ئەکەوێ،

ئەڵێ: «یا حەماڵ ئیبن موسلم! بۆم ڕایەڵە حەبلێکی غەلیزی مەتین لە شەعری مەرەز شەدم کە بە شەدێکی ناعیمی بلا ئەزیەت، جەزبم کە بە جەزبێکی خەفیفی ئەهوەن با لە قەعری ئەم بیری پڕ لە مەزلەمەتە بێمە دەرەوە».

حەماڵ کە گوێی لەمە ئەبێ ئەڵێ: «دەستت بە گونم بۆ خۆت و بۆ تورکی قسە کردنت؛ بیخۆ ئەوە جێگەتە» و لێ‌ئەدا ئەڕوا.

٢٥٢. هەر ئەم مەلا مەحموودە، مەلایەك لە سولەیمانی نەخۆش ئەبێ ئەچێ بۆ چاوپێکەوتنی. ئەچێت و کوڕی مەلاکە دێت بە پیریەوە لێی ئەپرسێ: «ئیبنی حاڵی والیدت چۆنە؟» ئەڵێ: هەردوو قاچی وەرەمی کردبوو. ئەڵێ: «ئیبنی بڵێ: "وَرَمَت رِجلاهُ"». ئەڵێ: چی‌تر؟ ئەڵێ: وەرەمەکە دابووی لە ئەژنۆکانی ئەڵێ: «ئیبنی بڵێ: "وَصَلَت إلی رُکبتَیهِ". ڕۆڵە تۆ کوڕە مەلایت قسە بە غەڵەت مەکە». ئەڵێ: لە پاشا کوڕەکە ئەڵێ: «لە پاشا مرد و سەری چوو بە قەبری بابی تۆ و "سیبویە"ی و "نَفطَوَیە"یدا».

٢٥٣. کابرایەکی کورد باسی عشقێنی خۆی و ژنەکەی ئەکرد ئەیوت: «هەتا دوێنێ بوو خەوم بەماڵەکەیەوە ئەبینی، ئەگەر جارێك سەیری بکردمایە ئەوە خۆراکی ساڵێکم بوو. ئەگەر لە شوێنێ تووشی یەك ببووینایە بە باڵای یەکمانا هەڵئەدا. بەڵام ئەمانە ئێمڕۆ هیچیان نەماون، هەر لنگ بەرزەوە کردنە و داوای مناڵ کردن».

٢٥٤. شێخ محەمەدی شەشوولەیی پەڵە گەنمێکی هەبوو لەو دەشتی دزەییە. ڕۆژێك ئەچێ بۆ لای گەنمەکەی سەیر ئەکا وا لە نزیك گەنمەکەی ئەوەوە شوانێك خەریکە بلوێر لێ ئەدا. ئەمیش

بانگی ئەکا ئەڵێ: «ڕاعی، ڕاعی! ئەو سەوتە حەزینە لەو نایە ڕەقیقەوە بە ئەنغامی شەفەتەینانە؟ یا بە تەحریکی ئەسابیعانە؟» شوانەش ئەڵێ: «مامۆستا بە سەری تۆ پێی مەڕی من نەچووەتە ناو دەغڵی تۆوە». مامۆستاش ئەڵێ: «"ماشاءالله" جەهل عەجاییە».

**٢٥٥.** هەر ئەم شێخ محەمەدە ژنێك ئەچێتە لای نوشتە بۆ کوڕێکی بکات. شێخیش نوشتەی بۆ ئەکا و پێ ئەڵێ: «بڕۆ ئەم دوعایە بەرە موشەمەعی کە بە جەڵدێکی "اخضر" موخیتی کە بە خەیتێکی "ابیض" لە فەوقی ڕەئسی تیفلەکەی موعەللەق بکە». ژنە ئەڵێ: «مامۆستا نوشتەکەت خوێند، چی لێ بکەم؟» دیسان مامۆستا ئەڵێ: «"ماشاءالله" جەهل عەجاییە».

**٢٥٦.** کابرایەکی دەوروبەری ڕواندز ڕۆژێك ئەچێتەوە و ئەم قسەیە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: «نوکەلە و واکە واکێك لەسەر واکێك بوو هەر واکە واکی بوو. واکم واك کردی، واکم کرد چە واك نەبوو. پێی واك کەم واك بوو».

شوانێکی زراری ئێوارێ مەڕ دێنێتەوە بۆ ناو ماڵ و بانگ ئەکا: «هۆ ماڵی واکێ! واکتان زایە دوو واکی هێنایە، هەر واکە واکیتیان. بچن بیهێننەوە». ئیتر ئەو ماڵە لێی تێ ئەگەن کە ئەمە لەگەڵ ئەوانیەتی، ئەچن مەڕەکە ئەهێننەوە سەیر ئەکەن دوو بەرخی بووە».

**٢٥٧.** مەلایەك هەبوو چووە لای حاجی مەلاعەبدوڵلای کۆیە وتی: «قوربان! بەقەرەیەك چووە ناو مەزرەعەیەك و تەخریبی هەموو مەزرەعەکەی کرد. مالیکی مەزرەعە مەددی یەدی کرد بۆ ئەخزی حەجەرێك و حەجەرەکەی ڕەمی کرد بۆ عونقی بەقەرە و بەقەرەکە

مەقتوول بوو. «أَ ضَمِنَ» مالیکی مەزرەعەکە بە دیەی بەقەرەکە ئەم لا؟ حاجی مەلاش ئەڵێ: «بە سەری خۆت ئەگەر هەڵنەستی بچی ئەم دروێنەیە لە شوێنیکە بکەی، لا».

**٢٥٨.** کابرایەکی جاف لەو بناری «هۆبەتوو»ە بوو بە میوانی ماڵێك. ماڵەکە دوو سەگی ئێجگار دڕیان هەبوو؛ کابرا لە ترسی سەگەکان پێش نوستن نەیوێرا بچێتە سەر پێشاو. شەوێ گوو زۆری بۆ هێنا و ناشوێرێ بچێتە دەرەوە؛ لەوانەبوو بشیکا بە خۆیا. هیچ چاری نەدۆزیەوە لەوە زیاتر نەبێ کە ماڵەکە منالێکیان لە بێشکەدا هەبوو، هەستا بە دزیەوە چوو دەسرازەی منالەکەی کردەوە و پڕ گۆزەڵەی منالەکەی کرد لە پیسایی.

زۆری پێ نەچوو بۆن و بەرامە ژوورەکەی پڕ کرد. باوك و دایکی منالە خەبەریان بووەوە. لەم بۆنە پیسە زۆر سەرسام مان، کە منالەکەیان کردەوە گۆزەڵە ئێقی کردووەتەوە؛ وتیان: ئەم منالە تا ئێستا وای نەکردووە، ئەمە ئیشی منالْ نییە. کابراش لە ژێر جێگەکەیەوە گوێی لە قسەکەیان بوو هەڵیدایە وتی: «برا تا ئێوە سەگی وا دڕتان ببێ منالْتان لەوە زۆرتریش پیسایی ئەکا».

**٢٥٩.** یەکێ لە سانەکانی هەورامان ڕۆژێك لەگەڵ مەلادا هەروا ئەچنە دەرەوە بۆ قەراخ ئاوایی و بەلای پەڵە زەوییەکی مەلادا تێ ئەپەڕن. سان خەبەری زەوییەکە لە مەلا ئەپرسێ. مەلاش ئەڵێ: «جەنابی سان! ئەم قەتعە ئەرزە کە واقیع بووە لە بەر مەددی نەزەرتانا لەبەر ئەوە ئەم سەنەیە مەشئوومە قەترانی مەتەر لە ئاسمانەوە نزوولی نەبووە و لەبەر ئەوەش کە بەعیدە لە عەینولمائی قەریەکەوە،

بوو بە ئەرزێکی قاحل و بە غەیرە مەزرووعی لەسەر حاڵی سابیقی دەوامی کرد».

سان هیچ لە قسەکانی تێنەگەیشت وتی: «ئانە چێش مەواچی؟» مەلا بە هەرجۆر بوو تێی گەیاند ئینجا وتی: «ئانە چێشەن؟ واچە نەکاڵیان و بڕیاوە».

٢٦٠. کابرایەك هەبوو لە سولەیمانی «حەمەی نازێ»ی ناوبوو. ئەم حەمەی نازێیە لەو دیوی گردەکەی «زێڕینۆك»ـەوە بەرەجووتی زەوی هەبوو؛ هەموو ساڵێ ئەیکێڵا و بەوە ئەژیا. ئەم کابرایە ئەوەندە تێنوو بوو بە باران ئەگەر دنیا ئاو بیبردایە ئەو هەر ئەیووت: «ناشوکری نەبێ! ئیمساڵ باران نییە، ساڵ، ساڵی پار بوو». کە ئەکەوتە ساڵێکیتر چەشنی پێشوو بنێشتە خۆشەی بن دانی هەر ئەوەبوو ئەیوت: «ناشوکری نەبێ ئیمساڵ باران نییە؛ ساڵ، ساڵی پار بوو».

٢٦١. کابرایەکی عەلاف گەنم و جۆیەکی زۆری هەبوو؛ هەڵیگرتبوو بۆ گرانی. بە ڕێکەوت ئەو ساڵە باران تۆزێ دواکەوت و کابرا لە دەماخا بوو. ڕۆژێك کوتوپڕ هەورێکی هێنا و وردە باران دایکرد. کابرا دەماخی شکا و لە تاو دلگرانی خۆی چووە ژوورەوە. دڵی بڕوایی نەئەدا کە بێت و بارانەکە ببینێ. کوڕێکی هەبوو هەموو جار ئەینارده دەرەوە پێی ئەوت ئا ڕۆڵە بچۆ بزانە ئەبارێ یا نابارێ؟ کوڕەش ئەهاتەوە ئەیوت باوە وردەوردە ئەبارێ، شتێکی وا نییە. جارێکیان ئیتر کابرا ئارامی لێ هەڵگیراو وتی: «ڕۆڵە ئەو وردە وردەیە چاوی باوکتی کوێر کردووە».

٢٦٢. مەلا عومەری ڕەش، لە حەسار کوڕێکی هەبوو، حەمەی ناو بوو. حەمە ئەچێ میز ئەکا و دێتەوە، باوکی ئەڵێ: «محەمەد

کوڕم! چوویتە سەر "مِرحاض"؟» ئەویش ئەڵێ: «ئا». ئەڵێ: «گووت کرد؟» ئەڵێ: «ئا». ئەڵێ: بە سەری بابت؟ ئەڵێ: بە سەری بابم.

٢٦٣. مەلایەك هەبوو مەلا سمایلی ناوبوو. تووشی کەسێك ببوایە بیویستایە یەکتری بناسن، کوتوپڕ سەلامێکی لێ ئەکرد پێی ئەوت: من سمەم ناوە و کوڕی ئەحەم،ماڵمان لە کونەکۆترە؛ فلانە کتێب ئەخوێنم لە فلانە مزگەوت و لەلای مامۆستای فلان دێ. تۆ ناوت چییە و چی ئەکەی؟.

٢٦٤. کابرایەك بەردوئەستێیەکی هەبوو. لەناو کوڕگەلا دانیشتبوو شانازی پێوە ئەکرد، ئەیووت: بەردوئەستێی من یەکەوجار ئەیگرێ. کوڕگەلیش هەریەکە بە شان و باڵی بەردوئەستێی خۆیان ئەهاتن. لەم قسانە ئەم تووڕە بوو هەڵیکێشایە بەردوئەستێ و وتی: «تەڵاقم کەوتبێ ئەبێ بیگرێ»؛ کەچی نەیگرت. ئەمجا دەستی ڕاست کردەوە و وتی: «دەسا تەڵاقم کەوتبێ ئەمجارە نایگرێ»؛ کەچی گرتی. وتی: «بەر یەکدی کەون».

٢٦٥. شایی بوو؛ هەرا بوو؛ هەڵپەڕکێ و زەماوەن بوو. کابرایەك بە کزێکەوە لەولاوە دانیشتبوو، دەستی خستبووە ژێر چەناگەی. کابرایەك چوو پێی وت: شاییە. وتی: «بە من چی». وتی: بۆ تۆیە. وتی: «بە تۆ چی!».

٢٦٦. کۆڕێك بوون لەلای من دانیشتبوون باسی پۆستەی میسر و عێراق ئەکرا. کە کاغەز لە عێراقەوە ئەچێ بۆ میسر و پوولی پۆستەکەی ١٤ فلسە؛ کەچی لە میسرەوە دێ بۆ عێراق و پوولەکەی ١٥

فلسە. ئەو فلسە زیادەیە ئەبێ لەبەر چی بێ؟

یەکێك لە کوڕەکە بوو شێخ عەبدوڵڵای ناو بوو، بە هەموو ساردییەکەوە وتی: «هەڵبەت لەبەر ئەوەیە کە لەوێوە بۆ ئێرە سەرەوژوورە، بۆیە ئەو فلسە زیادەیە وەرئەگرن».

٢٦٧. حوسێن قەرەداغی لە بەغدادا لە شوێنێك دائەنیشێ و لەولاوە ڕاست ئەبێتەوە ڕوو ئەکاتە شێخ حوسێن و ئەڵێ: «کەر، هەی کەر». ئەمیش بەبێ قسە هەڵئەستێ خێرا تەوقەیەکی لەگەڵ ئەکا و ئەڵێ: حوسێن قەرەداغی!.

٢٦٨. من هەر لە بەختانمە ئەم جۆرە شتانە بێتە ڕێم. حامدبەگی جاف زۆر کەم قسەی ئەکرد و ئەیکا؛ کە هاتە قسە قسەیەکی وا ئەکا هەر تەواو جێ‌گرە. لەگەڵ حامدبەگا بەلای خۆمانەوە زۆر دۆست بووین. لە ئوتۆمۆبێل گلابوو، نەچووبووم بۆ سەرخۆشی. ڕۆژێك بە تەلەفۆن سەرخۆشی و چاك و چۆنیم لەگەڵ کرد، وتم: سەرەتا نەمزانیبوو، پاشان ماڵە تازەکەشتانم نەئەزانی، بۆیە نەهاتم بۆلات. وتی: فڵانی ئەم قسانەت لێ وەرناگرم، ناچێتە دڵمەوە. وتم: تۆ لەوە گەڕێ ئێستە خۆ شوکر چاکی؟ وتی: «شوکر سێ پەراسووم شکاوە و شانێکم دەرچووە، زۆر چاکم». ڕاستی ئیتر من هیچم پێ نەما.

٢٦٩. مەلایەك هەبوو لەو دەشتی دزەییە. کوڕێکی لاساری هەبوو؛ هەرچەند پێی ئەوت بخوێنە، ئەو بەگوێی نەئەکرد؛ وایان لێ هاتبوو دانیان لە یەك سپی بووبووەوە. ڕۆژێك لە لاکۆڵانێکا کوڕەکە بەگیر دێنێ و ئەم گفت و لفتەی لەگەڵ ئەفەرموێ:

«بە خۆم و بە عەسای یەدم و مەخمەرەی سەرم، لەبەر من نەبوایە "عَضرَفُوت"ـێك ئەكلی ئەكردی. كەچی ئێستاكەش پشتی دایەتە جیدارەكەوە ئەڵێ: "واللّٰه لا أقرأ"».

٢٧٠. شێخ تۆفیق هەبوو ڕۆژێك ژنێك بۆ نوشتە كردن ئەچێتە لای. لە كاتی قسە كردنا ژنەكە پێی ئەڵێ: «مامۆستا تێ گەیشتی؟» شێخ هەر زۆر خراپ توورە ئەبێ و پێی ئەڵێ: «مردووت مرێ! من لە بەستی شەرح مەواقف و شەرح تەجرید تێ گەیشتووم، ئێستە لە قسە دەڵە قۆڕێكی وەكوو تۆ تێ ناگەم؟» ژنەش لەم ناوانە و لەم قسانە سەری سووڕ ئەمێنێ و وەكوو گوێزی بۆ بژمێرن وا ئەبێ.

٢٧١. ڕۆژێك لە دیواخانێكا باسی نان بدەیی و بەخشندەیی ئەكرێ. شێخ قادری تاڵەبانی ئەڵێ: كورە بەخشندەیی كەریەتییە. مامە شێخ «فَیضُ اللّٰه»م چونكە ژیرە بزانە نانێك بە كەسێك ئەدا؟.

٢٧٢. ژنێك هەبوو هەموو شەوێك دیزەیەك ئاوی ئەخستە تەنوورەكەوە بۆ مەلە كردنی ئیشی خێر. كە دیزەكەی دائەهێشتە تەنوورەكەوە ئەیوت: «ئەگەر بوو، بوو؛ ئەگەر نەبوو ئاوی هەویر».

٢٧٣. ساڵێك پشێوییەك كەوتە سولەیمانییەوە. لەو پشێوییەدا پیاوێك هەبوو «حاجی عەلی كۆڵەك»یان پێ ئەوت و پیاوێكی دەوڵەمەند بوو. ویستی چەند دووكانێك دروست بكا. پیاوێكی ئاسنگەری هێنابوو بۆ ئەوەی ئاسنەكانی لەسەر دیوارەكەوە بۆ دامەزرێنێ. پێی وتبوو: ئەم ئاسنانە جووت جووت بخاتە پاڵ یەك. ئاسنگەرەكە لە ئیشی خۆی بووەوە، حاجی چوو سەیری كرد، تەماشای كرد ئاسنەكان یەكە

یەکە دانراون. بە ئاسنگەرەکە ئەڵێ: وەستا بۆچ وات کردووە؟ من پێم نەوتی جووتەجووتە دایاننێ؟ وەستاش ئەڵێ: «حاجی ئەم قسە کردنەی پێ ناوێ، لە پاش ساڵێکی‌کە ئەم دووکانانە ئەبن بە هی ئێمە؛ کەوابوو من خۆم ئارەزووم کرد کە وابێ، تۆ بۆچ ئەوەندە دڵت پێ ئەسووتێ؟» حاجیش ئەڵێ: «دڵم بە دووکانەکان ناسووتێ، دڵم بەو قەومە ئەسووتێ کە پیاوی وەکوو تۆی تیایە. ئەو پیاوە کە من پێی ئەڵێم بە پارەی من دووکان بۆ خۆت دروست کە؛ کەچی ڕازی نابێ چاکی دروست بکا؟».

٢٧٤. کابرایەك بە ڕێبواری ڕێی ئەکەوێتە ماڵە گۆڕانێك. شەو نان دائەنێن، کابرای میوان هەتا لووتی دێتەوە ئەخوا؛ هیچ نامێنێ. کابرای خانەخوێ بانگ ئەکا: ئا کچە نان بێنە. نانی‌تر دێنن. میوانە ئەویش ئەخوا. کابرا ناچار بانگ ئەکا نانی‌تر بێنن ـ نان نەماوە ـ ژنی خانەخوێکە ئەچێتە ماڵە دراوسێی پانزە بیست نانێکی‌تر بە قەرز دێنێ دایئەنێ. میوانە ئەویش ئەخوا. لە پاشا کە هیچ نامێنێ، چار ناچاری دەست هەڵئەگرێ. لە دەمەدەمی نوستنا کابرا هەڵئەستێ بڕوا خانەخوێکە ئەپرسێ: «برا بە خێر ئەوە بۆ کوێ ئۆغر بێ؟» ئەویش ئەڵێ: «ئۆغرت خێر بێ! بەخوا مەعیدەم گیراوە، هیچم پێ ناخورێ. ئەچم بۆ سەر حەکیم». کابرا ئەڵێ: «کەواتە تکایەکت لێ ئەکەم، کە هاتیەوە بە لایەکی‌ترا بچۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان».

٢٧٥. فەقێیەکی ئەو موکریانە بە ناوبانگی مەلای قەرەداغەوە بەسەر سولەیمانیدا دێت و ئەچێ بۆ ئەوێ بۆ خوێندن. لە پاش شەوێك خێرا ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی کە بچێتەوە بۆ وڵاتی خۆی. کە لێی ئەپرسن بۆچ وا خێرا گەڕایتەوە؟ ئەڵێ: بە قوڕم گرتەوە وڵاتی وا،

من چۆنی لێ دائەنیشم؟ ئەڵێن: بۆچی؟ ئەڵێ: «کاولم کردەوە! کورە بە بۆقلەموون ئەڵێن عەلیشیش». پێی ئەڵێن: بابە تۆ دەخڵت چییە بەوەوە کە بە بۆقلەموون ئەڵێن عەلیشیش؟ ئەڵێ: «کاولم کردەوە، قورعان وا بێ و سوێن وا بێ من شەو لەو وڵاتە ڕۆژ ناکەمەوە کە بە بۆقلەموون بڵێن عەلیشیش».

٢٧٦. کابرایەکی دەرۆزەکەر لە بەر قاپی ماڵێکا ڕاوەستابوو داوای شتی ئەکرد. مناڵێك لە ماڵەکە هاتە دەرەوە پێی وت: «خوا بتداتێ». کابرا وتی: «ئەی دەم و لەوست خواتەوە، تەماشاکە چۆن هەر لەم مناڵییەوە فێری فلتەفلت ئەبێ».

٢٧٧. پیرێژنێکی پشت کۆماوەی پۆپ سپی ئەچێتە لای حەکیمێك ئەڵێ: «پشتم ژان ئەکا». حەکیمەکە ئەڵێ: هی پیرییە. پیرێژن ئەڵێ: چاوم کز بووە، کەم شت ئەبینم. حەکیم ئەڵێ: هی پیرییە. پیرێژن وتی: گوێم کەڕ بووە. وتی: هی پیرییە. پیرێژن وتی: دانەکانم کلۆر بوون و هەموو کەوتوون. وتی: هی پیرییە. پیرێژن لەمانە زۆر تووڕە بوو دەستی کرد بە لاسایی کردنەوەی حەکیمەکە و وتی: «یە، یە، یە!». حەکیمەکەش وتی: «دایە ئەوەش هەر پیرییە».

٢٧٨. کابرایەك لەو خوارە چووە شار و زۆری برسی بوو، هیچ پارەشی پێ نەبوو. بە بەر چێشتخانەیەکا تێپەڕی، بە تەواوی ئیتر نەیتوانی بڕوا. چووە ژوورەوە بۆیان دانا و تێروپڕی خوارد. پاشان هەستا هاتە لای کابرای خاوەن چێشتخانە و وتی: «ئەرێ برا ئەگەر یەکێ پارەی پێ نەبێ و بێتە ئێرە چی لێ ئەکەن؟» کابرا وتی: «ئەوی پارەی نەبێ نایەتە ئێرە». وتی: ئەوا وتمان پارەی نەبوو هاتیش». وتی: کەوا و

سەڵتە و سەروپۆتەڵاکی لێ ئەکەینەوە و دەریئەکەینە دەرەوە. وتی: ئەگەر کەوا و سەڵتە و شتیشی لە بەرا نەبوو چی لێ ئەکەن؟ ئەویش وتی: چی لێ ئەکەین؟ ئەیگرین دوو شەقی تێ هەڵئەدەین و ئەیکەینە دەرەوە. ئینجا کابرا پشتی هەڵکرد وتی: دە براکە دوو شەقەکە لە من هەڵدەن و بمکەنە دەرەوە.

## ٢٧٩. ئەم دوو سێ قسەشە بۆتۆ، یا بۆ ئوتۆمۆبێلەکەی تۆ:

ئەگەر چوویتە بەغدا بە فیزێکەوە، وەیا بە گێلە گێل بەناو بازاڕ و کۆڵانا ئەگەڕایت، کوتوپڕ سەیرت کرد دوو کەس لێیان بووە بە مڕومشت، سەعاتێکی زڕقوبرقیان بە دەستەوەیە، یەکێکیان بە کوردی وەیا بە زڕە کوردی قسە دەکا، هاتن بە لاتەوە. زڕە کوردەکە وەیا ئەویکەیان وتی: «خاڵە ئەم کابرایە هەندێ پارەی لامە ئێستە ئەیەوێ سەعاتەکەم لێ بستێنێ لە باتی نیوەی پارەکەی؛ لەگەڵ ئەوەدا سەعاتەکەی من دوو ئەوەندەی پارەکەی ئەو یێنێ. وەیا وتی: ئێمە لێك تێناگەین من کوردم و ئەو عەرەبە تۆ بیە بە دیلماجمان و ڕێکمان خە، تۆیش ئەکەویتە قسە. ئینجا دێتە سەر ئەوە ئەڵێ: خاڵە سەعاتەکەی من دە دینار دێنێ (بە میساڵ) ئەو ئەوەتە ئەڵێ: بە شەش دینار بیدە بە من، من ئەمە عەرەبە و سەگبابە نایدەمێ، تۆ کوردیت و لە خۆمانی ئەتدەمێ بە چوار دینار، هەر بۆ ئەوە دەست ئەم سەگبابە نەکەوێ. جا کورە نەکەی تەماع بتگرێ و توخنیان کەوی. ئەوە درۆ ئەکەن و ئەیانەوێ دەستت ببڕن. هەرکە شتێکی وات چاوپێکەوت ملی ڕێی خۆت بگرە و بڕۆ. نەکەی بە دەمیانەوە بوەستی و دەست بکەی بە کوێخایی و پیاوچاکی؛ ئەگینا دەردی پیاوەتی پیاوەکەی کەلی‌خانت لێ دێت. دواجاریش نەڵێیت

فڵانی ئەی تۆ بۆچ پێت نەوتم.

ئەگەر چوویتە بەغدا بە فیزێکەوە وەیا بە گێلەگێل خەریك بووی ئەگەڕای، لەسەر ڕێگاکە لە بەردەمتا سەیرت کرد کیسە پارە وەیا جزدانێك کەوتووە. تۆیش دەست ئەبەی هەڵیئەگری و ئەیخەیتە باخەڵت، کتوپڕ کابرایەکت لێ پەیدا ئەبێ و خێرا بە شوێن ئەودا کابرایەکی تریش پێت ئەڵێ: ئەو جزدانە هی منە تۆ هەڵتگرت. تۆیش بۆی دەردێنی. وەیا لەوانەیە هەر نەتخستبێتە باخەڵت و بە دەستتەوە بێ. کابرا لێت وەرئەگرێ و پاشان ئەڵێ: وەڵڵا باوکم خوا هەڵناگرێ ئەمە هی من نییە و ئەیداتەوە بە دەستتەوە پێت ئەڵێ: من چاوم لێبوو تۆ هەڵتگرت، ئەترسم جزدانەکەی خۆتت دابێ بە دەستمەوە؟ تۆش ئەڵێی: نەوەڵڵا باوکم ئەمەیە کە هەڵمگرت جزدانی خۆم لە باخەڵمایە. پێت ئەڵێ: کامەتە بزانم با سەیرێکی ئەویش بکەم. تۆیش بە فیزێکەوە دەست ئەبەی جزدانەکەی خۆت دەردێنی و ئەیدەی بە دەستیەوە. سەیرێکی ئەویش ئەکا و ئەڵێ: نەوەڵڵا باوکم خوا هەڵناگرێ ئەمە هین من نییە و ئەیداتەوە بە دەستەوە و ئەڵێ: بڕۆ خوات لەگەڵ. تۆیش جزدانەکەی خۆت وەرئەگری و ئەڕۆی لە پاش تۆزێك ئەتەوێ پارە خەرج کەی، کە دەست ئەبەی و جزدان دەردێنی سەیر ئەکەی پڕیەتی لە کاغەزە شڕ و پارەی تیا نەماوە.

تومەس لەو وەختەدا کە جزدانەکەی لێ وەرگرتووی بە تەڕدەستی هەر لە بەرچاوتەوە پارەکەی لێ دەرهێناوە و بۆی پڕ کردوویەتەوە لە کاغەزە شڕە.

جا برام ئەگەر چوویتە بەغدا فیز نەتگرێ بڵێیت کێ ئەتوانێ شتی وا لە من بکا؟ ئاگات لە خۆت بێ، نە جزدان هەڵبگرە و نە جزدانی

خۆشت بدەرە دەستی کەس. «نە ئەو ناولنگانە و نە ئەو زەبرە قوونانە».
دواجار نەڵێیت ئاخر فلانی تۆ بۆچ پێت نەوتم.

کە چوویتە بەغدا هەچ پارەیەکت پێیە لە شوێنێك دایمەنێ؛ بە تایبەتی کە چوویتە بازاڕ و شت بکڕی، یەك دوو دینارێك بخەرە گیرفانێکت و بۆ ئەو وردە شتانە لەوە دەربێنە. ئیتر دەست مەکە بە ئەفەندییەتی و بابەکراغایی دەست بەری لە بازاڕ لەسەر دووکانەکانا باقە دینار دەربێنی. کابرای وەستا بە خۆی و دەمە گوێزانێکی تیژەوە بە شوێنتەوەیە. وەختێ خەبەرت ئەبێتەوە کسپەیەك لە دڵتەوە دێت و ڕەنگت زەرد ئەبێ و ئەڵێیت: ئای پارەکەم نەماوە. جا «نە ئەو فیز فیزانییە و نە ئەم تیزتیزانییە»ش. دواجاریش نەڵێیت ئاخر فلانی بۆچ پێت نەوتم.

◈◇◈

# دوایی

ئەوا بەرگی دووەمی ڕشتەی مرواری لە ژێر چاپ دەرچوو؛ کەوتە بەردەست خوێندەوارانەوە. من ماوەیەکی چەند ساڵییە لەگەڵ ئەم کتێبە خەریکم کۆم ئەکردەوە، لە ئەنجاما تا ئێستا دوو بەرگی لێ دەرچوو. لە بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەما سەیرم کرد لەلایەن خوێندەوارانەوە نوکات و قسەی خۆشم بۆ دێت، بۆ ئەوە کە لە بەرگی دووەما بڵاوبێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوە کە ڕێکخستنی ئەم بەرگە پێش ناردنەکەی ئەوان کەوت، داخەکەم ڕێك نەکەوت کە ئەوانەش بڵاو بکرێنەوە.

جارێ پێشەکی سوپاسی ئەو کەسانە ئەکەم کە ئەو شتانەیان بۆ ناردووم، سوپاسی ئەوەیان ئەکەم کە هەستیان بە خزمەتێك کردووە، بەو خزمەتە کە زمان و ئەدەبی کوردی پێویستە ببووژێندرێتەوە و بخرێتە سەر کاغەز بۆ ئەوە لەمە زیاتر دەربەدەر نەبێ و نەچێتە گۆشەی لەبیرچوونەوە.

بەڵێ، ڕێك نەکەوت لە بەرگی دووەما بڵاو بکرێتەوە، بەڵام ئەم کتێبە وەنەبێ هەر دوو بەرگ بێ. من فیکرم وایە بە یارمەتی خوا لەسەری بڕۆم و ئەدەبی شاراوەمان بە ئەندازەی توانا بەرە بەرە بیخەمە ڕوو، کەوابوو ئەوانەی کە شتیان بۆ ناردووم لە بەرگی سێهەما بڵاو ئەکرێنەوە و بەم زوانە بەرگی سێهەمیش دەرئەچێ.

هەروەها تکا ئەکەم لەو کەسانە کە تینووی ئەدەبی کوردین، چی ئەزانن وە یا چییان بیستووە لە نوکات و قسەی خۆشی کوردی، لە ناردنەکەی درێخی نەکەن و بۆمی بنێرن. لەوان ناردن و لە من بڵاو کردنەوە. ئومێد ئەکەم لەم ڕووەوە بەهۆی هەموو لایەکەوە ئەدەبی کوردی بگاتە ئاسمانی بەرزی و لە چاڵی بێنەوایی بێتە دەرەوە.

لە کردنی ئەم جۆرە ئیشانە و نووسین و چاپکردنی ئەمانە، دوو خزمەتی گەورە بە کورد ئەکرێ:

یەکەم ئەم جۆرە شتانە لەزەتی دەماخە و دەماخ و گیان پێی خۆشە. بەو هۆیەوە ئەخوێنرێتەوە زیاد لە شتانیتر. لەمەوە کوردی خوێندن بڵاو ئەبێتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەش کە نازانن بخوێننەوە خۆشی کتێبەکە ناچاریان ئەکا بە خوێندنەوە و ئەمە بوو بە قوتابخانەیەکی گەورە؛

دووەم: خزمەتێکە بۆ ئەدەبی کوردی بە زمانی کوردی، کە لای ڕۆژگار ئەیهێڵێتەوە.

ئەم دوو شتە ئێمە ناچار ئەکا بە هەر شێوەیەك بێت، پێویستە خەریك بین و نەیەڵین ئەم خزمەتەمان لە دەست بچێت و هەرکەس هەر شتێکی لایە بەگوێرەی توانای، کۆشش بکا بۆ زیندوو بوونەوەی.





عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەڵەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزلجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ١٩٤١دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ١٩٤٩دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ١٩٤٨دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ١٩٧٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ١٩٧٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ١٩٨٤/١٢/١٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**




انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج- پاساژ عزتی- تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲





